6

زنجیرە دەرسی

# ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی

## لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا

چاپی دووەم

✸ تایبەتمەندی و دیدو بۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست ✸



عەلی باپیر





# تایبەتمەندیی و دیدو بۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست

زنجیــره دەرسی

# ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا

## (46 ـ 47 ـ 48 ـ 49 ـ 50)

بەرگی شـەشـەم

## تایبەتمەندیی و دیدو بۆچوونەکانی پەیـڕەوانی ڕێبـازی ڕاسـت

عەلـی باپیـر



بۆبڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

ناوی کتێب: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا - بەرگی شەشەم

نوسەر: عەلی باپیر

بڵاوکردەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن/ هەولێر

خەت: نەوزاد کۆیی

بەرگ: أمین مخلص

نەخشەسازی ناوەوە: عزالدین محمد

نۆرەو ساڵی چاپ: یەکەم 1429ک – 2008ز

تیراژ: 1500 دانە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (468) ی ساڵی 2006 دراوەتێ

تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨

مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١

tafseeroffice@yahoo.com

tafseeroffice@maktoob.com

altafseer@hotmail.com

چاپکردنەوەی کتێبەکانم بە نۆبە بە گوێرەی

توانا و هەلومەرجی ئێستا و ڕۆژگارەوە.

وە لە مێژ بوو هیوام وابوو شێوەی چاپکردنێکی

وایانی بۆ بڕەخسێ کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری

خوێنەرانیان بێ. جا ئێستا سوپاسی خوای بەخشەر

دەکەم کە نووسینگەی تەفسیر بەو کارە هەڵستێ.

خوا بەرەکەتی بخاتە ئیش و کاریانەوە و کۆمەکیان

بێت، منیش سوپاسیان دەکەم.

عەلی باپیر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وصحبه وآله

بەندە د. عەلی باپیر ، بەڕێز مامۆستا مخلص و

ئەبو سینەی تۆفیقم تەخویل کرد بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم ، خوا بەرەکەت و پیتی زیاتر

بخاتە ئیشی و کاریانەوە .

وە جگە لەوان هیچ کەسێکی دیکە مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نیە .

ع

عەلی باپیر

١١ ربیع الثانی ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

هەولێر

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَأَنَّ هَـٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾
(الانعام 153)

# پێشكەش بێ

بەو مسوڵمانانەی هەوڵ دەدەن هەنگاو بە هەنگاو بە شوێن پێی پێشینی چاكو زاناو پێشەوایانی ڕەسەنی ئیسلامدا بڕۆنو، بە پێی تواناش لە هەموو ڕوویەكەوە خەمی خەڵكو ئومەتیان دەخۆن.

# پێشەکی

الحمد لله والصلاة والسلام على عباده الذين اصطفى, خصوصاً سيّدهم وأفضلهم محمد خاتم الانبياء وآله السائرين على دربه والمُسْتَنيّن بسُنَّتهِ الى يوم اللقاء.

خوێنەری سەنگین و شیرین!

ئەم بەرگی شەشەمە بەرگی کۆتاییە لە زنجیرە دەرسی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی) و تەرخان کراوە بۆ تیشك خستنە سەر: تایبەتمەندییەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست و دیدو بۆچوونەکانیان، کە هەر لە کۆنەوە بە پەیڕەوانی سوننەت (أهل السنّة) ناسراون .

جا هەرچەندە ئێمە ستایش بۆ خوای شایستەی هەموو ستایش و مەدح و سوپاسێك, لە پێنج بەرگی پێشوودا سەرجەم پایەو بنەڕەتەکانی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیمان توێژوینەوە, بەڵام بە پێویستمان زانی، کە لە دوو توێی ئەم بەرگەشدا هەڵسین بە توێژینەوەی تایبەتمەندیی و دیدو بۆ چوونە گرنگ و سەرەکییەکانی ئەهلی سوننەت، کە بە درێژایی مێژووی ئیسلام و مسوڵمانان، زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان و ئوممەتی پێغەمبەری ﷺ کۆتاییان پێکهێناوە و چاکترین و ڕاستترین بەرجەستەکەری ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتییاندا. شتێکی ئاشکراشە، کە هەمیشە ئیمان و عەقیدەی ڕاست و دروست، هەڵوێست و دیدو بۆ چونی ڕاست و دروست و بێگری و گۆڵ لە خاوەنەکەیدا بەرهەم دێنێ و، بە پێچەوانەوەش هەمیشە عەقیدەی چەوت و لار، یان کرچ و کاڵ و بە خلتە و خاڵ، کاندیگای هەڵوێست و بیروڕاو بۆ چوونی هەڵەو پەڵەو نالەبارە, پێشینانیش ڕاستیان گوتوە: (گۆزە چی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ).

شایانی باسیشە، کە تایبەتمەندییو بیرو بۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕا ست (اهل السنة) تەنیا ئەوانە نین، کە ئێمە لە دوو تۆیی ئەم بەرگی شە شەمەدا هێناومانن، بەڵکو لەوە زیاترن، بەڵام ئێمە هەوڵمان داوە، کە سەرەکییەکانیانو ئەوانەیان، کە زانینیان بۆ خەڵکی ئەم ڕۆژگارە مان پێویستترن بیانهێنین، هیواداریشم، کە توانیبم تا ڕاددەیەك هەقی خۆ بدەم بەم بابەتە گەورەو گرنگەو، ئەگەر بە کورتیو پوختیش بووە لەو مە سەلانەدا، کە باسم کردوون نوختەم خستێبێتە سەر پیت.

لە خوای بە بەزەییو بەخشەریش دەپاڕێمەوە، کە ئەم کتێبەو ئەم زنجیرە دەرسە بەهەر شەش بەرگەکەیەوە بکاتە مایەی بەرچاو ڕوونی مە سوڵمانانی کورد ستانو زیاترو چاکتر ئیمانو عەقیدە دامەزرانیانو لە خوا نزیك بوونەوەیان. لە کۆتاییشدا ڕایدەگەیەنم، کە هەرشتێکی ڕاستو دروستم لێرەدا نوو سیبێ، ئەوە بەرە کەتو هیدایەتی خوایەو چاك (فَضْل)ەکەی بۆ قورئانو سوننەت دەگەڕێتەوەو، هەر هەڵەو کەمو کورتییەکیش دزەی کردبێتە نێو ئەم بەرهەمەوە، ئەوە خەتای منو کردەی شەیتانەو ئیسلام لێی بەرییەو، منیش بە زیندوویی و پاش مەرگیش لێی پەشیمانم، خواش پاداشتی هەر کەسێك بداتەوە، کە هەر کات شتێکی کەوتە بەرچاوو بە هەڵەی زانی، ئاگادارم بکاتەوە، پێشەکیش سوپاسی دەکەم.

﴿سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ألاّ اله الاّ أنت أستغفرك وأتوب اليك والحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات﴾.

26 محرم 1428

14 شوباتی 2007

هەولێر ..

# ڕێ خــۆشــکردن

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەرگی شەشەمو کۆتاییی‌یە لە دەرسەکانی ژمارە: (47, 48, 49, 50) لە زنجیرە دەرسی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی..)و چەند باسو بابەتێکی کتێبی: (مسوڵمانی کامل)[1], پێکدێو, سەرجەم لە سی (30) خاڵ پێکهاتوە کە لە هەر خاڵێکیاندا بابەتێك توێژراوەتەوەو, ئەو سی خاڵەش دابەش دەبن بۆ سێ تەوەرەی سەرەکیو هەر کامێکیان لە بەندێکی سەربەخۆدا دەبن, کە ئەمە ناوو نیشانەکانیانە:

(بەندی یەکەم): بیــروبۆچوون.

(بەندی دووەم): میانجێتیو هاوسەنگ بوون (الوسطية والاعتدال).

(بەندی سێیەم): پێنج نیشانەی سەرەکی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست.

شایانی باسیشە بەندی یەکەم لە دوازدە (12) خاڵو هی دووەم لە سێزدە (13)و هی سێیەمیش لە پێنج (5) خاڵ پێکهاتوونو، سەرجەم سی (30) خاڵن، دواتریش لە پێناسەی هەر بەندێکدا تیشکی زیاتر دەخەینە سەر نێوەڕۆکیو باسو بابەتەکانی.

ئێستاش ئەتۆو بەندی یەکەمو دوازدە خاڵەکەی کە گرنگترینو گەورەترین بەندی ئەم بەرگەیەو پانتایی هەرە زۆریشی گرتۆتەوە:

---

1) بڕوانە: (مسوڵمانی کامل، بەشی یەکەم: بیروباوەری مسوڵمان) لاپەرە (236 تا 280) چاپی یەکەم، 1997.

# ئەم بەندە

ئەم بەندە لە دوازدە خاڵ پێکهاتوە کە ئەمە ناوو نیشانەکانیانە:

1- تێڕوانینو جیهانبینی.
2- بەرنامەو پەیڕەو.
3- ڕابەرو سەرمەشق.
4- ئەرکی سەرشان.
5- قورئانو سوننەت.
6- هاوەڵانی پێغەمبەر (رضي الله عنهم).
7- زاناو میراتگرانی ڕەسەنی پێغەمبەر ﷺ.
8- مەزهەبەکان (المذاهب).
9- تەزکییەی نەفسو ڕێبازەکانی تەصەووف.
10- بەکافر دانان (التکفیر).
11- دۆستو پشتیوان.
12- دوژمنو ناحەز.

ئێستاش بە ڕیز باسیان دەکەین:

# خـــاڵی یەکـەم
# تێڕوانیـن و جیهانبیـنی

لەم خاڵی یەکەمەدا لە چوار بڕگەدا تێڕوانین و جیهانبینی مسوڵمانانی ڕە سەن دەخەینە ڕوو:

## یەکـەم: خوا (سبحانه و تعالـی):

﴿ الله لا اله الا هو الحی القیوم﴾ زاتی تاك و بێ وێنەو هاوەڵ و وەچەو هاوسەرو هاوتا, خوای بە بەزەیی بەخشندەی بەدیهێنەرو پەروەردگار (عزّ وجلّ)، کە هەر ئەو خاوەنی بوونی زاتیی و ڕاستەقینەیەو بێنیازە لە غەیری خۆی و هەموو شتێکیش وەدیهێنراوو چاو لە دەستی ویە, لە قورئان و سوننەتدا لە زۆر جێیان باسی کراوەو لە ڕێی خستنە ڕووی ناوە چاکەکانی و سیفەتە بێ وێنەکانی و کردەوە بە جێیەکانی و یاساو تێرو تەواوەکانی و دروستکراوە ڕێك و پێکەکانییەوە، بە خەڵکی ناسێنراوە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئێمە لە بەرگەکانی پێشوودا لەوبارەوە قسەو باسی زۆرمان کردوە، لێرەدا بەس بە خستنە ڕووی چەند خاڵێکی گرنگ بە کورتی واز دێنین[1]:

---

(1) مەگەر چۆن دەنا هیچ کام لە ئایەتەکانی ئەم **باسەمان** تەفسیر نەکردوون، چونکە لە بەرگەکانی (2و3)دا تەفسیرکراون.

یەکەم: خوا بەدیهێنەرو ڕێکخەرو بەڕێوەبەری هەموو شتێکە, چونکە بەس ئەو بەدیهێنەرو پەروەردگارەو غەیری وی هەر چی بێ هەر لەلایەن ئەوەوە درووستکراوەو کالای بوون- وجود)ی پێ بەخشراوە, بۆ وێنە خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ قُلِ اللّهُ قُلْ أَفَاتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِ أَوْلِيَاء لاَ يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلاَ ضَرًّا قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ أَمْ جَعَلُواْ لِلّهِ شُرَكَاء خَلَقُواْ كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُلِ اللّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾(الرعد- 16)، وە فەرموویەتی: ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا وَأَلْقَى فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَابَّةٍ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ۞ هَذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ بَلِ الظَّالِمُونَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾(لقمان: 10-11)، وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾(الاعراف- 54), وە فەرموویەتی: ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ۞ الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى﴾(الاعلى: 1-2).

دووەم: خوا تاک و بێ نیازو بێ باب و دایک و بێهاوتایە، وەک فەرموویەتی: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۞ اللَّهُ الصَّمَدُ ۞ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۞ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾(الاخلاص:1-4)، وە خوا هاوسەری نیە: ﴿وَأَنَّهُ تَعَالَى جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا﴾(الجن- 3), وە هیچ شتێک وەک خوا نیە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ﴾(الشورى- 11).

سێیەم: خوا (جل جلاله) هەروەک چۆن لە زاتیدا بێوێنەو هاوتایە لە ناوو سیفەتەکانیشیدا هەروایە, وە هەروەک چۆن بیروهۆشی ئینسان توانای سەرەدەری کردنی نیە لە ماهیەتی زاتی خواداو، لە ڕێی دەقەکانی قورئانو سوونەتەوە

نەبێت دروست نیە هیچی دەربارە بگوترێ، ئەگەرنا تفەنگ بە تاریکی یەوەنانە, ناوو سیفەتەکانیشی بە هەمان شێوە, چونکە ناوو سیفەتی هەر شتێك وەك زاتە کەیەتی, وە ئایەتی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾یش هەم زاتو هەم سیفەتەکانی خواش دەگرێتەوە.

چوارەم: هەموو شتێك, بەواتایەکی دیکە هەموو درووستکراوەکان, کە تێ کڕای بوون (وجود) پێکدێنن، بێجگە لە خوای بەدیهێنەریان, هەروەك چۆن بۆ پەیدابوون (ایجاد)یان پەکیان لە سەر خوا کەوتوەو بەبێ ئەو نابن, بۆ بەڕێوەچوونو بەردەوام بوو نیشیان بە هەمان شێوە, هەر بۆیەش خوای کاربەجێ لەسەر زمانی مووسا (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی ﴿رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾ طه (50).

پێنجەم: خوا بە مەبەستی تاقیکردنەوە ئینسانی لە دنیادا وا دروست کردوە کە ناتوانێ خوا ببینێو دەرکی ماهیەتی بکاتو ڕاستەوخۆ بیناسێ, بۆیە دەبێ لە ڕێی دروستکراوو شوێنەوارەکانییەوە کە ئاوێنەی تێیدا درەو شانەوەی ناوو سیفەتەکانی, وە بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ هەوڵی نا سینی بدات, خوای میهرەبان لەو بارەیەوە فەرموویەتی: ﴿لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾(الانعام- 103), هەروەها فەرموویەتی: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت- 53).

شەشەم: بەڵام لە دوارۆژدا خوا خۆی پیشانی بەندە چاکەکانی دەداتو بێبڕواو دۆزەخییەکانیش لە دیداری خۆی بێبەش دەکات, چونکە لەلایەکەوە بەهەشت جێگای تاقیکردنەوە نیەو، لەلایەکی دیکەشەوە گەورەترینو چاکترین نیعمەتی بەهەشتو بەرزترین هیواو ئاواتی بڕوادارانیش بریتیە لە شادبوون بە دیداری خوا, خوای (ذو الجلال والاکرام) لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ

﴿إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾(القيامة: 22-23)، وە دەربارەی بێبەشبوونی بێبڕوایان لە دیداری خودا فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ۞ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا الْجَحِيمِ﴾(المطففين: 15-16)، لەم دوو ئایەتەوە دەردەکەوێت کە ئازارو ئەشکەنجەی بێ بڕوایان بە هۆی بێبەشبوونیان لە دیتنی خوا، گەورەترو بەئێش ترە لە چوونە نێو ئاگری دۆزەخ، چونکە یەکەمجار دەفەرموێ لە دیتنی خوا بێ بەش و پەردەپۆش دەکرێن، ئینجا دەفەرموێ دوایی دەخرێنە کلپەی دۆزەخەوە!! هەڵبەتە فەرمودەی پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی دیتنی خوا لە دواڕۆژدا لەلایەن بڕوادارانەوە زۆرن، تەنانەت (ابن تیمیة) گوتوویەتی: ئەم فەرموودانە گەیشتوونەتە پلەی (تواتر)[1]، ئەمەش نموونەیەك لەو فەرموودانە: عن أبي هريرة ان أناسا قالوا لرسول الله ﷺ: يارسول الله! هل نرى ربنا يوم القيامة؟ فقال رسول الله ﷺ: هل تضارون في رؤية القمر ليلة البدر؟ قالوا لا يا رسول الله، قال: هل تضارون في رؤية الشمس ليس دونها سحاب؟ قالوا: لا يا رسول الله: قال إنكم ترونه كذلك...)متفق عليه.

حەوتەم: خوا (سبحانە وتعالی) خاوەنی هەموو سیفەت و ناوێکی چاك و بەرزو پەسندە، وەك فەرموویەتی: ﴿وَلِلّهِ الأَسْمَاء الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُواْ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَآئِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾(الاعراف- 180)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿.. وَلَهُ الْمَثَلُ الأَعْلَى فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾(الروم- 27).

وە خوا لە هەموو جۆرە هەڵەو پەڵەو کەموکوڕیو ناتەواوییەك بەرییە، دەقی قورئانیش لەوبارەوە یەکجار زۆرن بۆ وێنە: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾ (الاسراء- 44).

1) بڕوانە: اهل السنة والجماعة معالم الانطلاقة الکبری، ل 89 .

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَم يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُ وَلِيٌّ مِّنَ الذُّلَّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا﴾(الاسراء-111).

ژمارەی ئەو ناوە بەرزو چاکانەش نەوەدو نۆ (99) یە وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ((إن لله تسعه وتسعين إسماً مائة الا واحداً من أحصاها دخل الجنّة, انه وتر يحب الوتر)) متفق عليه.

هەشتەم: هەروەك چۆن دیتن‌و شادبوون بە دیداری خوا چاکترین‌و گەورەترین نیعمەتی بەهەشتە بۆ بڕواداران, ناسین‌و بڕوا پێ بوون‌و خۆشویستن‌و شەرم‌و سام لێکردن‌و رازو نیاز لەگەڵ کردن‌و پارانەوەو داوای لێبوردن کردن‌و پشت پێ بەستن‌و یادکردن‌و کار بۆکردن‌و...

بە کورتی پەرستن (عبادة)ی خواش لە ژیانی دنیادا، چاکترین‌و بەرزترین‌و شیرینترین نیعمەتە, هەر بۆیەش خوای میهرەبان‌و بەخشندە، ناسین‌و بڕوا پێ بوون‌و پەرستنی خۆی لەسەر بەندەکانی خۆی پێویست کردوە, چونکە دەزانێ کە بەبێ ئەوە هەم خۆیان دەدۆڕێنن‌و لەقیس دەچێ‌و، هەم چاکترین‌و بەرزترین نیعمەتی دنیاو قیامەتیان لە دەست دەچێت، وە بەبێ خواناسین ئینسان‌و ژیان‌و بوونەوەر، بێ‌مەعناو پووچ‌و بۆشن, با بزانین بۆچی‌و چۆن؟

خوا هەروەك چۆن دروستکەرو پەروەردگاری هەموو شتێکەو وردو درشت‌و بینراوو نەبینراوو زانراوو نەزانراوی بوونەوەرو کائینات، لە ڕێگەی ئەوەوە خاوەنی بوون‌و سەریان لە دەریای نەبوون (عدم) دەرهێناوە, بەهەمان شێوەش بەبێ ناسین‌و بڕوا پێهێنانی وی هیچ شتێك، ئینسان، ژیان, بوونەوەر.. هیچ مەعناو بایەخێکیان نابێ‌و دەبنە شتی پووچ‌و بۆش!!، چونکە بەس بە هۆی خوا ناسین‌و یەکتاپەرستی‌یەوە، ئیسنان بەڕاستی خۆی دەناسێ‌و دەزانێ چیەو کێیەو لە کوێوە هاتوەو بۆچی‌و, بۆ کوێ دەچێ‌و چۆن‌و بۆ؟! وەهەر لەبەر تیشکی خۆری بڕوا بە خوا بووندا ئینسان لێی حاڵی دەبێ، کە ژیانی دنیا چیەو بۆچی ڕەخسێنراوەو, پێویستە

چۆن بەسەر ببرێ؟! دیسان بەس لە ڕوانگەی بیری خواناسییەوە ئینسان تێدەگات، کە حیکمەتو هۆی خولقاندنی ئەم بوونەوەرە پانو بەرینە چیەو، چۆنو بۆ چی دروستکراوەو سەرەنجامی چی دەبێ؟! ئەگەرنا بەبێ خواناسینو بڕوا پێهێنانی، ئینسان مەعناو حیکمەتی بوونی خۆیو ژیانو بوونەوەرو دەوروبەر نازانێو، هەر جارە بۆ تەفسیرکردنی هۆو حیکمەتی ئەو شتانە پەنا دەباتە بەر بیردۆزەیەك کە دەبێ هەر لە بازنەیەکی داخراودا بخولێتەوەو لە ئاکامدا خۆیو ژیانو بوونی لەبەرچاو دەبێزرێو، لە جلێتاوی ئاژەڵیزمی داروینو سێکسی فرۆیدو گەدەپەرستی مارکسدا دەتلیسێتەوەو، ئەوە هیچ کە قیمەتو ڕێزی خۆی لە دەست دەدا، بەڵکوو هەر ناوی خۆشی فەرامۆش دەکات، هەر بۆیەش خوای دادگەرو کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ أُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾(الحشر- 19)، واتە: وەك ئەو کەسانە مەبن، کە خۆیان لە بیرچۆتەوە، ئەویش خۆیانی لەبیربردوونەوە، ئەوانەن لەڕێ دەرچوان.

دیارە هەر بۆیەش خوا ناسین (معرفة الله) بە بناغەو بنچینەی تێروانینی ئیسلامی دادەنرێ کە تاقە تێروانینی ژیرانەو زانستییانەی راستەو واقیعیە، چونکە وەك گوتمان: هەروەك چۆن بەبێ خوا (جلّ جلاله) پەیدابونی ئینسانو ژیانو بوونەوەر مەحاڵو چاوەڕوان نەکراوە، سەرەڕای ئەوەش ئەگەر گریمان پەیدابوون (إیجاد)یشیان بەبێ خوا تەفسیر بکرێ، ئەوا خودی بوون (وجود)ە کەیان دەبێتە شتێکی پووچو بێحیکمەتو بێ مەعنا، هەر بۆیەش هەموو ئەوانەی کە لەبەر هەر هۆیەك بووە بەینیان لەگەڵ خوادا تێك چووەو لە سەرخەتو ڕێبازی وی ترازاون، بۆ تەفسیرکردنی بوونو ژیانی خۆیان پەنایان بردۆتە بەر ئەو بیردۆزە پووچانەی کە بە چاوی ئاژەڵو دڕندەو دەعباو کرمو مەگەز تەماشای مرۆڤ دەکەنو، دەوروبەرو بوونەوەریش بە شاری بێخاوەنو بەرهەمی ڕێکەوتو سروشت لە قەڵەم دەدەنو هەر جارە بەزمێك ساز دەکەنو پەندێك بە خۆیان دەدەن.

بەڵێ ..بەڕاستی بەس لەسایەی خواناسیی و ئاییندا ئینسان خۆی و دەورو بەرو بوونەوەر دەناسێ و جێگای خۆی لە (اعراب)ی بوونەوەردا دەدۆزێتەوەو دەزانێ بۆچی دروستکراوەو چ ئەرکێکی پێ سپێردراوەو دەبێ چی بکات و چی نەکات؟ هەر بۆیەش خوای زاناو دادگەر بە زۆری وەسفی حاڵی پەرێشان و شپرزەی بێبڕواو خوانەناسان بە وشەی (ضالين) یان (ضالون) یان (في ضلال بعيد) دەکات، چونکە ئەو کەسە، کە خوای پەروەدگاری نەناسی نەك ڕێگا، بەڵکو هەر خۆیشی لێ ون دەبێت, ئاخر وشەی (ضل) لە ئەسڵدا بە مەعنای ون بوونە (ضالة البعير) واتە: حوشتری بزربوو, (الحكمة ضالة المؤمن) واتە: زانیاری چاك و ڕاست (حیکمەت) شتێکە لە ئینسانی برواداری بزر بووەو بە دوایدا دەگەڕێ بیدۆزێتەوە.

ئنجا وەك گوتمان بە هۆی خوانەناسینەوە نەك هەر مرۆڤ, بەڵکو تێکڕای بوونەوەر دەبێتە شتێکی پووچ و بەتاڵ, ئەمەش دەقی قورئانی لە سەرە، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلاً ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ﴾(ص- 27) واتە: وە ئاسمان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان بە خۆڕایی و بەلاش دروست نەکردوون ئەوە (واتە: ئەم جۆرە بۆچوون و هەڵوێستە لە ئاقار بوونەوەردا) گومانی ئەوانەیە کە بێبڕوان، جا سزای سەخت لە ئاگری دۆزەخ بۆ بێبڕوایان ساز کراوە.

هەر بۆیەش خوای میهرەبان ئاوا چۆنیەتی پاڕانەوەو ڕازو نیازی بەندە ژیرو تێگەیشتووەکانی و بەرهەم و ئەنجامی یادی خواو بیرکردنەوەیان لە دروستکراوەکانی خوا دەخاتەڕوو: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ ۞ الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾(آل عمران 190-191).

دەبینین کە بەرهەم و ئەنجامی یادی بە گەرم و کوڵی خواو سەرنجدان و بیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی بریتیە لە دانپێداهێنان و شایەدیدان بەو راستییە گرنگ و مەزنەدا ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً...﴾ پەروەدگارمان ئەم- بوونەوەرەت بە خۆرایی و بێ حیکمەت و مەعنا نەخوڵقاندوە پاکی بۆ تۆ -لە کاری بێ حیکمەت و پووچ.

کەواتە: دەتوانین بڵێین خواناسی و بڕواداریی هەروەك چۆن بریتیە لە ڕێزگرتن و بە گەورەگرتنی خوا (سبحانەو تعالى)، بە هەمان شێوەش ڕێزو حورمەت دانانیشە بۆ ئینسان و ژیان و بوونەوەریش, بەڵام بە پێچەوانەوە بیری پووچی بێبڕوایی، هەروەك چۆن بێڕێزیی و سپڵەیی یە بەرامبەر بە خواو سیفەتە بەرزەکانی, بێئەدەبی و گێلێتی و بێحورمەتی کردنیشە بە بوونەوەرو ژیان و ئینسان, وە زەرب هێنانیشە بە سەر هەموو کردەوەو خەسڵەتە چاك و پەسندەکانیشدا, هەر بۆیەش خوای کاربەجێ دوای ئایەتی ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلاً...﴾ یەکسەر فەرموویەتی: ﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾ (ص- 28)، چونکە ئەگەر خوا نەبێ و لێپرسینەوەو سزاو پاداشت نەبێ، بڕوادارانی کردار پەسند لەگەڵ تێکدەرانی ناپەسندو پارێزکاران و تاوانباران، هەردووکیان دەچنە نێو تەرازوویەکەوە یەکسان دەبن!!

## دووەم: ئینســـان:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً...﴾ ئینسان سەرتۆپی کائیناتەو شاگوڵی باغی بوونەوەرە, جا ئەوە لێرەدا هەروا بە کورتی لە ڕوانگەی تێڕوانینی ئیسلامییەوە لە چەند خاڵێکدا کە سایەتی ئەو دروستکراوە ڕێز لێگیراوەو سەر سووڕهێنەرە دەخەینە ڕوو:

یەکەم: ئینسان جێنشینی خوایە لەسەر زەوی وەك پەروەردگارمان فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً...﴾(البقرة– 30)، واتە خوای کاربەجێو بێنیاز مرۆڤی لەسەر زەوی کردۆتە جێگری خۆیو ئاوەدان کردنەوەو هەڵسووراندنی کارو باری دنیای پێ سپاردوە وەك فەرموویەتی: ﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا﴾ (هود– 61).

دووەم: ئینسان لە چاکترینو تەواوترین شێوەو پێکهاتنی ماددیو مەعنەویدا خولقێنراوە: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾(التين– 4)، وە لەلایەن خوایشەوە ئەوپەری رێزو حورمەتی لێگیراوەو بەسەر هەموو دروستکراوەکاندا هەڵبژێرراوە: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾(الاسراء– 70).

سێیەم: ئینسان لە دوو بەشی سەرەکیو لەیەك جودا پێکهاتوە: یەکەم: خاکی سەر زەوی، دووەمیش: گیانێکی خوایی: ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِن طِينٍ ۞ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ﴾ (ص: 71-72) رەنگە حیکمەتی ئەو دوو توخم (عنصر)ە لەیەك جوداو بگرە دژبەیەکەیش ئەوەبێ کە ئینسان بتوانێ لە تاقیکردنەوەی ژیانی دنیادا چ بەرەو بەرزیی، بە هۆی چاکیو پاکییەوە، چ بەرەو نزمیی بە هۆی پیسیو بەدکارییەوە، هێندە بڕوا هەتا لە چاو ون دەبێو، لە فریشتان بەرێزترو لە ئاژەڵو دڕندەو شەیتانان خراپترو کەمتر دەبێ!

چوارەم: ئادەم (سەلامی خوای لێبێ) کە یەکەمین ئینسانو بابی هەمووانە، بە فەرمانی خوا هەموو فریشتەکان کرنووشی رێزگرتنیان بۆ بردوە: (وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾(البقرة–34).

پێنجەم: لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئیبلیس (لەعنەتی خوای لێبێ) لەگەڵ فریشتەکاندا کرنووشی بۆ ئادەم نەبردوو ڕێزی لێ نەگرت، خوا لێی تووڕە بووو نەفرەتی لێکردو لە بەزەیی و لوتفی خۆی بێبەشی کرد: ﴿قَالَ فَاهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَاخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ الصَّاغِرِينَ﴾(الاعراف- 13) دیارە لەم بەسەرهاتەدا ئەوپەڕی ڕێزگرتن و خۆشەویستیی خوا بۆ ئینسان دەردەکەوێ.

شەشەم: خوا (عزّو جلّ) لەنێو هەموو بوونەوەردا ئەرکێکی گرنگ و ناوازەی وای بە ئینسان سپاردوە کە هیچ شتێکی دیکەی نێو بوونەوەر توانای هەڵگرتنی ئەو بارەو جێبەجێکردنی ئەو کارەی نیە: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً﴾(الاحزاب- 72).

حەوتەم: لەوەوە دەردەکەوێ کە ئینسان پلەو پایەکی یەکجار بەرزو گرنگی هەیە کە هیچ دروستکراوێکی دیکە نایگاتێ، کە هەرچی لە بونەوەردا هەیە بۆی ڕام و مەیسەر کراوەو ڕێشمەکەی وەدەست وی دراوە: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾(الجاثية- 13).

هەشتەم: ئینسان، هەروەها (جن)یش، بۆ حیکمەت و مەبەستێکی یەکجار بەرزو گرنگ خولقێنراوە کە بریتیە لە بەندایەتی بۆ خوا (العبودية لله)، چونکە بەختەوەری دنیاو دوارۆژو کامڵ بوونی ئینسان بەس لەو ڕێیەوە دێتەدی، ئەگەرنا خوا دەوڵەمەندو بێنیازە لە غەیری خۆی، چونکە هیچ خەسڵەتێکی چاك و پەسند نیە نەیبێ هەتا چاوەڕوانی بکات، وە بۆخۆی خاوەنی هەموو شتێکەو هیچ شتێك نیە نەیبێ، خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلا لِيَعْبُدُونِ ۞ مَا أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ۞ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾(الذريات: 56-58).

نۆیەم: ئینسان هەر هەتا ئەو کاتە ئەو شانو شکۆو پلەو پایە بەرزەی دەبێو، ئەو ڕێزو حورمەتەی دەپارێزرێ هەتا حیکمەتی خولقێنرانی خۆی کە بەندایەتی کردنە لە خۆیدا دێنێتە دیو بەراستی دەبێتە بەندە (عبد)ی خواو، ئەو ئەرکەی پێی سپێردراوە جێبەجێی دەکات، کە ئەرکی (خەلیفایەتی) یەو، ئەو سپاردەیەی کە خوا تەسلیمی کردوە چاك هەڵی دەگرێو دەیپارێزێ، ئەگەرنا بە هۆی لادانو سەرپێچییەوە دەچێتەوە ڕیزی ئاژەڵو بگرە خراپتریش، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لاَّ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَـئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾(الاعراف- 179).

بەڵکو ئینسان بە هۆی پچڕاندنی پەیوەندی بەندایەتی لە گەڵ خوادا و هەڵگەڕانەوەی لە یاسای گشتی (النظام العام) بوونەوەرو سرووشت (فطرة)ی خۆی، لە هەموو جانەوەرو دڕندان خراپتر دەبێ: ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللّهِ الَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾(الانفال- 55)، بگرە ئینسانی لارێو بێبڕوا هەر لە هەموو شتێك خراپتری لێ دێو کە پێشتر بە هۆی هەڵگرتنی سپاردەی خواو جێبەجێکردنی ئەرکی خەلیفایەتیو هێنانەدی خەسڵەتی بەرزی بەندایەتییەوە لە هەموو کائیناتدا هەڵبژاردەو تاقو ناوازە بوو، ئێستا بە هۆی سپڵەییو بێوەفاییەوە دەچێتە پلەی هەرە نزمو پەستەوە: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ۞ ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ ۞ إِلا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾(التين: 4-6).

## سێیەم: ژیـــان (الحیـــاة):

﴿الّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ﴾ وە تێڕوانینی ئیسلام دەربارەی ژیان لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا زۆر بە گوشراوی دەخەینە ڕوو:

یەکەم: ئەسڵو بنچینەی ژیان ئاوەو هەموو زیندەوەرو ژیاندارێکی سەر زەوی بە شێوەیەکی سەرەکی لە ئاو دروست بووو وەك خوای زیندووی مە شووڕگێر فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍ أَفَلا يُؤْمِنُونَ﴾(الانبیاء-30)، وە فەرموویەتی: ﴿وَاللهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِن مَّاء فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ...﴾(النور- 45)، ژیانی ئینسانیش لەسەر زەوی مەیدانی تاقیکردنەوەیەتی بە هۆی ئەنجامدانی ئەو بەندایەتییەوە کە لە لایەن خواوە لەسەری پێویست کراوەو, هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتە قورسەی کە پێی سپێرراوەو، جێبەجێکردنی ئەو جێگرایەتییەی کە پێی دراوە, خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿الّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾(الملك-2).

دووەم: ژیانی دنیا لەو ڕووەوە کە جێی تێدا تاقیکردنەوەی ئینسانە یەکجار گرنگو بایەخدارەو پێویستە ڕێزی لێ بگیرێو ئەوپەڕی ئەمیەتی پێ بدرێ, هەر بۆیەش خوای زاناو توانا لە سەر زمانی بەندە خواناسو چاکەکانی فەرموویەتی: ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾(البقرة- 201), بەڵام لەو ڕووەوە کە ڕابواردنێکی کەمو کورتەو جێی دڵ پێ بەستن نیە, پێویستە وەك گاڵتەو یاریی منداڵان سەیر بکرێ، وەك خوای بێوێنە فەرموویەتی: ﴿اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الأَمْوَالِ وَالأَوْلادِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَامًا وَفِي الآخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ

اللهِ وَرِضْوَانٌ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلا مَتَاعُ الْغُرُورِ﴾(الحديد-20)، کەوا تە گرنگیو قیمەتی ژیانی دنیا بەس لەو ڕووەوە یە کە ئینسان خوای تێدا بپەرستیو بەو بەندایەتی تێدا بکات, جا هەرکاتێك ئەو جەوهەرو حەقیقەتە لە ژیانی ئینساندا نەما, ئینسانو ژیانەکەشی دەبێتە قرپۆكو فلسێکی قەڵپ ناهێنێ, کەواتە مەبەست لە فەرموودەی خوا: ﴿أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ....﴾ ژیانو گوزەرانی کەسانێکە کە تەنها دیوی ڕوا ڵەتیو مادیی ژیانی دنیا دەبینن و لە دیوەکەی دیکەی یان ڕاستتر بڵێین لە کاکڵو حەقیقەتەکەی بێئاگان: ﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ﴾(الروم- 7)، هەر بۆیەش لە برگەی یەکەمدا گوتمان: هەروەك چۆن بەبێ خوا (جلّ جلاله) پەیدابوونی ئینسانو ژیانو بوونەوەر مەحاڵو چاوەڕوان نەکراوە, سەرەرای ئەوەش ئەگەر گریمان پەیدابوون (إيجاد)ی شیان بەبێ خوا تەفسیر بکرێ، ئەوا خودی بوون (وجود)ە کەیان دەبێتە شتێکی پووچو بێحیکمەتو بێمەعنا.

بەڵێ .. ئینسان بەبێ خواناسینو خواپەرستی دەبێتە ئاژەڵو درندەو بگرە خراپترینو نزمترین شتو ژیانەکشی دەبێتە گاڵتەو یاریی منداڵانەو گوێزی قرپۆك, هەر بۆیەش پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی: ((ألا إن الدنيا ملعونة ملعون ما فيها إلا ذكر الله وما والاه وعالماً ومتعلماً)) رواه الترمذي وقال حسن.

سێیەم: ژیانی دنیا بریتیە لە تاقە دەرفەتی ژیانی ئینسان, بەڵکو یەکێکە لە قۆناغەکانو پێشەکی (مقدمة)یەکەو دوایی لە قۆناغەکانی دیکەدا ئەنجام (نتيجة)ەکەی دێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِالنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَى أَجَلٌ مُّسَمًّى ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾(الانعام- 60). وە لە ڕاستیدا ئەگەر ژیانی ئینسان بەس ئەم پێنجو

دوو ڕۆژەی دونیا بێ، دەبێتە شانۆگەرییەكی بێتام و چیرۆكێكی بێ ئەنجام، دیارە ئەمەش لە خوای كاربەجێ ناوەشێتەوە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لا تُرْجَعُونَ ۞ فَتَعَالَى اللهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لا إِلَهَ إِلاّ هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ﴾ (المؤمنون: 114-115).

چوارەم: ئینسان كە چاكترین دروستكراوو ئەمانەت پێسپێردراوو ئەركی خەلیفایەتی پێ خەڵاتكراوی خوایە، بۆ ئەم ژیانە كەم و كورت و زوو تێپەڕەی دنیا دروست نەكراوە، بەڵكو وەك گوترا ئەمە بەس مەیدان و دەرفەتی تاقیكردنەوەیەتی و ئینسان بۆ ژیانێكی هەمیشەیی و نەبڕاوە خولقێراوە كە لە دوارۆژدا دەیبینێ، وەك ئەنجام و بەرهەمی ئەم ژیانە دنیایی یەی، ئەو ژیانە نەبڕاوەیەش یان بەهەشتی پڕ نازو نیعمەت و بەرینە، یانیش دۆزەخی بلێسەداری بەتین: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُوْلَئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ ۞ جَزَاؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا رَّضِيَ اللهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُ﴾(البينة: 7-8)، وە فەرموویەتی: ﴿..وَمَن يَعْصِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾(الجن- 23).

پێنجەم: هەروەك چۆن شادی و بەختەوەری و ژیانی نەبڕاوەی بەهەشت بەرهەم و ئەنجامی ژیانی خواپەرستانەو، خەم و پەژارەو ژیانی بە ژانی بێ پسانەوەی دۆزەخ بەری تاڵی ژیانی نائیسلامی یانەو دنیاپەرستانەیە، خۆشی و بەختیاری ڕواڵەتی و دەروونیی و ناخۆشی و ژیانتاڵی تاكیی و كۆمەڵیی ئەم دنیایەش، هەر زادەو بەرهەمی خواپەرستی و دنیاپەرستییە، خوای دادگەرو میهرەبان فەرموویەتی: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلا يَضِلُّ وَلا يَشْقَى ۞ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾ (طه: 123-124).

شەشەم: مادام ژیانی دنیا مەیدانو دەرفەتی تاقیکردنەوەی ئینسان بێو بابەتو ماددەی تاقیکردنەوەکەش بریتی بێ لە بەڕێوەبردنی ئەرکی خەلیفایەتیو ئاوەدانکردنەوەی زەوی, کەواتە گۆشەگیریی و دنیا نەویستیو لە پەراوێزی کۆمەڵگادا ژیان بەسەربردن لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، شتێکی پووچو هەڵەیە, هەر بۆیەش خوای زاناو کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿**وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الآخِرَةَ وَلا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ**﴾(القصص-77).

حەوتەم: هەروەك واز لە دنیا هێنانو گۆشەنشینی بە بیانووی ژیانی دوارۆژ هەڵبژاردنو دنیا بە کەمگرتنەوە, شتێکی هەڵەیەو ئیسلام ڕەفزی دەکات, زیاد لە پێویست بە دنیاوە خەریك بوونو زیادەڕۆیی کردنیش لە گوزەرانو ڕابواردندا بەهەر بەهانەیەك بێ هەر هەڵەو لادانە, هەربۆیەش پێشەوامان محمد ﷺ بە زۆری لە پاڕانەوەکانیدا دەیفەرموو: ((**اللّهم آتنا في الدنيا حسنة وفي الاخرة حسنة وقنا عذاب النار**)) متفق عليه.

وەك دەبینین بەر لەوەی داوای خێرو چاکەی دوارۆژ بکات, خێرو چاکەی ژیانی دنیای داوا کردوە!

کۆتایی ئەم بەندەش بەم دووعایە گرنگو بەرزەی پێغەمبەر ﷺ دێنین کە دەفەرموێ: ((**اللّهم أصلح لي ديني الذي هو عصمة أمري, وأصلح لي دنياي التي فيها معاشي، واصلح لي آخرتي التي فيها معادي، واجعل الحياة زيادة لي في كل خير, واجعل الموت راحة لي من كل شر**)) رواه مسلم.

وەك دەبینین ئەو پێشەوا ڕەندو پەسندە ﷺ دوای ئەوەی بۆ چاك بوونی ئایین لە خوا دەپاڕێتەوە کە پارێزراوبێ لە هەموو گیروگرفتو بەڵایەك کە مایەی هاتنەدی هەموو هیواو ئاواتێکە, یەکسەر داوا لە خوا دەکات کە ئەو ژیانەشی بۆ چاك بکات کە گوزەرانی تێدا دەکات، ئنجا دوای ئەوە لە خوا دەپاڕێتەوە کە ئەو دوارۆژەی بۆ

چاك بكات كه بۆ لای دەگەڕێتەوە, پاشان داوا لە خوای پەروەردگاری دەكات كە ژیانی دنیای بۆ بگێڕێ بە مایەی پەیدابوون و زیادبوونی هەموو خێرو چاكەیەك، وە مردنیشی بۆ بگێڕێ بە ڕزگاركەرو مایەی ئاسوودەیی لە هەر جۆرە خراپەیەك.

## چوارەم: بوونـــەوەر:

﴿...خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ...﴾(السجدة- 4)

تێروانینی ئیسلامییانەی خۆشمان دەربارەی بوونەوەر لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا كورت دەكەینەوە:

یەكەم: بوونەوەر بە زاراوی قورئان واتە: ( حەوت ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی دەكەوێتە نێوانیانەوە), دیارە تا ئێستا ئینسان نەیتوانیوە شتێكی مسۆگەرو جێی دڵنیایی دەربارەی حەوت ئاسمانەكان ( سبع سموات)ەوە بزانێ، لە قورئان و سوننەتیشدا شتێكی وا لەوبارەوە نەهاتوە.

دووەم: مادام زەوی یەكێكە لە خڕۆكەكانی دەوری ڕۆژو، ئەمیش ئەستێرەیەكە لە ئەستێرەكانی كەهكەشانی كاكێشان (مجرة درب التبّان), كەواتە هەر كاتێك لە قورئاندا وشەی (سبع سموات) یان (سموات) یان (سماء) بەكار بێ ،زەویش دەگرێتەوە, بە واتایەكی دی: هەر كام لەم سێ وشانە بە واتای بوونەوەر (كون) دێن بە زاراوەی زانیاری ئەمڕۆ.

سێیەم: ئاسمانەكان و زەوی, واتە: بوونەوەر, بەر لەوەی ئەم دیمەنەی ئێستای لەلایەن خواوە وەربگرێ, هەمووی پێكەوە لكاوو جۆشدراو بوو: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا...﴾(الانبياء-30).

چوارەم: بونەوەر لە ئەسڵدا گازێگ بووە لە شێوەی دوكەڵ (دخان)دا: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ﴾ (فصلت-11), واتە ئەو ماددەو كەرستە خاوەی،

کە بوونەوەری لێ پێکهاتوە، لە سەرەتاوە گازێکی پرژوبڵاودا بووە.

پێنجەم: بوونەوەر (ئاسمانەکانو زەوی) لە ماوەی شەش قۆناغاندا ئەم شێوەیەی ئێستای وەرگرتوە: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾[1](الاعراف-54).

شەشەم: ئەم بوونەوەرە ئەوپەری ڕێكو پێكیو وردەکاری تێدا ڕەچاو کراوەو، هەتا بڵێی یاسادار (منظّم)و بێ کەموکوڕی یە، ﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا مَّا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِن تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِن فُطُورٍ ۞ ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئاً وَهُوَ حَسِيرٌ﴾(الملك: 3-4).

حەوتەم: ئاسمانی یەکەمو نزیك لە ئێمەی دانیشتوانی سەر زەوی، بە ئەستێرەو خڕۆکەکانی ڕازێنراوەتەوەو کراوەتە چراخان، وە لە پێیدا بەرزبوونەوەو سەرکەوتنو گوێ گرتنی شەیتانەکانیش پارێزراوەو پەرژین کراوە، وەك خوای زاناو کاربەجێ فەرموویەتی: (إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ ۞ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَانٍ مَّارِدٍ ۞ لا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلإِ الأَعْلَى وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ۞ دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ۞ إِلاَّ مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ﴾(الصافات: 6-10)، هەروەها فەرموویەتی: ﴿قَدْ زَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِّلشَّيَاطِينِ﴾(الملك- 5). کەواتە زۆر نزیکە

1 چونکە (یوم) لە زمانی عارەبیدا هەروەك چۆن بۆ شەوو ڕۆژی سەر زەوی کە (24) سەعاتە بەکاردێ، بە مەعنای موتڵەقی کاتیش هەر بەکاردێ، وەك گوترا: (یوم لك ویوم علیك) یان ڕۆژان ڕۆژیان لە دوایە، لە قورئانیشدا (یوم) یەکسانە بە (1000) ساڵ: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾(الحج-47)، (يُدَبِّرُ الأَمْرَ مِنَ السَّمَاء إِلَى الأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ) وە (یوم) یەکسانە بە (50000) ساڵ: (تَعْرُجُ الْمَلائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾(المعارج-4). کەواتە: یەك (ڕۆژ) یانی ماوەیەك لە کات، چ کەم بێ وەك (24) سەعات یان زۆر وەك (1000) ساڵو (50000) ساڵو کەمترو زیاتر، ئنجا مادام خوداش دیاری نەکردبێ ئێمەش بۆمان نیەو دەبێ بڵێین شەش قۆناغ.

کە هەرچی بە چاوی ڕووتو بە دووربینەکان دەبینرێ لە ئەستێرەو کەهکەشانە دوورو نزیکەکان, هەموو ئاسمانی یەکەم، یان بەشێکی ئەو ئاسمانە بێ.

هەشتەم: هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوی (بوونەوەر) دا یە، خوا بۆ ئینسانی ڕام کردوە، کە سوودی لێوەربگرێو لە ژیانو گوزەرانی دنیادا لێی بەهرمەند بێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾(الجاثية- 13).

نۆیەم: وا وێدەچێو زۆر نزیکە ئەم بوونەوەرە پانو پۆڕو زەبەلاحو سنوور نادیارە تێکرا شانۆ (مسرح)ێك بێ بۆ تاقیکردنەوەی ئینسان ڕەخسابێ, چونکە لە لایەکەوە خوای بەخشەر دەفەرموێ هەرچی لە بوونەوەر دایە بۆ ئێوەم مەیسەر کردوە, وە لەلایەکی دیکەشەوە ڕایدەگەیەنێ کە هاو کات لە گەڵ کۆتایی پێکهاتنی ژیانی ئینسان لەسەر زەوی، ئاسمانەکانیش وەك تۆمارێك دەپێچرێنەوە دەگێڕرێنەوە سەر حاڵەتی پێشوویان: ﴿يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ﴾(الانبياء-104).

هەروەها خوای میهرەبانو دادگەر ڕایگەیاندوە کە لەڕۆژی دواییدا هەم ئاسمانەکانو هەم زەویش (واتە تێکرای بوونەوەر) دە گۆڕێنو بە شێوەو چۆنیەتیەکی دیکە دروست دەکرێنەوە: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُواْ للهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾(إبراهيم-48).

دەیەم: ئەم بوونەوەرەو هەموو ئەو کائیناتەی تێدایە، تێکڕا ملکەچو پابەندی ئەو نەخشەو بەرنامەیەن کە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بۆیان دیاری کراوە, وە تاقە مەخلووقێك کە توانای لە یاسا دەر چوونو سەرەڕۆیی- لە بەشێکی ژیاندا-پێ درابێ، ئینسانە[1] ئەویش بە مەبەستی تاقیکردنەوەی: ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ اللهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ

1) دیارە جند (جن)یش لەو مەسەلەیەدا وەك ئینسانن.

يُرْجَعُونَ﴾(آل عمران-83). ﴿لا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾(يس- 40).

یازدەهەم: دروستکراوەکانی خوا بە گشتی دوو جۆرن: بەرهەست (محسوس)و نابەرهەست (غیر محسوس) خواش فەرموویەتی: ﴿فَلا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ۞ وَمَا لا تُبْصِرُونَ﴾(الحاقة: 28-29). کەواتە: ئەم بوونەوەرە بەس بریتی نیە لە دیوە بینراوو بەو هەستەکەی، بەڵکو دیوێکی پەنهان و نابەرهەستیشی هەیە، کە لە نێویدا فریشتەو جند (الملائکة والجن) هەن.

ئەمە بە کورتی تێڕوانینی ئیسلامی بوو دەربارەی مەسەلە گرنگ و سەرەکییەکانی بوون: (خوا سبحانەو تعالی و ئینسان، و ژیان و بوونەوەر).

بەڵێ ئەمەیە تێڕوانین و جیهانبینی ئیسلامی، جیهانبینییەك، کە یەقینی سەدا سەدمان هەیە لە ڕاستی و تەواوییدا، چونکە هەر لەو سەرچاوەیە هاتوە، کە ئینسان و ژیان و بوونەوەری هێناونەدی، کە خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارە (سبحانەو تعالی).



# خـــاڵی دووەم

# بەرنامـەو پەیـــڕەو

خوای زاناو وردبین فەرمووویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾(النساء- 59)، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە فەرمانبەری خوا بکەن وە فەرمانبەری پێغەمبەرو کاربەدەستانێك بکەن کە لە خۆتانن, جا ئەگەر لە شتێکدا کێشەتان بوو, بیگێڕنەوە بۆ لای خوداو پێغەمبەر, ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە, ئەوە چاکترەو سەرنجامیشی باشترە. لەم ئایەتە پیرۆزەدا بەرنامەو پەیڕەوی مسوڵمان خراوەتەڕوو, چونکە لەم ئایەتەدا فەرمان بە مسوڵمانان کراوە کە گوێڕایەڵو گەردن کەچی فەرمانی خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەوایانی مسوڵمان بن.

## 1/ فەرمانبەری‌و گەردن کەچی بۆ خوا (اطیعوا الله):

بێگومان فەرمانبەری‌و گەردن کەچی نواندن بۆ خوا ( جلّ جلالە) لە شوێنکەوتنی قورئانی مەزن‌و جێبەجێ کردنی یاساو دەستوورەکانیدا دێتە دی, کەواتە گەورەترین‌و ڕاسترین سەرچاوە کە مرۆڤی مسوڵمان دەیکاتە بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی, قورئانی راست‌و قسە لەجێیە, ئەو قورئانە بەڕێزەی کە خوا

لەبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ﴾ (النحل- 89)، واتە: وە کتێبمان ناردۆتە سەر تۆ، هەموو شتێك ڕوون دەكاتەوە، وە ڕێڕوونیی و بەزەییی و موژدەیە بۆ مـ سوڵمانان، دیـ سان فەرموویەتی: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلاً...﴾(الانعام- 115)، واتە: وە قسەی پەروەردگارت (کە قورئانە) لە ڕا ستیی و دادگەر یدا تەواوە ... بەڵێ کتێبی خوا، هەواڵەکانی ڕاستو ڕەوانن، یاساو دەستوورەکانیشی ڕێكو بەجێن.

## 2/ فەرمانبەریی و گەردن کەچی بۆ پێغەمبەر (أطيعوا الرسول):

فەرمانـ بەریی و گەردنکە چی نوا ندنیش بۆ پێغەمـ بەر ﷺ لە گرتـ نی ڕێوشوێنەکەی، پێوە پابەندبوونیدا دێتە دی، هەڵبەتە ڕێو شوێنو سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ شەرحو لێکدانەوەیە بۆ کتێـ بی خوا، وەك فەرموو یەتی: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ...﴾ (النـ حل- 4)، وا تە: وە قورئانمان بۆ لای تۆ ناردۆتەخوار، تاكو ئەوەی بۆ لای خەڵکی نـ ێردراوە، بۆ یان ڕوون بکەیتەوە.. خوای بێ وێنە دەربارەی فەرزبوونی فەرمانـ بەریی و ملکە چی پێغەمبەر ﷺ و ڕێوشوێنو فەرمانەکەی فەرموویەتی: ﴿مَّنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللهَ﴾(النساء-80)، واتە: وە هەرکەسێك فەرمانبەری پێغەمبەر بکات ئەوە بێگومان فەرمانبەریی خوای کردوە.... هەروەها، فەرموویەتی: ﴿وَمَا آ تَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا...﴾ (الحـ شر- 7)، وا تە: وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەتانداتێ (و پێتان ڕادەگەیەنێ لە یاساکانی شەرع) وەری بگرن وە لەوەی کە لێتان قەدەغە دەکات بپرینگێـ نەوە... دیـ سان فەرمووی ــەتی: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى ۞ إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى﴾(ا لنجم: 3-4)، وا تە: وە (موحەمەد) لە ئارەزووەوە نادوێ، قسەی وی جگە لە پەیامێکی نێـ ــرراو چیدی نیە.

3  **فەرمانبەری بۆ کاربەدەستانی مسولمان (أولی الأمر منكم)**: لێرەدا لەسەر چەمك‌و واتای وشەی (أولي الأمر) لەنێو زاناو چاوساغانی ئیسلامدا, لە توێژەرەوانی قورئان‌و, فەرمووودەناسان (المحد ثون) و شەرع زا نان (الفقـهاء)دا کێشەو وتوویژێکی زۆر کراوەو, وشەی ناوبراو قسەی زۆر لەسەر هەستاون, جا ئێمە لێرەدا نە مەودامان هەیەو نە بە پێویستی دەزانم کە ئەو قـسەو باسانە بگێڕینەوە، بۆیە لێرەدا ئەو ڕایەی کە لەلای زۆربەی زانایان پەسەندو بەهێزتر هاتۆتە بەرچاویان, بە مەبەستی توێژینەوەو قسە لە سەرکردن هەڵیدەبژێرین‌و دەڵێین: مەبەست لە (أولوا الامر) فەرمانڕەواو کاربەدەستانن، بەڵام نەك هەر فەرمانڕەواو کارەبەدەستێك کە دەستی دەگاتە کورسی حوکم‌و دەسەلات پەیدا دەکات, دەنا ئەگەر وابێ فیرعەون‌و نەمروودو یەزیدو جەنگیزخان‌و ستالین‌و شای ئێران‌و عەفلەق‌و صەدامیش وەبەردەکەون! بەڵکو وەك ئایەتە کە ڕوونی کردۆتەوە: (وأولي الأمر منكم): کاربەدەستانێك کە لە خۆتان بن, واتە مسولمان بن, مسولمانیش بۆیە پێی دەگوترێ مسولمان کە پابەندو گەردنکەچی قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەر بێ. ئنجا شتێکی ئاشکراو ڕوونیشە, کە ئەو کاربەدەست‌و فەرمانڕەوا مسولمانەی کە دەبێتە سەرۆك‌و گەورەی مسولمانان‌و بەرنامەی ئیسلامیان تێدا بەڕێوە دەبات, حەتمەن دەبێ بۆ خۆشی زاناو شارەزاو چاوساغ بێ لە بەرنامەی خوادا, چونکە ناگونجێ کوێر ببێتە چاوساغ‌و ڕێ پیشاندەر‌و, نەزان ناتوانێ ببێتە مامۆستاو ڕابەر.

بەڵێ گەورەترین ئەرکی پێغەمبەر ﷺ پاش ئەرکی پێغەمبەرایەتی‌و پەیامی خوا بە خەڵکی ڕاگەیاندن, بریتی بووە لە ئەرکی فەرمانڕەوایەتی‌و حوکمرانی, ئنجا پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (العلماء ورثة الانبياء) رواه احمد وأصحاب السنن‌و آخرون, واتە زانایان میراتگری پێغەمبەرانن (عليهم الصلاة والسلام). کەواتە: زانایان جێگرو جێنشینی ڕاستەقینەو ڕەسەنی

پێغەمبەرن ﷺ لە هەموو ئەو ئەرك و ئیش و كارانەدا كە پێیان هەستاوە، كە گرنگترینیان فەرمانڕەوایەتی و حوكم گێڕانە. مادام وا بێ، دەڵێین: لە نێوان زانایان و كاربەدەستاندا بە زاراوەی ژێربێژیی (عموم و خصوص مطلق) هەیە، یانی هەموو زانایەكی ڕاستەقینە بە فەرمانڕەواو كاربەستی شەرعی دادەنرێ لە سنووری تواناو بۆ گونجان (صلاحیة)ی خۆیدا، بەڵام هەموو كاربەدەستو دەستەڵاتدارێك مەرج نیە زاناو شارەزا بێ لە بەرنامەی خوادا، ڕوونتر بڵێم: هەموو زانایەكی ڕاستەقینەو تەواو لە قەدەر خۆی و بە پێی ئاستی خۆی بۆی هەیەو لێی دەوەشێتەوە ببێتە كاربەدەستو مشوورخۆری مسوڵمانان[1]، بەڵام هەموو كاربەدەستو قەمچی بەدەستێك ئەو مافەی نیە، بەڵكو بەس كاربەدەستێك بۆی هەیە، كە بگونجێ میراتی پێغەمبەر ﷺ بپارێزێ و، بشێ پێی بگوترێ میراتگرو جێگری پێغەمبەر ﷺ، واتە لە ئایینی خوادا زاناو سەر ڕاستو شارەزابێ.

ئنجا ئەم ڕاستییەی ئێستا گوتمان، بەڵگەی زۆرو زەوەند پشتگیری دەكەن و بە ئیسپاتی دەگەیەنن، كە ئێمە بڕێكیان لێ بە نموونە دێنینەوە:

1- قورئان لە هەر جێیەكدا باسی فەرمانڕەوایەتی و ڕابەرایەتی شەرعی یەكێك لە پێغەمبەران و پیاوچاكانی كردبێ، بە ئاشكرا باسی شارەزایی و چاوساغیی ئەو كەسەی كردوە، بۆ نموونە:

أ- ﴿قَالَ إِنَّ اللّٰهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ...﴾ (البقرة- 237)، ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ...﴾ (السجدة- 24)، ﴿وَاذْكُرْ عِبَادَنَا إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ

(1) هەڵبەتە ئەوە لە كاتێكدا كە جگە لە زانیاری و شارەزایی خەسڵەت و مەرجەكانی دیكەی فەرمانڕەوایەتیشی تێدابن، وەك پارێزكاریی و لێزانیی و ئازایەتی و دادگەریی و نەبوونی كەم و كوڕییەكی جەستەیی وا كە زیان بە ئەركی بەڕێوەبردنەكەی بگەیەنێ.

﴿أُوْلِي الأَيْدِي وَالأَبْصَارِ﴾ (ص- 45). هەروەها لە بە سەرهاتی بە جێنشین هەڵبژاردنی ئادەمدا گەورەترین بەڵگە هەیە, چونکە خودا زانیاری (ئادەم)ی کردە بەڵگە بەسەر فریشتەکانەوە, کە لەوان لێوەشاوەترە بۆ جێگرایەتیو فەرمانڕەوایەتی.

ب- پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابووە کە نوێنەر (وەفد)ی گەلێکی دەهاتە خزمەت کێهەیان لە قورئانێدا زاناو شارەزاتر با ئەگەر گچکەترینیشیان با, دەیکردە براگەورەو سەرۆکیان وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە.

ج- چوار جێنشینە شارەزاو ڕێرەوونی کراوەکانی پێغەمبەریش خوا لێیان رازی بێ (أبوبكر, عمر, عثمان, علي) چاکترین بەڵگەی واقیعیو زیندووی ڕاستی ئەو قسەیەن کە ئێمە خەریکی توێژینەوەو ئیسپات کردنینی, چونکە هەر چواریان نەك هەر زاناو سەر ڕاستو چاوساغ بوون لە بەرنامەی خوادا, بەڵکو بە دانپێداهێنانی زانایانی تێرو تەواوو بە ویژدان, هەر چواریان توانیویانە کۆشش (اجتهاد)یش بکەنو هەڵیش بهێنجن! جا جێی سەرنج ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ڕێوشوێنو دابو دەستووری ئەو چوار جێنشینە تەواوەی لەگەڵ هی خۆیدا باس کردوونو, کردوونی بە سەنگی مەحەكو تەرازووی مسوڵمانەتیو ئیسلام بەڕێوەبردنو حوکم گێڕانو فەرمانڕەوایەتی, وەك دەفەرموێ: **(فعليكم بسنتيو سنة الخلفاء الراشدين المهديين عضّوا عليها بالنَّواجذ...)** رواه أبو داود والترمذي, واتە: جا ڕێوشوێنی منو ڕێوشوێنی جێنشینە شارەزاو ڕێروونی کراوەکان بگرنو ددانانی لەسەر ڕۆبگرن....!!

پوختەی قسان ئەوەیە کە وشەی (أولي الأمر) هەر چەندە لە گەڵیە کەمین سەرنجو تێوەڕاماندا, وای لێ دەفامرێتەوەکە بەس فەرمانڕەواو کاربەدەستان دەگرێتەوە, بەڵام پاش سەرنجدانێکی قووڵو تێوەڕامانی زیاتر, ڕوون دەبێتەوە کە وانیە, چونکە جارێ هەموو کاربەدەستو دەسەڵاتدارە فەرمانڕەوایە نامسوڵمانەکان، بە وشەی (منكم) لێ دەچنە دەرێ, ئنجا بە چەمکی ئاشکرای

چەندان دەقی قورئان‌و سوننەتی کردەیی (السنة العلمیة)ی پێغەمبەر ﷺ فەرموودەی: **(العلماء ورثة الانبیاء)** و, واقیعی حاڵی چوار جێنشینە ڕاستەو تەواوەکانی، هەموو ئەو کاربەدەست‌و سەرۆك‌و دەسەڵاتدارە مسوڵمان‌و بەناو مسوڵمانانەش کە لە بەرنامەی خوادا زاناو سەرڕاست نین‌و, مسوڵمانان لە سەر بنچینەی ڕاوێژ (قاعدة الشوری)و بە هۆی لێوەشاوەیی‌و لێهاتوویی یانەوە هەڵیان نەبژاردوون‌و, بە میرات گرتن‌و پیلان‌و تەڵەکەو فرو فێڵ‌و زەبرو زۆر چوونە سەر کورسی حوکم, وەك تێکرای بەناو خەلیفەکانی ئەمەویی‌و[1] عەبباسیی‌و عوسمانیی، ئەوانیش دیسان لە چەمك‌و واتای وشەی (أولي الأمر) دە چنە دەرێ, کەواتە کەسانێك کە چەمك‌و واتای وشەی ناوبراو دەیانگرێتەوە بەس ئەو زانا شارەزایە ڕاستەقینانەن کە لە ئایینی خوادا چاوساغ‌و سەرڕاست بوو ون, جا چ بە مافی ڕەوای خۆیان گەیبن‌و لەلایەن خەڵکییەوە بە پێی بنچینەی ڕاوێژو بە گوێرەی لێوەشاوەیی خۆیان بە کاربەدەست‌و فەرمانڕەوا هەڵبژێررابن, وەك چوار جێنشینە ڕاست‌و تەواوەکان‌و عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو صەلاحەدینی ئەییوبی‌و چەندان کاربەدەستی دیکەی مسوڵمان، وە چ بە مافی ڕەوای خۆیان نە گەیبن‌و پلەوپایەی فەرمانڕوایەتییان بۆ فەراهەم نەهاتبێ, وەك حوسەینی کوڕی عەلی (رضي الله عنهما)و حەسەنی بەسڕایی‌و سوفیانی ثەوری ئیمام جەعفەری صادیق‌و ئیمام شافیعی ئەبوو حەنیفەو ئیمام ئەحمەدو ئیمام مالیك‌و ئیمام غەزالی‌و عەبدولقادری گەیلانی‌و ئیبن تەیمییەو شێخ ڕەشید ڕەزاو ئیمام حەسەنولبەننا و ئەبول ئەعلای مەودوی‌و سەعیدی نورسی‌و سەیید قوطب و .. هتد.

---

[1] لەنێو بەناو خەلیفە ڕێبازی ئەمەوی‌یەکاندا عومەری کوری عەبدول عەزیز -خوا لێی خۆش بێ- لەو حوکمە هەڵاوێراوە, چونکە ئەویش لەسەر خەلیفە راست‌و تەواوەکان دەڕۆیی‌و موسڵمانانیش بە راو یژی خۆیان هەڵیانبژارد، هەڵبەتە لەنێو تێکرای دەستەڵاتدارە ئەمەوی‌و عەبباسی‌و عوسماننییەکانیشدا جارو بار ئینسانی باش‌و گونجاو هەبوون, بەڵام شێوەی چوونەسەر تەختی هیچ کامیان شەرعییانە نەبووەو, نە بە گوڵێکیش بەهار دادێ‌و نە تاقە سواریش تۆزێ دەکاو, لە کاتی حوکم دانیشدا حاڵەتی گشتی ڕەچاو دەکرێ‌و، ڕێزپەڕ (شاذ)و دەگمەن حوکمیان لەسەر بنیات نانرێ.

کەواتە: چەمك و واتای وشەی (أولي الأمر) بەس بە سەر شارەزایانی ڕاستەقینەی میراتگرو جێنشینی پێغەمبەردا ﷺ دەچەسپێ و تەنیا لەواندا دێتەدی جا، چ وەك پێویستە بە پلەی فەرمانڕەوایەتی و حوکمگێڕان گەیشتبن، چ نەگەیشتبن. مادام وابێ: لە وشەی (أولي الأمر) دەفامرێتەوە کە، ئەو شەرح و لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەو هەڵێنجان (استنباط) و کۆشش (اجتهاد)ەش، کە زاناو شارەزایانی جێگری لێوەشاوەو ڕەسەنی پێغەمبەر ﷺ لە بەر تیشکی قورئان و سوننەتدا بەرهەمیان هێناوە، کە لە پوورێکی ئیسلامییەو جێی ڕێزو حورمەت و ئیعتبارو بەهرە لێوەرگرتنە، بە ئەندازەی نزیکی لە ڕووحی قورئان و سوونەتەوە.

کەواتە: بەرنامەو پەیڕەوی مسوڵمان= قورئان+سوننەت+ کەلەپوورو بەرهەمی زانایانی ڕەسەن لە پێشینان و هاوچەرخ، واتە: مرۆڤی مسوڵمان بۆ وەڵامی هەر پرسێك و چارەی هەر گیروگرفتێك و دەرمانی هەر دەردێك لە پێشەوە، دەچێتە خزمەت قورئان و دەست دەکات بە تێوەڕامان و پشکینینی، جا ئەگەر لەوێدا بە مراد گەیشت ئەوە چاکە، دەنا لە خزمەت قورئانەوە دەگوازێتەوە بۆ خزمەت سوننەت کە شەرح و لێکدانەوەی قورئانە، ئنجا ئەگەر لەوێ بە ئاکام گەیشت با سوپاسی خوای لەسەر بکات، دەنا بچێتە نێو دەریای پان و پۆڕی کەلەپوری ئیسلامیی ڕەسەن، لە شەرع (فقه) و بنچینەکانی شەرع (اصول الفقه) و تەفسیرو شەرحی فەرموودەکان و ........ هتد.

ئنجا ئەگەر لەو دەریا پان و پۆڕەشدا بۆ وەڵامی هەندێك پرسیارو مەسەلەی تازە پەیدابووی دەگمەن، یان هەر بابەت و مەسەلەیەك کە پێویست بێ چارە سەری تازە بکرێ هەرچەندە کاتی خۆیشی قسەی لەسەر کرابێ، هیچی دەستگیر نەبوو، ئەوە بە مەرجێك لە قورئان و سوننەت و ئەو زانیارییانەدا کە پێویستن بۆ لێ حاڵی بوونیان سەر ڕاست و شارەزابێ، دەتوانێ لەبەر تیشکی قورئان وسوننەت دا بۆخۆی لێبکۆڵێتەوەو دەست بکات بە تێوەڕامان و کۆشش و هەڵێنجان، بەڵام دیارە ئەوە لە حاڵێك دایە کە بابای مسوڵمان نەگەیبێتە پلەی کۆششی موتڵەق (الإجتهاد المطلق) دەنا هەر کەسێك بەڕاستی گەیبێتە پلەی ناوبراو بۆی نیە جگە لە قورئان و

سوننەت تەقلیدی کەس بکاتو دەبیٚ بوٚخوٚی کوٚشش بکاتو هەڵێنجیٚ, واتە نابیٚ هەر لە سەرەتاوە سەرنجی کەلەپووری زانایان بدات - بە مەبەستی دەرهێنانی حوکمێك- بەڵکو دەبیٚ بوٚخوٚی دەست بکات بە کوٚششو هەڵهێنجان, وە شایانی باسە کە (مجتهد) سیٚ جوٚرن:

یەك: موجتەهیدی موتڵەق (المجتهد المطلق) کە دەبیٚ یەکسەر لە قورئانو سوننەت هەڵێنجیٚ.

دوو: موجتەهدی مەزهەبی (المجتهد في المذهب) کە لە سنووری مەزەبی ئیمامەکەیدا کوٚشش دەکات.

سیٚ: موجتهید لە مەسەلەیەك یان زیاتردا, کە لە چەند مەسەلەیەکی تایبەتیدا کوٚشش دەکات.

بوٚ زیاتر دڵنیابوونیش با گویٚ لەم وتووێژەی پێغەمبەر ﷺ و (معاذ بن الجبل) -رضي الله عنه- بگرین, کە لە کاتێکدا ڕوویدا (معاذ) بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ دەچوو بوٚ یەمەن, بوٚ سەرپەرشتیکردنی خەڵکەکەی: (.. فقال له رسول الله -كيف تَقْضي اذا عَرَضَ لك القضاء؟! قال أقضي بكتاب الله؟ قال فإن لم يكن في كتاب الله؟ قال: فبسنة رسول الله قال: فان لم يكن في سنة رسول الله؟ قال: اجتهد رأيي ولا آلوا, فضرب رسول الله ﷺ على صدره وقال: الحمد لله الذي وفق رسول رسول الله لما يرضى رسول الله) أخرجه احمد وأبوداود والترمذي والبيهقي وأبن سعد، واتە: جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر مەسەلەیەکت هاتە پێش, چوٚن حوکم دەکەی؟ گوتی: بە کتێبی خوا حوکم دەکەم, فەرمووی: ئەدی ئەگەر (ئەو حوکمە) لە کتێبی خوادا نەبوو؟ گوتی: ئەو کاتە بە سوننەتی پێغەمبەری خوا, فەرمووی: ئەدی ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەری خواش دا نەبوو؟ گوتی بە عەقڵی خوٚم کوٚشش دەکەمو کەمتەرخەمی ناکەم, ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لە سینگی (معاذ)داو فەرمووی: سوپاس بوٚ ئەو خوایەی کە نێرراوی پێغەمبەری خوای ڕێڕوونی کردوە بوٚ شتێك کە پێغەمبەری خوا ڕازی دەکات.

ئێستاش هەوڵ دەدەین ئەوەی گوترا لە چەند خاڵێکدا بخەینەڕوو:

یەکەم: یەکەمین و گەورەترین سەرچاوە کە مسوڵمان دەیکاتە بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی و یاساو دەستوری لێ وەربگرێ قورئانی بەهێزو پڕ پیت و پیرۆزە.

دووەم: لە دوای قورئان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کە (فەرموودەکانی و ڕەفتارەکانی و دان پێداهێنانەکان)ی دەگرێتەوە, دووەمین سەرچاوەی بەرنامەو پەیڕەوی مسوڵمانە, هەڵبەتە سوننەتیش بە شێوەیەکی گشتی شەرح و لێکدانەوەو ڕوون کردنەوەی گوتەیی و کردەیی قورئانی بەڕێزە.

سێیەم: ئنجا لەدوای سوننەت ئەو کەلەپوورو بەرهەمە ڕەسەنە کۆن و هاوچەرخەی کە زانایانی ڕاستەقینەی میراتگری پێغەمبەر ﷺ بە عەقڵ و تێگەیشتنی خۆیان لە قورئان و سوننەت هەڵیان هێنجاوە، سێیەمین سەرچاوەی بەرنامەی پەیڕەوی مسوڵمانە. بەڵام لە کۆتاییدا خستنەڕوی ئەم چەند تێبینییە بە پێویست دەزانم:

1/ سەرچاوەکانی دیکەی یاسادانان (مصادر التشريع) جگە لە قورئان سوننەت، وەك (ئیجماع)و (قیاس)و (المصالح المرسلة)و (الإستحسان)و (العرف) .. هتد هەر دەکەونە نێو جوغزی قورئان و سوننەت, چونکە زانایانی ڕەسەن بە کۆشش و تێگەیشتنی خۆیان لە بەرتیشکی قورئان و سوننەتدا ئەو سەرچاوانەشیان دیاری کردوون بۆ هەڵهێنجان و وەرگرتنی یاسا شەرعییەکان (الاحكام الشرعية)، وە لە ڕاستیدا کۆشش کردن (اجتهاد)ی زانایان هەر بریتییە لە هەڵهێنجانی یاسا شەرعییەکان بە گوێرەی ئەو سەرچاوەو بەڵگە شەرعییانە کە قورئان و سوننەت دەلالەتیان لەسەر دەکەن, بەڵام زانایان لەسەر هەموانیان یەکدەنگ نین و مشتومڕو جیاوازی ڕایان لەبارەیانەوە هەیە[1].

1- جگە لە (إجماع) و (قياس) کە جەماوەری زانایان و زۆربەی هەرە زۆریان لەسەریان یەکدەنگن و لە دوای قورئان و سوننەتەوە ڕیزیان دەکەن.

2/ پێویستە بزانرێ کە قورئان چاودێرە بە سەر سوننەتەوەو سەنگی مەحەکیەتیو, قورئانو سوننەتیش پێکەوە چاودێرو تەرازوو سەنگی لە مەحەك درانی بەرهەمو کەلەپووری زانایانن, وە تەنیا قورئانو سوننەتیش بە دین دادەندرێنو بۆ مسولمانان پابەنکەر (مُلْزِم)نو، بەر هەمو کە لەپووری زانایان تەنیا بە تێگەیشتنو بۆچوونی ئەوان دەربارەی (دین) دادەنرێ، نەك خودی (دین)!!

3/ هەرچەندە هەموو مسولمانێك مافی ئەوەی هەیە کە بۆ خۆی لە قورئانو سوننەتدا کۆشش بکات بۆ وەرگرتنو هەڵهێنجانی ئەو یاسا شەرعیانەی کە سەری تێیان دەوەستێ, بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هەموو مسولمانێك شایستەیی کۆشش کردن (اجتهاد)ی هەیە بە کردەوە, بەڵکو هەر کە سێك پێداویستییەکان (مستلزمات)ی ئەنجا مدانی ئەو کارەی دا بین نەکردبن هەرچەندە لە ئەسڵدا (بالقوة) مافی ئیجتهادکردنی پێ دراوە, بەڵام بە کردەوە (بالفعل) لە بەر نەبوونی ئامادەییو شایستەییو دابین نەکردنی پێداویستییەکان، ئەو رێگایەی لێ گیراوەو ئەو مافەی لێوەرگیراوەتەوە.

کەواتە: دەرگای ئیجتهاد ئاوەڵایەو دانەخراوە, بەڵام جگە لە ئەهلی خۆی خەڵکی دیکە مافی پێداچوونە ژوورەوەیان نیە, ئنجا هەروەك چۆن پێشینان گوتەنی: کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ, هەروەها هیچکەسیش بەلاف لێدانو ئیددیعای بێبنچینە نەبووەو نابێتە زاناو موجتەهید, بەڵام نابێ ئەوەشمان لەبیر بچی کە وەك لە پێشەوە گوتمان: کۆشش کردن (الاجتهاد) سێ جۆرەو مەرج نیە هەر کەسێك جۆری یەکەمی لە توانادا نەبوو هی دووەمو سێیەمیشی لێ قەدەغە کرابێ, بەڵکو جۆری سێیەمیان گەلێك کەس[1] دەتوانن پێداویستییەکانی

1- دیارە مەبەستم لە (گەلێك کەس) لەنێو زانایان دایە، نەك خەڵکی نیوە خوێندەوارو عەوام.

ئەنجامدانی دابین بکەن, وەك ئێستا لە نێو زاناو لێکۆڵەرەوانی هاوچەرخماندا باوەو قۆڵی هیممەتی لێ هەڵکراوەو بیروبۆچوونی چاك چاکیش بەرهەم هێنراون.

## خاڵی سێیەم

## (ڕابەرو سەرمەشق):

خوای بەبەزەییو پەنهانزان فەرمووویەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللهَ وَالْيَوْمَ الآخِرَ وَذَكَرَ اللهَ كَثِيرًا﴾ (الاحزاب- 21), واتە: بەڕاستی بۆ هەر کەسێك لە ئێوە کە بەتەمای بەزەیی خواو ڕۆژی دوایی بێو, زۆریادی خوا بکات سەرمەشقییەکی چاك هەیە لە پێغەمبەری خوادا. ئەم ئایەتە مەزنە بەڕاشکاویی ڕای دەگەیەنێ کە چاکترینو تەواوترین ڕابەرو سەرمەشقو پێشڕەو بۆ مرۆڤی مسوڵمان پێغەمبەری خوایە ﷺ جا بێگومان ڕابەرو سەرمەشق بوونی پێغەمبەر ﷺ بۆ بابای مسوڵمان بەس لە بواری خواپەرستیو خووڕەوشتدا نیە, بەڵکو لە سەرلەبەری لایەنەکانی ژیانیو هەموو وردو درشتێکی دایە. ئنجا پابەندیو گەردنکەچی مسوڵمانیش بۆ ڕێوشوێنی پێغەمبەر ﷺ بە پێ چەوانەی بیرکردنەوەی هەندێك کەسەوە, شتێکی سوننەت نیە کە مرۆڤ کەیفی لێ بوو بیکاتو کەیفی لێنەبوو چش!! ئەمەش چەند دەقێکی قورئانو سوننەت لەوبارەوە:

* ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۞ قُلْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ فإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾ (آل عمران: 31-32), واتە: بڵێ ئەگەر ئێوە خواتان خۆشدەوێ, ئەوا شوێنم بکەون خواش خۆشی دەوێن, وە تاوانەکانتان بۆ دەپۆشێ, وە خوا تاوان پۆش و بەبەزەیی یە, بڵێ فەرمانبەری خواو پێغەمبەر بکەن, جا ئەگەر ڕوو یان وەرگێڕا ئەوە بێگومان خوا کافرانی خۆش ناوێن! وەك دەبینین گرتنی ڕێوشوێنی پێغەمبەر ﷺ و پابەندی بە سوننەتەکانیەوە بەڵگەیەکی پێویستە بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ خۆشەویستی خۆی سەبارەت بە خوا ئیسپات بکات, وە لەلایەکی دیکەشەوە بە ڕوو لێوەرگێڕانی مرۆڤ کافر دەبێ و پێی لە ئایین وەردەگەڕێ.

* ﴿وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾(آل عمران- 132), واتە: فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکەن بەشکم ڕەحمتان پێ بکرێ، لێرەشدا دەبینین وەدەستهێنانی بەزەیی و میهرەبانی خوا بەستراوەتەوە بە گەردنکەچی مرۆڤ بۆ خواو پێغەمبەر ﷺ, کەواتە هەر کەسێك ئەو خەسڵەتەی تێدا نەبێت بەو مرادە ناگات!

* ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (النور- 64), واتە: جا با ئەوانەی سەرپێچی لە فەرمانیوی (واتە پێغەمبەر) دەکەن و وریابن تووشی بەڵایەك نەبن, یان ئازارێکی بە ئێش شیان تووش نەبێ (لەدوا ڕۆژدا) (إبن جرير الطبري) -خوا لێی خۆش بێ- لە تەفسیری (فتنة)دا گوتوویەتی: (قيل الفتنة، هاهنا -الكفر-)[1].

1- مختصر تفسير الطبري ل 402 .

* ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا﴾(الاحزاب- 36)، واتە: هیچ پیاوێکی بڕوادارو ئافرەتێکی بڕوادار هەر کاتێك خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاریاندا بۆیان نیە خاوەنی هەڵبژاردنی، کردنو نەکردن بن لە کاروباریاندا، هەر کەسێك سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکات, ئەوە بێگومان بەئاشکرا گومڕابووە.
* ﴿وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّن بَعْدِ ذَلِكَ وَمَا أُولَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ﴾(النور-47)، واتە: وە دەڵێن بڕوامان بەخواو بە پێغەمبەر هێنا, وە گەردن کەچین! کەچی دەستەیەکیان دوای ئەوە پاش دەکەنەوە, وە ئەوانە بڕوادار نین.

پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەوە فەرموودەی زۆرن, بۆ نموونە:

* **(تركت فيكم أمرين لن تضلوا ما تمسكتم بهما: كتاب الله و سنتي)** رواه الحاكم و ابن عبدالبر، واتە: دوو شتم لەنێودا بەجێ هێشتوون، هەتا دەستیان تێ بگرن قەت سەرگەردان نابن, کتێبی خواو ڕێوشوێنی خۆم.
* **(كل أمتي يدخلون الجنّة الاّ مَنْ أبى, قالوا يا رسول الله ومن يأبى؟ قال من أطاعني دخل الجنّة ومن عصاني فقد أبى)** رواه البخاری والحاكم, واتە: ئوممەتم هەموو دەچێتە بەهەشتێ، مەگەر کەسێك، کە نەیەوێ, گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا جا کێ نایەوێ؟! فەرمووی: هەر کەسێك فەرمانبەریم بکات دەچێتە بەهەشتێ، وە هەر کەسێك سەرپێچیم بکات ئەوە نایەوێ (بچێتە بەهەشتێ).
* (ألا هل عسى رجل يبلغه أحاديث عني وهو متكيءٌ على أريكته فيقول بيننا وبينكم كتاب الله, فما وجدنا فيه حلالاً استحللناه و ما وجدنا فيه حراماً حرَّمناه! وإن ما حرم رسولُ الله كما حرم الله) رواه الترمذي, واتە: ها، ڕەنگە نزیك بێت پیاوێك چەند فەرموودەیەکی منی پێبگەن لە حاڵێکدا، کە لە سەر

تەختەکەی پاڵی داوەتەوە, بڵێ با کتێبی خوامان لەنێواندا بێ, جا هەر چی دیتمان لەوێدا حەڵاڵە، ئێمەش بە حەڵاڵی دەزانین, وە هەرچی لەوێشدا حەڕامی کردوە ئێمەش بە حەرامی دەزانین! بەڵام ئەوەی پێغەمبەریش (حەڵاڵ‌و) حەرامی کردوە ڕاست وەك ئەوە وایە، کە خوا (حەڵاڵ‌و) حەڕامی کردوە.

کەواتە وەك دیتمان پابەندیی مرۆڤی مسوڵمان بە ڕێو شوێنی پێغەمبەرەوە ﷺ مەرجی مسوڵمانەتی‌و بڕواداریەو، بەڵگەو شایەدی ڕاستی خوا خۆشویستنەو، لادان‌و دەرچوونیش لە ڕێو شوێنی پێغەمبەر ﷺ دەبێتە هۆی کافربوون‌و وەرگەڕان‌و سەرگەردانی‌و ماڵ وێرانی دنیاو دواڕۆژان, ئنجا وەك لە پێشەوەش باسمان کرد، پێغەمبەری هەڵبژاردە (محمد)ی پێشەوا ﷺ وە نەبێ تەنیا لە بواری مەعنەوی‌و خواپەرستیدا ڕابەرو براگەورەو سەرمەشق‌و چاوساغی مسوڵمانان بێ, بەڵکو پێویستە بابای مسوڵمان لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیانیدا عیبادەت، سیاسەت, تەقوا، غەزا, ماددی، مەعنەوی, جەنگ, ئاشتی، درشت‌و ورد .. هتد، لە هەموو ئەم لایەن‌و بوارانەی ژیانیدا جگە لە پێغەمبەر ﷺ و دوای هیچ ڕابەرو سەرمەشقێکی دیکە نەکەوێ‌و, ئەسڵەن جگە لە پێغەمبەر هیچ کەس بە ڕابەرو سەرمەشقیش لەقەڵەم نەدات, چ جای شوێن کەوتن[1]، هەڵبەتە زاناو پێشەوایانی دڵ بێدارو جەرگ داریش, بۆیە جێی حورمەتن, چونکە میراتگرو جێگری پێغەمبەرن‌و, پاش پێغەمبەر ﷺ, خەت‌و ڕێو شوێنی پێغەمبەر سپاردەیەکە بەوان سپێردراوەو پاراستن‌و ڕاگەیاندن‌و چەسپاندنی, ئەرکێکە بە وان دراوە، جا کە سێك ئەم باسە بخوێنێتەوەو وەك پێویست تێی بگات، تێدەگات تا چ ئەندازەیەك خەڵکی بە مسوڵمان حسێب کراوی ئەم ڕۆژگارە لە ئیسلامەتی دوور کەوتۆتەوەو ڕێی ڕاستی لێ‌بزر بووەو هەتلەبووە, چونکە کەمێکی کەمیان (وەك پێویست) بە

1- واتە ڕابەرو پێشەواو سەرمەشقی موتلەق‌و بێ چەندو چوون.

زمانی کردەوەو حاڵ پێغەمبەریان ﷺ بە سەرمەشق و ڕابەرو پێشەوای خۆ یان قبووڵەو، زۆربەی هەرەزۆریان بابایەکی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی یان خۆ ماڵی و ئاسایی یان کردۆتە براگەورەو سەرمەشقی خۆیان, کە چاوی دڵ یان بەتیری بیردۆزان کوێر کراوەو، هەگبەی مێشکیان بە ئەفسانەی پڕو پاڵانتەی ڕێ چکان ئاخنراوەو, ئاگایان پێ لەخۆ بڕاوە!!

# خاڵی چوارەم

## (ئەرکی سەرشان):

خوای بێ هەڵە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۞ وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَذَا لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ هُوَ مَوْلَاكُمْ فَنِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ﴾(الحج: 77–78)، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ڕکووع بەرن و کڕنووش بەرن, وە پەروەردگارتان بپەرستن, وە چاکە بکەن بەشکم سەرفرازبن, وە لە پێناوی خوادا تێبکۆشن, تێکۆشانێکی ئەوتۆ کە لەوی بوە شێتەوە, ئەو هەڵی بژاردوون (بۆ بەڕێوەبردنی بەرنامە کەی) وە لە ئایین دا هیچ سەغلەتییەکی نەڕەخساندوە, (ئەم ئایینە) ئایینی ئیبراهیمی بابتانە, ئەو (واتە خوا) لەمەو بەرو

لەم (قورئان)ەشدا ناوی لێناون مسوڵمان بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بە سەرتانەوە شایەد بێ‌و, ئێوەش شایەدبن بەسەر خەڵکەوە (کە بەرنامەی خوا تەواوە) جا نوێژی بەرپا بکەن‌و زەکاتێ بدەن, وە دەست بە خوا بگرن, بەس ئەوە مە شوورگێڕتانەو ئەویش چاکترین مشوورگێڕەو چاکترین وەسەرخەرە.

دەتوانین لەبەر تیشکی زێڕینی ئەم دوو ئایەتە مەزنەدا ئەر کە بنەڕەتیـیەکانی بابای مسوڵمان بخەینەڕوو:

**یـــەك**: خوا پەرستی (ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ): بەڵـێ یەکەمین ئەرکی بنەڕەتی‌و سەرەکی بابای مسوڵمان بریتیە لە خوا پەرستی (العبادە) کە زەقترین شێوەی عیبادەت (ڕکووع‌و کڕنووش)ە، کە بەشی هەرە گەورەو گرنگی نوێژن, مادام وابێ دەتوانین بڵێـین: خواپەرستی (العبادة) کە نوێژ زەقترین‌و گەورەترین جۆرو شێوەیەتی یەکەمین ئەرکی سەرشانی مسوڵمانە. هەڵبەتە ئێمە بەخەست‌و خۆڵیی مەسەلەی خواپەرستیمان لە کتێبی (خواپەرستی مسوڵمان)دا توێژەوەتەوە، بۆیە بە پێویستی نازانم لێرەدا زۆری وەدوا بکەوم....

**دوو**: خەڵك دۆستی (وَافْعَلُوا الْخَيْرَ): پاش خواپەرستی‌و بەندایەتی نواندن بۆ خوا، خەڵك دۆستی‌و چاکەکردن لەگەڵ خەڵکیدا، گەورەترین ئەرکی مسوڵمانە, چونکە ڕەوشتی پەسندو سوود بە خەڵکی گەیاندن، تەرازووو سەنگی مەحەکی ڕاستی‌و ناڕاستی‌و وەرگیران‌و وەرنەگیرانی ئەو خواپەرستی‌یەیە، کە مسوڵمان ئەنجامی دەدات, وە دیسان چاکەکاری‌و خەڵك دۆستی ئەنجام‌و بەرهەمی سروشتی‌و ڕاستەوخۆی خواپەرستی‌یە, هەر بۆیەش خوا پاش (وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ) فەرموویەتی: (وَافْعَلُوا الْخَيْرَ).

هەڵبەتە بەڵگەش زۆرن لە قورئان‌و سوننەتدا لەسەر ئەوە، کە چاکەکاریی‌و سوود بە خەڵکی گەیاندن، سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتی‌و درو شم‌و نیشانەی ڕاستی‌و ساغی خواپەرستی‌یەکەینی, بۆ وێنە خوای بەخشەرو بەبەزەیی

فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُبْطِلُواْ صَدَقَاتِكُم بِالْمَنِّ وَالأذَى كَالَّذِي يُنفِقُ مَالَهُ رِئَـاء النَّاسِ وَلاَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ....﴾ (البقرة-264)، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە, خێرەکانتان بە منەتکردن‌و ئازاردان (ی دڵی بابای نەدار) بەتاڵ مەکەنەوە, وەك ئەو کەسەی کە بۆ ڕیایی‌و سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی سامانی خۆی دەبەخشێ, بەڵام بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی نیە.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((الخلق كلهم عيال الله فأحب الخلق الى الله من أحسن الى عياله)) رواه الطبراني وابو نعيم والبيهقي, واتە: خەڵك هەموو ڕەعیەتی خودان, جا خۆشەویستترین کەس لەلای خوا, ئەو کەسەیە کە چاکە لەگەڵ ڕەعیەتەکەی دەکات، کەواتە:

1- هەر کەسێك منەت لەسەر خەڵکی بکات‌و دڵیان ئازار بدات, ئەو خێرو چاکەیەی لەگەڵیان دەکات‌و ئەو ماڵەی کە دەیاندات, بەتاڵ دەبێتەوەو لەسەریشی قەرزار دەبێتەوە.

2- هەر کەسێك نوێژەکەی لە کاری دزێوو بەد نەیپەرێنگێنێتەوە, نەك هەر لێی وەرناگیرێ, بەڵکو لەسەریشی سزادەدرێ‌و پێی لە خوا دوور دەکەوێتەوە.

3- خۆشەویست ترین کەس لەلای خوا ئەو کەسەیە کە لەگەڵ خەڵکی خوادا چاك بێ‌و سوودیان پێ بگەیەنێ.

**سێ:** ئەوپەڕی تێکۆشان لە ڕێی خوادا ﴿وَجَاهِدُوا فِي اللهِ حَقَّ جِهَادِهِ﴾:

تێکۆشان‌و ڕەنجدان لە پێناوی بەرزکردنەوەی ناوی خواوچەسپاندنی بەرنامەکەیدا, ئەنجام‌و بەرهەمی (خوا پەرستی‌و خەڵك دۆستی)یە, چونکە کەسێك خواپەرستێکی ڕاست‌و ساغ بێ, دڵی وەبەر ناوەستێ‌و چاوی بەرینایی نادات‌و دەروونی ناسرەوێ‌و ئارام ناگرێ, هەتا ناوی خوا لە هەموو شتێك بەرزترو بەرێزتر نەبێ, وە کەسێك بەڕاستی خەڵکی خۆش بوێ‌و دۆست‌و دڵسۆزیان بێ, ڕاناوەستێ‌و حەجمینی لێ هەڵدەگیرێ هەتا حوکم‌و بەرنامەی خوا لە زەویدا

دەچەسپێنێ, چونکە دەزانێ کە تاقە بەرنامەیەك کە بتوانێ دادگەریو ئازادیو یەکسانی ڕاستەقینە بۆ خەڵکی فەراهەم بێنێو, لەژێر نیرو ڕکێفی تاغووتو زۆردارانی ستەمکارو چەوسێنەرو خۆ بە خوا زانیان دەرێنێ, بەرنامەو پەیڕەوی خودایە، بەڵێ لە ڕاستیدا تێکۆشانو جەنگ کردن لە ڕێی خواو ڕزگاری خەڵکیدا یەکێکە لە ئەرکە هەرە گرنگو بنەڕەتییەکانی مرۆڤی مسوڵمان وەك خوا (جلّ جلاله) فەرمووییەتی: ﴿وَمَا لَكُمْ لاَ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ...﴾ (النساء- 75)، چونکە مانەوەو ڕاوەستانی ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر زەویو تێك نەچوونو گەندەڵ نەبوونو بۆگەنیو نەبوونی ژیانی دنیا لە گرەوی جەنگو تێکۆشانی بەرەی هەقی خواپەرست دایە دژی بەرەی ناهەقی تاغووت پەرستو دنیا پەرستو خۆپەرستو چیو چی پەرست!! واتە هەروەك چۆن بەین بەین هاتنی لافاوو لێزماوی ڕامالەرو دنیاو پاککەرەوەو، هەڵکردنی بایەکی بە هێزی هەوا شڵەقێنو شت ڕاتەکێنەر, شتێکی زۆر گرنگو پێویستە بۆ پاککردنەوەو خاوێن کردنەوەی دنیاو, گەسك لێدانو ڕامالینی ئەو میکرۆبو زیندەوەرە زیانبەخشو پیسانەی کە بە هۆی خڕبوونەوەو لەسەریەك کەڵەکەبوونی زبڵو زاڵو خشتو خاڵو شتی گەندەو پیسەو پەیدابوونو ترووکاون, ماوە ماوە سەرهەڵدانو پەیدابوونی کۆمەڵی خوا ( حزب الله) یش بۆ پاك سازی دنیاو چاککردنەوەی بارودۆخی تێك چووو شێوێنراو شتێکی یەکجار گرنگو پێویستە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَوْلاَ دَفْعُ اللهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الأَرْضُ وَلَـكِنَّ اللهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ (البقرة-251), واتە: وە ئەگەر خوا هەندێك خەڵکی (بەدو خراپەکاری) بە هەندێك (ی خواناسو چاکەکار) پاڵ پێوە نەنابا (و دنیای لێ پاك نەکردبانەوە) زەوی تێك دەچوو, بەڵام خوا خاوەنی چاکەیە بەسەر خەڵکیەوە. وەك دەبینین خوا هەبوونی بەرەی

هەقی جەنگاوەرو تێکۆشەر, بە نیعمەت‌و چاکەی خۆی لە قەڵەم دەدات بە سەر خەڵکییەوە, چونکە مایەی پارێزران‌و ساغ‌و سەلامەتی ژیان‌و مانەوەیەتی.

هەربۆیەش یەک سەر دوا بەدوای ﴿وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ﴾ فەرموویەتی: (هُوَ اجْتَبَاكُمْ) واتە: ئەو (خوا) هەڵی بژاردوون! بەڵێ خوا مسوڵمانانی هەڵبژاردوون‌و پەسندی کردوون بۆ بەڕێوەبردنی بەرنامە کەی‌و, بەرزکردنەوەی ناوی‌و, لەنێوبردنی دوژمن‌و ناحەزانی بەدناوی, وەك لە جێیەکی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ...﴾(آل عمران 110), واتە: ئێوە چاکترین کۆمەڵن کە بۆ مرۆڤایەتی هێنراوەتە دی, فەرمان بە چاکە دەکەن‌و ڕێ لە خراپە دەگرن, وە بڕوا بە خوا دێنن... ئنجا بۆ ئەوەی هیچ کەس گومان نەبات کە جەنگ‌و تێکۆشان لە پێناوی خوادا شتێکە لە توانای مرۆڤدا نیەو پێی ئەنجام نادرێ، فەرموویەتی: (وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ) واتە: وە لە بەرنامەی خۆیدا هیچ شتێکی وای دانەناوە کە پێیەوە سەغڵەت بن‌و پێتان جێبەجێ نەکرێ.

ئنجا دوابەدوای ئەوە ڕایگەیاندوە کە ئەو ئاین‌و بەرنامەیەی فەرمانمان پێ دەکات لە پێناویدا بجەنگین‌و تێکۆشین, هەمان بەرنامەو خەت‌و ڕێو شوێنە کە باپیرە گەورەمان (ابراهیم)ی لەسەر بووە: (ملە أبیکم إبراهیم ..). جا بێگومان بەس (إبراهیم) -علیە الصلاة والسلام- لەسەر ئەو خەت‌و ڕێبازە نەبووە بەڵکو پێغەمبەرانی دیکەش -علیهم الصلاة والسلام- هەر لە سەر هەمان خەت ڕۆیشتون, بەڵام لە سۆنگەی ئەوەی کە ئیبراهیم لە هەمووان پتر لەو ڕێیەدا جەنگیوەو تێکۆشاوەو لە هەموان زیاتر ئەو خەت‌و ڕێبازەی درەو شاندۆتەوە، لێرەدا بە تایبەتی ناوی وی هێنراوە.

**چوار**: بەسەرخۆدا نەبڕینی هیچ ناوێك بێجگە لە (مسولمان) (**هو سماكم المسلمين**): ئەركێكی دیكەی بنەڕەتیو گرنگی مرۆڤی مسولمان ئەوەیە كە بێجگە لەو ناوەی كە خوا بۆی هەڵبژاردوە, هیچ ناوێكی دیكە لە خۆی نەنێ, چونكە بێجگە لە خوا هیچ كەس لەوە ناوەشێتەوەو مافی ئەوەی نییە ناو لە بەرنامەی خوا یان لە كۆمەڵی خوا بنێ, جا تاقە ناوێك كە خوا لە بەرنامەو پەیڕەوی خۆی ناوە بریتیە لە ئیسلام, وەك فەرموویەتی: ﴿**إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللهِ الإِسْلَامُ**﴾ (آل عمران-19) ..

بێگومان بەرنامە لای خوا بەس ئیسلامە. وە فەرموویەتی: ﴿**وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلَامَ دِينًا**..﴾(المائدة-3) ..وە ئیسلامم بۆ بە بەرنامە پەسند كردوون .. تاقە ناوێكیش كە خوا بۆ كۆمەڵی خۆی هەڵیبژاردوە بریتیە لە (مسولمان) وەك لەم ئایەتەدا كە سەرگەرمی توێژینەوەینی، فەرموویەتی: ﴿**هو سماكم المسلمين**..﴾ ئەو ناوی لێناون مسولمان. هەڵبەتە دانەتاشینو بەسەرخۆدا نەبڕینی ناوو نیشانەی جوێ جوێش لە نێو مسولمانان دا, دەورێكی یەكجار گرنگو كاریگەر دەبینێ لە پێكەوەبەستنو گرێدانی مسولمانانو یەك ڕیزیو پێكەوە جۆشدانیاندا, وە بە پێچەوانەوە داتاشینو بەسەرخۆدا بڕینی ناوو درووشمی جیاجیا, دەورێكی یەكجار كاریگەرو بێڕەزا دەبینێ لە پەرتەوازە كردنو لێك بڵاوبوونو تاقم تاقمێنەو جوغز جوغزێنەیاندا, هەر كەسێكیش لە ئاقار هەقیدا چاوان لە قووچ نەنێو[1], لە ڕاست واقیع هەڵنەیەتو خۆ گێل نەكات, ڕاستی, ئەم قسەیە لەم سەردەمەدا زۆر بە ڕوونی بە چاوان دەبینێ, بەڵام حەیفێ وەك گوتراوە: (حُبُّك للشيء يُعْمي ويُصم)[2].

(1) چاو لە قووچ نان: چاو نووقاندن, كە كینایەیە بۆ خۆ گێل كردنو خۆ بەسەرەوە نەبردن.

(2) لە بەشی پێنجەمی كتێبی (بەرنامەی فیكریی كاری ئیسلامی)دا كە (بناغەی كۆبوونەوە) یە ئەم مەسەلەیەمان چاك توێژیوەتەوە، پێویستە سەرنجی بدرێ.

**پێنج:** بونە بەڵگەو شایەد لەسەر ڕاستی ئایین ﴿وتكونوا شهداء على الناس﴾:
یەکی دیکە لە ئەرکە هەرە گرنگ‌و بنچینەیی یەکانی بابای مسوڵمان ئەوەیە کە ببێتە بەڵگەو شایەدی ڕاستی‌و تێروتەواوی ئایین‌و بەرنامەی خوا بەسەر خەڵکییەوە، واتە جۆرە مسوڵمانەتییەك ئەنجام بدات کە هەر کەسێك بیبینێ، ڕاستی‌و تێروتەواویی ئەو ئایین‌و بەرنامەو پەیڕەوەی تێدا ببینێ کە خۆی بە شوێنکەوتوو و پابەندی دەزانێ.

جا لە ڕاستیدا ئەم ئەرکە گەورەترین‌و بەرزترین‌و قورسترین ئەرکی سەرشانی مرۆڤی مسوڵمانە. بۆیە دەڵێین (گەورەترین) چونکە، بەراستی بوونە بەڵگەو شایەدی ئیسپات‌و سەلماندنی ڕاستی‌و تەواویی‌و بێ پەڵەیی بەرنامەی خوا، شتێکی یەکجار گەورەو مەزن‌و مەترسیدارە، جا دەبێ چی لەوە گەورەترو مەزنتر چ بێ، کە مرۆڤی مسوڵمان ببێتە ئاوێنەیەك، کە بەرنامەو پەیڕەوی خوای تێدا دەربکەوێ‌و پێشانی خەڵکی بدرێ؟! وە بۆیە دەڵێین (بەزترین)، چونکە هیچ ئەرك‌وكارێك لەوە بەرزتر نییە، کە خوا ئەرکی خستنەڕووی بەرنامەی خۆی‌و، سەلماندنی چاکی‌و تێرو تەواویی، بخاتە ئەستۆی بەندەکانی‌و ڕایانسپێرێ، کە ڕاستیی خوا ئیسپات بکەن لەوەدا، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَـٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ..﴾ (الاسراء-9)!! وە بۆیە دەڵێین (قورسترین)، چونکە هیچ ئەرکێك لەوە گرانتر نیە، کە بە قسەو کردارو ڕەفتاری تۆ ئایین‌و بەرنامەی خوا ڕاست‌و ساغ‌و کامڵ بێتە بەرچاوی خەڵکی، یان بە پێچەوانەوە، خوارو نارێك‌و ناتەواو، چونکە لە حاڵەتی یەکەمیاندا، خۆشت ڕو سورو سەربەرزی لای خوا دەکەی‌و، خەڵکیش بە چاکیی‌و پەسندیی‌و تەواویی ئیسلام ئاشنا دەکەی، وە لە حاڵەتی دووەمیشیاندا هەم بۆ خۆت ڕووزەردو شەرمەزار دەبی‌و، هەم خەڵکیش بە هۆی تۆوە لە ڕێی ڕاستی خوا هەتلە دەبێ‌و، گیرۆدەی ڕێچکەی خوارو نالەبارو، ڕابەرو پێشڕەوی بەرژەوەندی دۆست‌و هەلپەرست‌و بێبار دەبێ!! ئنجا سەربارەی ئەوەش (بوونە بەڵگەی شایەدی ڕاستی ئایین)

ئەرکێکە هەموو ئیش و کارو جم و جۆڵ و چالاکی و خەسڵەتەکانی مرۆڤی مسوڵمان دەگرێتە خۆی، چونکە مرۆڤی مسوڵمان بە کۆکردنەوەی هەر کام لە (خواپەرستی) و (خەڵك دۆستی) و (ئەوپەڕی تێکۆشان لە ڕێی خوادا) و (بە سەر خۆدا نەبڕینی هیچ ناوێك جگە لە ئیسلام) و ... هتد، ئەو جار دەتوانێ ئەرکی ناوبراو جێبەجێ بکات! کەواتە ئەرکی (بوونە بەڵگەو شایەدی ڕاستیی ئیسلام) گەورەترین و بەرزترین و قورسترین ئەرکی سەرشانی مرۆڤی مسوڵمانە! جا هەی لەوەی ئازابێ و ئاوێنەیەکی سپی و ساف و بێ پەڵەبێ و، ئیسلامێکی ڕاستو تەواو لە خۆیدا پێشانی خەڵکی بدات و، لە دادگای واقیعی ژیانی سەرزەوی دا بە هۆی خواپەرستی و چاکەکاریی و تێکۆشان و ڕەنج دانییەوە، ڕاستیی و تێرو تەواویی و بێ هەڵەو پەڵەیی بەرنامەو پەیڕەوی خوا بسەلمێنێ و، بێ گرێ و گۆڵ و پێچ و پەنا بە ئیسپاتێکی پتەوی بگەیەنێ.

**شەش**: نوێژکردن و زەکات دان ﴿**فأقيموا الصلاة و آتوا الزكاة**﴾: یەکی دیکە لە ئەرکە بنچینەیی یەکانی (مسوڵمان) بەرپاکردنی نوێژو زەکات دانە، نوێژ کە ئەوپەڕی گەردن کەچی و بەندایەتی و، زەقترین و تەواوترین شێوەی خواپەرستی (ڕکووع و کڕنووش)ی تێدایە، جۆرو چۆنیەتی پەیوەندی مرۆڤی مسوڵمان بە خواوە دیاری دەکات، وە زەکاتیش کە بەرزترین شێوەی چاکەکاریی و یارمەتی دانە، جۆرو چۆنیەتی پەیوەندی مرۆڤی مسوڵمان بە خەڵکییەوە دەخاتەڕوو.

(نوێژ) و، (زەکات)یش -کە جۆرێکە لە جۆرەکانی ماڵ بەخشین- دوو مەسەلەی یەکجار گرنگ و بایەخدارن و، لێکۆڵینەوەی زۆرو زەوەند هەڵدەگرن، بەڵام لێرەدا ئەو دەرفەتەمان نیەو، خوێنەر حەواڵەی کتێبەکانی دیکەمان دەکەین[1].

---

[1] لە بەشی دووەمی (خواپەرستی ئیسلامیی)دا لێکۆڵینەوەیەکی خەست و خۆڵمان دەربارەی نوێژو زەکات و باقی دروشمەکانی دیکەی خواپەرستی کردوە.

**حــەوت**: یەکلابوونەوەو پشت بە خوا بەستن ﴿**واعتصموا بالله هو مولاكم**﴾:

دوایین ئەرکی مرۆڤی مسوڵمان (کە لەبەر تیشکی ئەم دوو ئایەتەدا دێتە بەرچاو) ئەوەیە, کە بابای مسوڵمان دڵنیاو دڵ دامەزراو بێ کە جگە لە خواو بەرنامەی خوا, هیچ کەسو هیچ بەرنامەو پەیڕەوێکی دی کە دادی نادات‌و دەفریای نایەت, مادام وابێ با بەس بۆ خواو بەرنامەکەی ساغ‌و یەکلابێتەوە, تەنیا بە خواو بەرنامەکەشی پشت ئەستووربێ.

بەڵێ یەکی دیکە لە ئەرکە بنەڕەتییەکانی مسوڵمان ئەوەیە کە بە زمانی کردەوەو حاڵ‌و لە دنیای واقیعدا ئیسپاتی بکات, کە جگە لە خوا ( سبحانەو تعالی) پشتی بە کەس قایم نیەو بێجگە لە یارمەتی‌و دەستگرتنی وی, چاوی لە یارمەتی‌و دەستی کەسی دیکەوە نیەو, جگە لە ئیسلامیش دڵی بە هیچ ڕێیەکی دیکە خۆش نیەو, بەتەما نیە غەیری ئیسلام بتوانێ دەفریای بێ‌و چارەسەرەی دەردو گیروگرفتەکانی بکات، چونکە غەیری ئیسلام (کە هەموو ڕێچکەو بیردۆزە ڕۆژهەلاتی‌و ڕۆژئاوایی‌و خۆماڵییەکان دەگرێتەوە) شتێکە خوا (عزّ وجلّ) بە حەرام‌و قەدەغەکراوی داناوەو, فەرمانی پێکردووین کە نابێ وەدوای بکەوین, وەك فەرموویەتی: ﴿**وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ**﴾ (آل عمران- 85), واتە: هەر کەسێك جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی دی بخوازێ, ئەوە لێی وەرناگیرێ‌و, ئەو لە دوارۆژدا لە زیانبارانە. دیسان فەرموویەتی: ﴿**وَأَنَّ هَـذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ...**﴾(الانعام- 153), وە ئەم (ئیسلام)ە ڕاستە ڕێی منە, جا دوای بکەون‌و وەدوا ڕێچکان مەکەون... جا بێگومان وەك پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی: **(إن الله لم يجعل شفاءكم فيما حرم عليكم)** رواه احمد والطبراني وابن أبي شيبة و رواه مسلم بلفظ قريب منه, واتە: بێگومان خوا چارەسەر (و دەرمانی دەرد)ی ئێوەی لەو شتانەدا دانەناوە کە

لێی قەدەغە کردوون! غەیری ئیسلامیش قەدەغەیە, کەواتە دەرمانو چارە سەری تێدا نیە.



## خـاڵی پێنجـەم

## (قورئانو سـوننـەت):

خوا پشتیوان بێ لەم چەند بڕگەی خوارێدا بە کورتی بیرو بۆچوونو هەڵوێ ستی مسوڵمانی کامڵ دەربارەی قورئانو سوننەت دەخەینە ڕوو:

**یەکەم:** بێگومان (قورئان) قسەی خوای پەروەردگارەو (سوننەت)یش ڕێو شوێنو پەیڕەوی پێغەمبەری سەردارە ﷺ, مادام وا بێ, ئەندازەی بڕوا پێبوونو ڕێزدانانمان بۆ قورئانو سوننەت بارتەقای بڕوا پێبوونو ڕێزگرتنمانە لە خواو پێغەمبەری نەخوێندەوارمانﷺ .

جا بێگومان مسوڵمانی کامڵ پتەوترین بڕوای بە خوا هەیەو ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستیو شەرمو سامی لە دڵ دایە سەبارەت بە خوای بەرزو مەزنو, بڕوای بەڕاستییەتی پێغەمبەران بە گشتیو (محمد) بە تایبەتی قایمەو, قەناعەتی تەواوی هەیە کە پێغەمبەرانی خوا (علیهم السلام) بێ هەڵەو پەڵەنو پارێزراو (معصوم)ن لە هەر تاوانو خراپەیەك کە لەگەڵ پلەو پایەی پێغەمبەرایەتیدا ناگونجێ.

**دووەم:** قورئانو سوننەت لە نێو بەڵگە شەرعییەکان (الأدلة الشرعية)دا دوو تاقە سەرچاوەی[1] (متمانە پێکراوی تەواو)و(مشتومڕ هەڵنەگر)و( سەربەخۆ - مستقل)ن بەڵام غەیری وان, وەك قسەی یارانی پێغەمبەر ﷺ و قسەی پێشەوایانی کۆششکەر (الأئمة المجتهدون) وانیـن.

**سێیەم:** هەر کەسێك ئینکاری حوکمێك بکات کە قورئانو سوننەت بە دەقێکی متمانەداری تەواوو بێ پێچو پەنا (قطعي الورود وقطعي الدلالة) فەرمانیان پێ کردبێ, ئەوە لە ڕیزی مسوڵمانان دەچێتە دەرێ[2].

---

1- ئەم قسەیە (قد ضمن الله لي العصمة في الكتاب والسنة ولم يضمنها لي في سواهما) دروشمی زانایانی پێشوومان بووە, خوا لێیان خۆش بێ.

(2)﴿قُلْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ فإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْكَافِرِينَ﴾(آل عمران-32). تێبینی: مەبەست لە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر (اطاعة الله والرسول) لێرەداو لە هەر شوێنێکی دیکەی قورئانو سوننەتدا, پابەندبوونە بە قورئانو سوننەتەوە, ئەمە ڕای تێکرای زانایانی لەسەرە, بۆ وێنە بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري), إبن حجر العسقلاني ب13، ل 195, وە بڕوانە (الجامع لاحكام القران) للقرطبي ب 3، ل261, هەروەها هەرکام لە (إبن كثير)و (الشوكاني)و (بيضاوي)و (طباطبائي)یش

**چوارەم:** قورئان‌و سوننەت تەرازووی ئیسلامەتی‌و سەنگی مەحەکی قسەو بڕیاری هەموو زاناو پێشەوایانن, وە لە هەر شتێكدا كێشەمان بۆ هاتە پێ شێ دە بێ بگەڕێینەوە بۆ لای وان, وە قسەو بڕیاری هەر كەسێكیش هەر چەندە یەكجار پایە بەرزو بەڕێز بێ، بەس بە ئەندازەی نیزیكی‌و سەرچاوە گرتنی لە قورئان‌و سوننەتەوە ڕێزی لێدەگیرێ‌و ئیعتیباری پێدەكرێ(1).

**پێنجەم:** سوننەتی پێغەمبەر ﷺ كە فەرموودەكانی‌و كردەوەكانی‌و بڕیار لە سەردانەكانی (تقریرات)ی دەگرێتەوە, شەرح‌و لێكدانەوەی قورئانە: ﴿...**وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ**﴾(النحل- 44)، كەواتە: نابێ هیچ سوننەتێكی ڕاستی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ دەقەكانی قورئان‌و ڕووحی قورئاندا تێك بگیرێ, هەر كاتێكیش شتێكی وا ڕوویداو بە هۆی (تأویل)كردنەوە -ئەگەر تەئویلی هەڵدەگرت- شتەكە چارەسەربوو ئەوە باشە, دەنا ناچارین حوكمی هەڵبەستران (وضع) بەسەر ئەو بەناو سوننەتەدا بدەین, چونكە مەحاڵە لە پێغەمبەری خوا ﷺ حوكم‌و بڕیارێكی هەبێ پێچەوانەی حوكم‌و بڕیاری خوا بێ(2).

---

هەمان رایان هەیە, بڕوانە تەفسیری (ابن كثیر) ب1 ل 517 وە (فتح القدیر) ب1، ل 408, وە (انوار التنزیل) ب1، ل 266, وە (المیزان) ب 4، ل 388 .

(1) ئیمام مالیك فەرموویەتی: (كل أحد یؤخذ من قوله ویرد علیه الا صاحب هذا القبر ﷺ) بڕوانە (كشف الخفا ومزیل الالباس) ب2 ل 155.

2- كەواتە ئەوە كە زانایانی فەرموودەناس گوتوویانە فەرموودەی: **(ما أتاكم عنّي فأعرضوه على كتاب الله فان وافق كتاب الله فأنا قلته وان خالف لَمْ اقله)** رواه الطبراني عن ثوبان, فەرموودەیەكی درۆ هەڵبەستراوەی پێغەمبەر ﷺ نیە, زیان لە ڕاستیی ئەو یاسایە نادات كە گوتمان: چونكە پێغەمبەر ﷺ وای فەرمووبێ یان نا، دەبێ هەروابێ, بەڵام گرنگ ئەوەیە تەواو تەواو دڵنیا بین كە بەراستی سوننەت ( قول, فعل، تقریر)ی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ قورئاندا دژایەتی نیەو هەر كاتێكیش شتێكی وا هەستی پێ كرا پێویستە سوننەت بە جۆرێكی وا تەئویل بكرێ كە لەگەڵ قورئان دا بگونجێ، دیارە ئەمەش بە زانایانی قووڵ‌و ڕۆچوو (راسخ) نەبێ ساغ ناكرێتەوە, ئەوانەی كە شارەزاییی چاكیان لە (ناسخ‌و منسوخ), (مجمل

**شەشەم:** هەموو کەس هەر کەسە بە پێی توانای خۆی دەتوانێ بەشی خۆی لە قورئانو سوننەت حاڵی بێتو لێیان وەربگرێ، ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾(القمر- 17).

کەواتە: دەعواکردنی داخرانی دەرگای موتالاو لێ وردبوونەوەو تێگەی شتنی قورئانو سوننەت، قسەیەکە پووچو بۆشە، چونکە قورئانو سوننەت بۆ هەموو خەڵکیو هەموو چاخو سەردەمێك نێرروانو، تێگەیشتنو لێ وەرگرتنیـ شیان کالایەك نیە بەس بە بالای چەند کەسێك بڕابێو، شتێك نیە بەس لە سەر وان تاپۆ کرابێ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا نابێ لەوەش بێئاگابین، کە هەموو کەس توانای کۆششکردنو هەڵهێنجان (الاجتهاد والاستنباط)ی نیە، پێویستە بۆ وەرگرتنی یاساکانی بیروباوەڕ (احکام العقائد)و یاسا شەرعییەکان (الأحکام الفقهیة)یش پرس بە زانایانو ئەو پێشەوایانە بکەین کە ئوممەت شایەدیی زاناییو گەیشتن بە پلەوپایەی کۆششو هەڵهێنجانی بۆ داون، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (النحل- 43). دیارە هەر کاتێکیش بۆ خۆمان گەیشتینە پلەی کۆشش کردنو خەڵك شایەدیی بۆ داین، ئەو کاتە بۆمان هەیە پرس بە هیچ کام لە زانایان نەکەینو بۆ خۆمان کۆشش بکەین بەڵکو لەو کاتەدا (تقلید) هەرحەرامیشە[1].

کەواتە: هەم شاردنەوەی قورئانو سوننەت لە خەڵکیو بێبەش کردنیان لەو هەموو پیت پێزو گەوهەرو مروارییانەی، کە زۆربەی خەڵکی لێیان بەهرەمەند دەبن، بێ ئەوەی حەوجێی گەیشتن بە پلەی کۆششو هەڵهێنجان بن، بە بەهانەی

---

ومفصل)، (عام و خاص)، (مطلق و مقید)و (تعارض و ترجیح)،... هتندا هەیە. بڕوانە (ارشاد الفحول الى تحقیق الحق من علم الاصول) محمد بن علی الشوکاني، ل 29.

1- بڕوانە (جمع الجوامع) ب2، ل393-394، وە بڕوانە (ارشاد الفحول) للشوکاني، ل233 (الفصل الثاني في التقلید..).

ئەوەی، کە خەڵکی ناشایستە لافی گەیشتن بە پلەی ناوبراو لێدەدات, وە هەم خەڵك ساردکردنەوەش لە بەهرەمەندبوون لە قسەو بیروبۆچوونو بەرهەمی پێشەوایانی پێشینمان, بە بەهانەی ئەوەی، کە هەموو کەس بۆی هەیە لە قورئانو سوونەت تێ بگاو هەڵهێنجێ, هەردووکیان هەڵەن, یەکەمیان بە لای بەزایەدان (تفریط) داو، دووەمیان بەلای تێپەڕاندن (افراط)دا.

**جەوتەم:** کەواتە با ئەوپەڕی ڕێزو حورمەتمان بۆ ئەو زاناو پێشەوایانە هەبێ، کە لەمەوبەر قورئانو سوننەتیان بۆ لێکداویەتەوەو حوکمو یا سایان بۆ لێ هەڵهێنجاوینو کاریان بۆ ئاسان کردووین, وە با لە جیاتی ئەو خزمەتەیان، بۆیان بپاڕێینەوەو داوای پاداشتی بەرزیان بۆ لە خوای میهرەبان بکەین, بەڵام لە هەمان کاتیشدا، با ئاگامان لە خۆمان بێتو ڕێزگرتنمان لەو زاناو پێشەوایانەمان لە سنووری خۆی نەچێتە دەرێو، سەرنەکێشی بۆ بەبێ هەڵە (معصوم) لە قەڵەمدانیان، وە سەریش نەکێشی بۆ وشکییو لاساکردنەوەیەکی بێ وردبوونەوەو خۆ پێ هیچ نەبوونو ڕەنج نەدانو هەڵخزان.

پوختەی مەبەست: مسوڵمانە تێرو تەواوەکان، کە شوێنکەوتوانی ڕێبازی پێغەمبەرن ﷺ ئەوپەڕی حورمەتیان بۆ قورئانو سوننەت هەیەو بەرنامەو پەیڕەوی ڕاستو بێ چەندو چوونی خۆیانیانو خەڵکیشیان دەنازاننو، ڕێزو حورمەتی تەواویشیان بۆ قسەو بەرهەمی ڕەسەنو پڕ پیتو پیڕۆزی زاناو توێژەرەوانی ڕابردووش هەیەو, هەوڵ دەدەن لەبەر تیشکی قسەو لێکۆڵینەوەی پێشوانیان - وێڕای بیرکردنەوەی خۆیان- تێگەیشتنێکی ڕاستو بێ خلتە سەبارەت بە ئیسلام وەربگرن، وە هیچ کاتێك قسەی لە خۆیان گەورەتر ناکەنو ناڵێن: جا فەرقی ئێمەو پێشەوایانی کۆششکەرو هەڵهێنجەر چیە؟! وە وێڕای ئەوەی، کە مافی تێوەڕامانو بەهرە وەرگرتن لە قورئانو سوننەت بە خۆیانو هەموو کەسێکی دیکەش ڕەوا دەبینین, ئەوەش دەسەلمێنن، کە مەرج نیە، چونکە هەموو کەس مافی سەرنج دانو

بەهرە وەرگرتن لە قورئانو سوونەتی هەیە, هەموو کەسیش مافی هەواڵ دانو قسەکردنی هەبێ بە ناوی قورئانو سوونەتەوە، چونکە: خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُوْلِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ...﴾ (النساء– 83)، وەك دەبینین خوای قسە لەجێ بە ئیشارەت پێمان دەفەرموێ کە هەواڵو دەنگو باسی ئاسایی نێو خۆشمان, یەکسەر بڵاو نەکەینەوە هەتا دەیبەینە لای پێغەمبەرو ئەو زاناو برا گەورانەی کە توانای هەڵهێنجانو ئەنجامگیری (استنتاج)ی ڕاستیان هەیە. جا ئەگەر بڵاوکردنەوەی هەواڵی ئاسایی حوکمەکەی ئاوابێ! دیارە قسەکردنو هەواڵدان بە ناوی خواو پێغەمبەرەوە دووربینی پتریش دەوێ.

## خاڵی شەشەم

### هاوەڵانی پێغەمبەر -رضي الله عنهم- :

وەك پێشتر گوتمان مرۆڤی شوێنکەوتووی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی هیچ مەسەلەیەك بیروڕاو بۆچوون دەرنابڕێ، هەتا نەزانێ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ لەوبارەوە چییان فەرمووە چونکە خوا پێی فەرمووە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللهِ وَرَسُولِهِ﴾(الحجرات– 1)، وە پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((لا يؤمن احدكم حتى يكون هواه تبعا لما جئت به)) رواه الطبراني.

کەواتە: بابزانین خوای میهرەبانو پێغەمبەری بەرێزمان لەوبارەوە چیان فەرمووە:

* ﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ..﴾ (الفتح- 18)، واتە: بێگومان خوا لە بڕواداران ڕازی بوو کە لەبن درەختەکەدا پەیمانیان لە گەڵ دەبەستی.. دیارە ئەو هاوەڵە بەرێزانەش کە لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا لەژێر (شجرة الرضوان)دا پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەست، (1400) کەس بوونو زۆربەی هەرەزۆری ناودارانی ئیسلامیان تێدا بوون.

* ﴿وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ..﴾ (التوبة- 100)، واتە: وەپێشکەوتووانی یەکەم لە کۆچکەرانو پشتیوانان وە ئەوانەی بە چاکە دوایانکەتوون خوا لەوان ڕازییە، وە ئەوانیش لەوی ڕازین... ئەم ئایەتە تێکڕای هاوەڵانی پێغەمبەر -خوا لێیان ڕازی بێ- دەگرێتەوە، چونکە ئەو بەرێزانە سێ بەش بوون:

1- کۆچکەران، کە لە مەککەوە کۆچیان کرد بۆ شاری مەدینە.
2- پشتیوانان کە خەڵکی شاری مەدینە بوونو بوونە پشتیوانی پێغەمبەرو ئیسلام.
3- ئەوانەی لە دوای وان مسوڵمان بوونو بە چاکی ڕێبازی وانیان گرت، کە بە زۆری لە پاش گرتنی شاری مەککە مسوڵمان بوون.

* ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاء عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاء بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا..﴾ (محمد- 29). لەم ئایەتەشدا کە ئێمە بەشێکیمان نووسی گەورەترین مەدحی تێکڕای هاوەڵانی پێغەمبەر کراوە -خوا لێیان ڕازی بێ-، وە پێغەمبەر ﷺ فەرموودەی لەوبارەوە زۆرن، بۆ وێنە:

- **(لا تَسبُّوا أحداً من أصحابي فأن أحدكم لو أنفق مثل أحدٍ ذَهَباً ما أدرك مُدَّ أحدهم ولا نصيفه)** متفق عليه عن أبى سعيد. البخارى برقم: 3673، ومسلم برقم: 2541.
- **(الله الله في أصحابي لا تتخذوهم غرضاً بعدي, فمن أحبهم فبحبـي أحبهم, ومن أبغضهم فبغضبـي أبغضهم...)** رواه الترمذي وقال حسن .
- **(دعوا لـي أصحابي: فو الذي نفسي بيده لو انفقتم مثل أحد ذهباً ما بلغتم أعمالهم)** رواه احمد و رمز ال سيوطى ل صحته. ئه مه دەر بارەی هاوەڵان (الاصحاب) به گشتی, دەربارەی چوار جێنشینەکانیشی فەرموویەتی:
- **(فعليكم بسنتى و سنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدى عَ ضُّو علي ها بالنواجذ...)** رواه الترمذي وأبو داود. جا خوێنەری بەڕێز: دەبێ چ مسوڵمانێك هەبێ خۆی بە شوێنکەوتووی بەرنامەی خواو ڕێبازی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ بزانێ, بشزانێ کە خوا (جلّ جلاله)و پێغەمبەرەکەی ﷺ ئاوا ڕێز یان لە هاوەڵانی پێغەمبەر گرتوەو ڕەزامەندییان دەربارە دەربڕیوون، ئەویش پڕ بە دڵ ئەو زاتە بەرزانەی خۆش نەوێنو ناحەزو دوژمنانیان نەبوغزێنێ؟ بەڵام نابێ لە چەند ڕاستییەکیش بێئاگابیـن:

یەکەم: هاوەڵانی پێغەمبەر -خوا لێیان رازی بێ- هەموویان لە یەك پ لەدا نین, بەڵکو جۆراو جۆرنو بەرزییو نزمیی زۆریشیان لە نێواندا هەیە, خوای بەرزو مەزنیش بۆ خۆی فەرموویەتی: ﴿**لا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُوْلَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا وَكُلا وَعَدَ اللهُ الْحُسْنَى...**﴾ (الحديد- 10).

دووەم: ڕێزو حورمەت دانانمان بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر بە تێکڕایی, ئەوە ناگە یەنێ کە هیچ کامیان ج- جای هەموویان - لە هەڵە پارێزراو (مع صوم) بوون, چونکە جگە لە پێغەمبەر ﷺ هیچ کەس لە هەڵە پارێزراو نیە.

سێیەم: نابێ ڕێزگرتنمان بۆ ئەو زاتە بەرزانە لە سنوور بـ چێتەدەرێو لـە مافی خۆیان زیاتریان بدەینێ, یان چاو لە هەڵەو تاوانی هەندێکیان بپۆشین, بەتایبەتی ئەوانەیان، کە بە هۆی هەڵەو خراپەی وانەوە مسولّمانان پێك وەربوونو, ئیسلامیش لەسەر خەتو پەیڕەوی جێنشینایەتی ڕاست (نهج الخلافه الراشدة) ترازاو، ئوممەتی ئیسلامی دووچاری دەیان دەردو نەخۆشی وابوو، کە ئێستاش پێیانەوە دەناڵێنین.

چوارەم: ئەم قسەیە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز: (تلك دماء طهر الله منها أيدينا فلا نلوث بها ألسنتنا) دەربارەی تانەو تەشەر نەدان لە هاوەڵانی - خوا لێیان ڕازی بێ- زۆر جوانە, بەڵام هیچ ماقووڵیش نیە بەو بەهانەیەوە گوێ نەدەینە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی مێژووی ئیسلامو، هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی هاوەڵە بەڕێزەکانو لێك جوێکردنەوەی هەقو ناهەق! بەڵێ من لەگەڵ هەموو ڕێزێکمدا بۆ زانایانی پێشینمان بە هیچ ڕەنگێك قسەی: (ونُـمْسِكُ عمّا جرى بين الصحابة ونرى الكُلَّ مأجورين)م[1] بۆ هەزم ناکرێ مەگەر بۆ خەڵکی عەوامو بێئاگا!!

تێبینی:

1 ئەدەبێکی ئیسلامی بەرزە، کە لە کاتی ناوهێنانی یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەردا رضي الله عنهم بگوترێ (رضي الله عنه) یان -خوا لێی رازی بێ-, هەڵبەتە هی واشیان هەیە، کە من لەکاتی ناوهێنانیدا گوتنی (رحمه الله) یان (غفر الله له)م پێ چاکترو گونجاوترە!!

2 دەربارەی حوکمی کەسێك کە جنێو بە یەکێك لە هاوەڵان دەدات زانایان ڕایان جۆراو جۆرە: (فضيل بن عياض) فەرموویەتی: جەماوەر ڕایان وایە تەمبێ بکرێ, هەندێك لە مالیکییەکانیش دەڵێن: دەبێ بکوژرێ, بەڵام هەندێك لە

(1) بڕوانە (جمع الجوامع) ج 2، ص 422: تاج الدين عبدالوهاب ابن السبكي.

شافیعی یەکان ئەمەیان تایبەت کردوە بە کەسێکەوە کە جنێو بە (ابوبکرو عمر) یان (حسن و حسین) بلێ، -خوا لێیان رازی بێ- بەڵام جەماوەر هەر لەسەر ئەوەن کە دەبێ تەمبێ بکرێ(2).



# خاڵی حەوتەم

## ( زاناو میراتگرانی ڕەسەنی پێغەمبەر ﷺ )

بیروبۆچون و هەڵویستی مرۆڤی مسوڵمان دەربارەی زانایانیش دیسان لە بەر تیشکی قورئان و سوننەتدا دەخەینەڕوو:

(2) بڕوانە (فیض القدیر شرح الجامع الصغیر) ج 2، ص 98/ للعلامە المناوی، تێبینی: تەمبێ کردن (تعزیر) پلەو جۆری زۆرن، وەك خۆ لێ تووڕەکردن، لێدان، حەپس کردن،.. ئەمیش بە پێی ڕای حوکمڕان دیاری دەکرێ.

خوای زاناو میهرەبان لە زۆر جێیان لە قورئانێدا مەدحی زانایانی کردوە, بۆ وێنە:

* ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالّذِينَ لا يَعْلَمُونَ...﴾ (الزمر-9).
* ﴿يَرْفَعِ اللهُ الّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ..﴾(المجادلة-11).
* ﴿...إِنَّمَا يَخْشَى اللهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾(فاطر- 28).

هەروەها پێغەمبەریشمان ﷺ لەوبارەوە فەرموودەی زۆرن, بۆ وێنە:

* (**فضل العالم على العباد كفضلي على أدناكم....**) رواه الترمذي و قال حديث حسن.
* (**.. وان العلماء ورثة الانبياء وان الانبياء لم يورِّثوا ديناراً ولا درهماً وانما ورَّثوا العلم, فمن أخذه أخذ بحظ وافر**) رواه ابو داود والترمذي .
* (**من يرد الله به خيراً يفقهه في الدين**) متفق عليه.

بەڵێ هەڵوێستی مسوڵمانی تێروتەواویش دەربارەی زانایانی ڕەسەن -خوا لێیان خۆش بێ- هەمان هەڵوێستی خواو پێغەمبەرە ﷺ:

زانایان:

ا لەگەڵ خەڵکی دیکەدا -کە نازانن- یەکسان نین!

ب لەلای خوا بە چەند پلان لە بڕوادارانی ئاسایی بەرزترین.

ج هەر ئەوان وەك پێویست لە خوا دەترسێن و شەرمی لێ دەکەن.

د جیاوازی زانایانی ڕەسەن و خواپەرستانی ئاسایی وەك جیاوازی نێوان پێغەمبەرو گچکەترین هاوەڵیەتی.

ه جێگرو میراتگری پێغەمبەرانن و, گەورەترین و چاکترین بەشیان پێ بڕاوە ..

و دیارە خوا خۆشی دەوێن و خێری هێناونە ڕێ, بۆیە لە بەرنامەی خۆیدا شارەزای کردوون.

ئنجا لەبەر تیشکی ئەم دەقانەو چەندان دەقی دیکەی ئاوادا دەڵێین:

1- پێویستە زاناو پێشەوایانی ئیسلام چ بە مردوویی‌و چ بە زیندوویی ئەو پەڕی ڕێزو حورمەتیان لێ بگیرێ‌و، وەك خەڵكی ئاسایی ڕەفتاریان لەگەڵ نەكرێ، چونكە خواو پێغەمبەر ﷺ وایان تەماشا كردوون، وە دەبێ بەڕێزەوە ناویان بهێنرێ‌و داوای پلەو پاداشتی چاكیان بۆ بكرێ[1].

2- دەبێ گومانی چاك (حسن الظن)یان پێ ببردرێ‌و، بزانرێ كە هیچ قسەیەكیان لە گیرفانی خۆیان دەرنەهێناوەو هیچ شتێكیان بە گۆترە نەفەرمووە، قسەی بێ‌بەڵگەو پاڵپشتیان نەكردوە، چونكە چۆن چاك‌و ڕاستە هەروا لەوان چاوەڕوان دەكرێ، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ كە لە هەموو قسەیەكیان دا پێكاویانە.

3- دەبێ مرۆڤ خۆشی‌و خەڵكیش بنا سێ، هەر چونكە ئەویش وەك زا ناو پێشەوایان ڕیش‌و سمێلی هەن خۆی لێ نەگۆڕێ‌و، وابزانێ ئەویش وەك وا نەو بڵێ: (هم رجال‌و نحن‌رجال)، چونكە ئەم قسەیە خۆی لە خۆیدا ڕا ستە، بەڵام ئەو بۆ ناهەق بەكاری دێنێ، (كلمة حق یراد بها باطل) دەنا هەر لەنێو ڕیش‌و سمێل داراندا پیاویش هەن‌و پیاویلكەش هەن.

تێبینی:

یەكەم: هەموو ئەو ڕێزو حورمەت لێگیران‌و مەدح كرانەی كە لە قورئان‌و سوننەتدا سەبارەت بە زانایان هەیە، مەبەست پێی زانایانی ڕا ست و ساغ‌و خوایی (ربّاني)یە، دەنا هەر لە قورئان‌و سوننەتیشدا لە زۆر شوێناندا زانایانی ناڕاستی دین فرۆش سەرزەنشت كراون‌و هێرشی توندیان كراوەتە سەرێ‌و بە خراپترین شێوە وەسف كراون‌و وە نزمترین[1] ئاژەڵ چوێنراون، بۆ وێنە:

(1) ئەدەبێكی ئیسلامی بەرزو جوانە كە لەكاتی ناوهێنانی زانایانی پێشیندا ئینسان بڵێ-خوا لێی خۆش بێ-(رحمه الله).

(1) وە نزمترین ئاژەڵ چوێنران: یانی تەشبیهی نزمترین ئاژەڵ كراون، وێچواندن (تشبیه).

* ﴿مَثَلُ الّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَ سِفَارًا بِئْسَ مَثَلُ الْقَوْمِ الّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللهِ....﴾(الجمعة- 5).
* ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانسَـــلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَ كَانَ مِنَ الْغَاوِينَ ۞ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَـكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ...﴾ (الاعراف: 175-176).
* ﴿إِنَّ الّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلَ اللهُ مِنَ الْكِتَابِ وَيَ شْتَرُونَ بِهِ ثَمَ نًا قَ لِيلاً أُولَـئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلاّ النَّارَ وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ الْقِيا مَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾(البقرة- 174).

(پێغەمبەریشمان ﷺ فەرموویەتی:
* (**من تعلّم علماً مما يُبْتغى به وجه الله عزّ وجلّ لا يتعلمه الا لي صيب به عرضاً من الدنيا لم يـجد عُرْفَ الجنّة يوم القيا مة**) رواه ا بو داود با سناد صحيح.
* (**...حتى اذا لم يبق عالماً أتخذ الناس رؤسا جهالا, فسئلوا فأفتوا بغير علم, فَضَلُّوا وأضلوا**) متفق عليه .
* (**من سئل عن علم فكتمه أُلْجِم يوم القيامة بِلُجام من نار**) رواه ا بو داود والترمذي وقال حسن.

بەڵێ:

أ- هەر کەسێك لە بەرگی پێشەوایەتیدا بێ‌و ئەرکی خۆی جێبەجێ نەکات وەك کەرێك وایە کە بارە کتێبێکی هەڵگرتوە.

ب- وە هەر کەسێك لەبەر ڕابواردن‌و تەماعی دنیا، یاساکانی بەرنا مەی خوا پشت گوێ بخات، وەك سەگی ئێسك بەدەمەوە گرتوو وایە.

ج- وە هەرکەسێك بەرنامەی خوا بشارێتەوەو بە نرخێکی کەم بیفرۆشێ - کە مەبەست بەرژەوەندی دنیایە ئەوە ئاگر لەزگی خۆی دەئاخنێ‌و ... هتد.

د- وە هەرکەسێك بۆ ئەوە لە بەرنامەی خوادا شارەزابێ هەتا بەرژەوەندی ژیانی دنیای دابین بکات، بۆنی بەهەشتێ ناکات.

هـ- وە بەناو زانایانی نەزان, سەر لە خۆیان‌و خەڵکیش دە شێوێنن...و -وە هەرکەسێك زانیاری دەربارەی بەرنامەی خوا هەبێ‌و لێی سرێ‌و بیشارێتەوە, بە لغاوێکی ئاگرین لغاو دەکرێ.

دووەم: نابێ ڕێزگرتنمان لە زانایان لە سنووری خۆی بچێتەدەرێ, بەوەی کە بەبێ هەڵە (معصوم) یان قەڵەم بدەین‌و بڕیارەکانیان وەك دەقی قورئان‌و سوننەت بێ چەندو چوون وەربگرین, چونکە هیچ زانایەکی ڕاستەقینە قایل نابێ ئاوا ڕەفتار لەگەڵ قسەو بیرو بۆچوونەکانیدا بکرێ.

سێیەم: نابێ هیچ زانایەك هەر چەندە پایە بەرزو مەزن بێ, پایە بەرزییەکەی وامان لێ بکات نەتوانین قسەو بۆچوونەکانی بە تەرازووی قورئان‌و سوننەت هەڵسەنگێنین‌و, بەرهەمەکەی بە بێژنیگی تێوەڕامان ووردبوونەوەی خۆمان لە بێژینگ بدەین.... بەڵام گرنگ ئەوەیە خۆمان‌و[1] خەڵکیش بناسین‌و، بزانین کە هەڵسەنگاندن‌و لە بێژینگدانیش لە هەموو کەس ناوەشێتەوەو، جاری واش هەیە بیروزەینی ناتەواوی خۆمان شتێکمان بە هەڵە دێنێتە بەرچاو دەنا تێرو تەواوە, وە گرنگ ئەوەیە کە هێندەمان گومانی چاك‌و متمانەی عاقڵانە بە زانایانی ڕەسەن هەبێ کە ئەگەر تەواو تەواو دڵنیا نەبین لە هەڵەیی قسەیەکیان لە خۆوە نەیکەینە هەراو گاڵە.

(1) باشترین ڕێگەش بۆ خۆناسین‌و خەڵك ناسین, کە لێرەدا مەبەستم زانایانن, ئەوەیە کە مرۆڤ بەرهەمی ئەو زانایانە بە وردی موتالا بکات‌و بچێتە نێو دەریای قووڵ‌و فراوانیانەوە، جا ئەو جار تێدەگات کە ئەو چ (رجل) ڕێکەو خەڵکیش چ جۆرە (رجال)ێك بەڵام ئەوەی شارەزای بەرهەم‌و خەزێنەی دەوڵەمەندی زانا یان نەبێ، ڕەنگە زوو خۆی لێ بگۆڕێ‌و وابزانێ هیچ نەماوە نەیزانێ .



# خاڵی هەشتەم

## (مەزهەبەكان) (المذاهب):

بەر لەوەی بێینە سەر خستنەڕووی هەڵوێستی مرۆڤی موسوڵمان دەربارەی مەزهەبەكان، پێشەكی وەك ڕێ خۆشكردن چەند خاڵێك سەبارەت بە مەسەلەی كۆششكردن و هەڵێنجان (الإجتهاد والإستنباط) وە چۆنێتی پەیدابوونی شەرع (فقه)ی ئیسلامیی و مەزهەبەكان دەخەینە ڕوو:

یەکەم: خوای زاناو کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (النحل- 43)، وە فەرموویەتی: (وَإِذَا جَاءهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُوْلِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ...﴾(النساء- 83). وەك دەبینین لە دەق (نص)ی یەکەمیاندا فەرمانمان پێ دەکات کە لەکاتی نەزانیندا پرسیار لەوانە بکەین کە خاوەنی زانیاریو شارەزایین, کەواتە بابای مسوڵمان دەبێ هەوڵ بدات لە ئایینەکەیدا شارەزاو چاوساغ بێ, جا ئەگەر بۆی نەکرا ئەو شارەزاییو زانیارییە وەدەست بینێ, ئەوە نابێ بە نەزانیی هەنگاو بنێو، پێویستە پرسیار لەوانە بکات کە زاناو شارەزان, چونکە کوێرانە بەڕێدا ڕۆیشتن پیشەی ئینسانی عاقڵ نیە: (وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ...) وە لە دەقی دووەمیشدا گلەیی لە کەسانێك دەکات کە لە کاتی بیستنی هەواڵێکدا یەکسەر بڵاوی دەکەنەوە, بەر لەوەی بیگێڕنەوە بۆ لای پێغەمبەرو بۆ لای پێشەوایانیان, ئەوانەی توانای هەڵێنجانو ئەنجامگیریی یان هەیە.

کەواتە بابای مسوڵمان پێویستە بۆ بڵاوکردنەوەو بڵاونەکردنەوەی هەواڵی خۆشـــیو ناخۆشیش خۆبەسەر نەبێو پرس بە زانایان بکات!

دووەم: هەروەها خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ...﴾(النساء- 59). لەم دەقەشدا خوای دادگەر فەرمانمان پێدەکات، کە فەرمانبەریی خۆیو پێغەمبەرەکەیو پێشەوایانی خۆمان بکەین, وە هەر کاتێك لە شتێکدا کەوتینە کێشەوە، بیگێڕینەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ.

شایانی باسە، کە ئەم ئایەتە بە پێزە هەموو ئەو بەڵگە شەرعییانەی، کە بە سەرچاوەی هەڵهێنجرانی حوکمی شەرعی دادەنرێنو هەموو زانایان لە سەریان ڕێککەوتوون, گرتوونیە نێوخۆی, کە قورئان وسوننەتو ئیجماعو قیاسن، چونکە (اطيعوا الله واطيعوا الرسول) وەك پێشتر گوتمان مەبەست پێی پابەندبوونە بە

قورئانو سوننەتەوە، وە فەرمانبەریی کردنی (أولي الأمر)یش بەڵگەی ئیجماعە، مەبەست لە (فردوه الی الله والرسول)یش قیاسکردنە بۆ سەر قورئانو سوننەت.

سێیەم: جارێکی کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر -رضي الله عنهم- بە سەفەر چوون یەکیان بەردێکی وەسەری کەوت، سەری شکا، دوایی لە خەودا لەشی پیس بوو، پرسیاری لە هاوڕێیەکانی کرد، کە ئایا پێتان وایە مۆڵەتی (تەیەممومم) کردنم بۆ هەبێ، گوتیان نەخێر، مادام ئاوت وەدەست بکەوێ، ئنجا خۆی شۆردو لە ئەنجامدا مرد، کاتێك گەڕانەوە لای پێغەمبەر ﷺ و ئەو هەواڵەی پێ درا فەرمووی: (قتلوه قتلهم الله ألا سألوا اذا لم يعلموا فأنما شفاء العِيِّ السؤال ..) رواه ابو داود والدارقطني وابن ماجه وصححه ابن السكن.

هەروەها کاتێك پێغەمبەری خوا (معاذ بن جبل)ی ڕەوانەی یەمەن کرد پێی فەرموو: (كيف تقضي اذا عرض لك القضاء؟ قال أقضي بكتاب الله، قال: فان لم يكن في كتاب الله؟ قال فبسنة رسول الله، قال: فان لم يكن في سنة رسول الله؟ قال اجتهد رأي ولا آلوا، فضرب رسول الله ﷺ على صدره وقال: الحمد لله الذي وفَّق رسولَ رسولِ الله لما يُرْضي رسول الله) اخرجه احمد وابو داود والترمذي والدارمي والبيهقي وابن سعد.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا لە فەرموودەی یەکەمدا گلەیی لە کەسانێك دەکات کە فتوای هەڵەیان داوەو پرسیان بە لەخۆیان زاناتر نەکردوە، وە لە دەقی دووەمیشدا ڕەزامەندیی خۆی دەردەبڕێ لەسەر هەڵویستی (معاذ) کە پێی فەرموو: ئەگەر لە قورئانو سوننەتدا حوکمی شەرعیم دەست نەکەوت بۆ خۆم کۆشش دەکەمو کەمتەرخەمی ناکەم.

چوارەم: پاش کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺو ماڵئاوایی لە دنیاکردنی هاوەڵە بەڕێزەکانی خوا لێیان رازی بێ، بۆ چارەسەرکردنی هەر کێشەیەكو وەڵامی هەر پرسیارێكو هەر حوکمێکی شەرعی، قورئانو سوننەت تاقە سەر چاوەی فتوا وەرگرتنو یاسا هەڵهێنجانیان بون، مەگەر مەسەلەیەکی وایان بۆ هاتبا پێ شێ

کە حوکمەکەی لە قورئانو سوننەتدا نەبایە, ئەوکاتە بۆ خۆیان لە بەر تیـ شکی قورئانو سوننەتدا دەستیان دەکرد بە وردبوونەوەو تێڕا مانو کۆ شش کردنو هەڵهێنجان، هەڵبەتە گەلێك جاریش دەربارەی قورئانو سوننەتەکانی پێغەمبەر پرسیاریان لە یەکتر دەکرد, بۆ ئەو ڕووداوو مەسەلانەی کە دەهاتنە پێشیان.

(ابن جرير) گوتوویەتی: (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر)و کۆمەڵێك لەو هاوەڵانەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە دوای وی لە مەدینەدا دەژیان, بە گوێرەی مەزەبی (زيد بن ثابت) فتوایان دەدا, وە بە گوێرەی ئەو فەرموودانەی کە لەویان وەرگرتبوونو نەیانتوانیبوو لە پێغەمبەری خواوە وەریان بگرنو لەبەریان بکەن.

(مسروق) لەوبارەوە فەرموویەتی: من گەورە گەورانی هاوەڵانی پێغەمبەرم دەدیتن کە لە بابەت میراتەوە پرسیاریان لە (عائشە) دەکرد, وە جاری وا بوو مەسەلەیەك بۆ ئەبووبەکری صددیق دەهاتە پێشێ خوا لێی ڕازی بێ, ئەویش بە پێی شارەزایی لە قورئانو سوننەتدا بڕیاری تێدا دەدا, ئەگەر هیچی دەست نەکەوتبا لەو هاوەڵانەی دەپرسی کە لەلای بان, جا ئەگەر زانیاری یەکی[1] لەوبارەوە دەستکەوتبا وەری دەگرت دەنا بە بۆ چوونی خۆی هەوڵی دەدا وەلامێکی بۆ بدۆزێتەوە، وە چوار خەلیفە بەڕێزەکان - خوا لێیان ڕازی بێ- زۆرجاران بۆ زۆر مەسەلان کە سەریان لێ دەرنەچووبا, هاوەڵانیان خڕدەکردەوەو کۆڕێکی ڕاوێژیان بۆ چارەسەری ئەو مەسەلانەو حوکمی شەرعییان پێك دێناو, لەبەر تیشکی ئەو وتووێژو دانیشتنەدا ئەو مەسەلانەیان چارەدەکرد، وە ئەو هاوەڵانەی کە فتوایان لێ وەرگیراوە لە (130) کەس پتر بوون لە پیاوو ژن، بەڵام ئەوانەیان کە فتوایان زۆر بووە ئەم حەوتەن: (عمر بن الخطاب, علي بن

(1) مەبەست لە زانیاری (علم) لێرەدا سوننەتە, دەنا ئەگەر هەڵهێنجانی قورئانێ با بۆخۆی شارەزا بوو، بەڵام سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ بە نێو هاوەڵاندا بلاوبوونەوەو هیچ کامیان هەموویانی نەدەزانی.

أبي طالب, عبدالله بن مسعود, عائشة, زيد بن ثابت, عبدالله بن عباس, وعبدالله بن الزبير)(2) رضي الله عنهم.

پێنجەم: ئنجا پاش ئازادکردنی ئیسلام بۆ گەل وولاتان (الفتوحات الاسلامية) هاوەڵانی پێغەمبەر -خوا لێیان ڕازی بێ- بە شارەکاندا بڵاوبوونەوە بۆ ئەوەی ڕێڕوونی خەڵکی نوێ مسوڵمان بکەنو ئیسلامیان تێبگەیەنن, وە شەش شار لەو شوێنانەی کە ئەو بەڕێزانە پێیدا بڵاوبوونەوە, بوونە مەڵبەندی هاوەڵە زاناکانی پێغەمبەر کە بریتی بوون لەمانە: (مەدینە,مەککە,کووفە, بەسرە,شام, میصر).

جا هەر کام لەم شەش مەڵبەندانە ژمارەیەك لە هاوەڵە زاناکانی تێدا نیشتەجێ بوونو, ئەو بەڕێزانەش هەر کامێک یان ژمارەیەك لە (تابعين) زانیارییان لێ وەرگرتن, هەروا بەم پێیە هەتا سەدەی دووەمو سێیەمی کۆچی کە مەزەبەکانی تێدا دروست بوون, لە شاری مەدینەدا ئەم بەڕێزانە: (عمر, علي, عبدالله ابن مسعود, زيد بن ثابت, عبدالله بن عباس, عبدالله بن عمر)، وە غەیری وانیش زۆری دیکە هەبوون, بەڵام (عبدالله بن عمر)و (زيد بن ثابت) لە هەموویان پتر قوتابییان هەبوون.

لە شاری مەککەشدا (معاذ بن جبل)و (عبدالله بن عباس)  لە کۆتایی تەمەنیدا  نیشتەجێ بوون.

لە شاری کووفەشدا کۆمەڵێك لەو بەڕێزانە نیشتەجێ بوون, کە ناودارترینیان: (علی بن ابي طالب و عبدالله بن مسعود) بون.

شاری بەسرەش (ابو موسى الاشعرى وانس بن مالك)ی تێدا نیشتەجێ بووبوون, شامیش عومەری کوڕی خەتتاب (معاذ وعبادة بن الصامت وابو الدرداء)ی بۆ ڕەوان کرد تا خەڵکەکەی تێبگەیەنن, میسریش زۆر لە هاوەڵان

(2) بڕوانە (اعلام الموقعين عن رب العالمين) ابن قيم الجوزية.

کۆچیان بۆ کردبوو بەڵام ئەوەی کە لەوێدا بە فتوا ناوی دەرکردبوو (عبدالله بن عمرو بن العاص) بوو خوا لە هەموویان رازی بێ.

شەشەم: ئنجا لە هەر کام لەم بەڕێزانەوە ژمارەیەك لە شوێنکەوتووان (تابعين) فێری قورئانو سوننەتو کۆششکردنو هەڵهێنجانی حوکمو فتوا بوون، وەك: (سعيد بن المسيب، عروة بن الزبير، قاسم بن محمد، خارجة بن زيد، سليمان بن يسار، عبدالله بن عبدالله بن عتبة بن مسعود) لە مەدینە، وە (عطاء بن رباح، طاوس بن كيسان) لە مەککە، وە (علقمة بن قيس النخعي، شريح بن الحارث القاضي، عبدالله بن عتبة بن مسعود، أسود بن يزيد، عمرو بن شرحبيل، مسروق بن الأجدع، عبدالرحمن بن ابي ليلى) لە کووفە، وە (الحسن البصري، محمد ابن سيرين، مسلم بن يسار، شريح) لە بەسرە، وە (ابو ادريس الخولاني، شرحبيل ابن السمط، قبيصة بن ذويب الخزاعى) لە شام، وە (يزيد بن حبيب، عبدالله ابن ابي جعفر) لە میسر.

ئنجا ئەو پێشەوا موجتەهیدانە پێگەیشتن کە هەر کامێکیان خاوەنی مەزهەبێکی دیار بوو، کە ناودارترینیان ئەمانەن (سفيان الثورى، حسن البصري، ابن أبي ليلى، أوزاعي، ليث بن سعيد، أبو جعفر الطبري، ابو حنيفة، مالك، جعفر الصادق، شافعي، احمد، داود الظاهري) خوا لە هەموو لایەکیان خۆش بێو پاداشتی بەرزو مەزنیان بداتەوەو ماڵیان ئاوابێ[1]، وە شایانی باسە کە لەو[2] مەزهەبانە بەس مەزهەبەکانی (ابو حنيفة ومالك وشافعي واحمد) ماونەوەو

---

(1) بۆ نووسینی خاڵی چوارەمو پێنجەمو شەشەم پشتم بە کتێبی (الأئمة المجتهدون) بەستوە، نووسراوی: احمد عزالدين البيانوني، لاپەرە (10-24).

(2) شایانی باسە کە مەزهەبی (داود الظاهري) کە ابن حزم دەمڕاستیەتی وەك چوار مەزهەبەکان ماوەیەك لە ئارادابوو، بەڵام پاشان ئەویش لەبەر چەند هۆیەك کە گرنگترینیان تەسکییو (حرفي) بوونی بوو نەما.

ئەوانی دیکە لەبەر چەند هۆیەك کە گرنگترین یان نەبوونی قوتابی یانی مشوورخۆر بوو برانەوەو، چوارمەزەبەکان[1] جێی وانیشیان گرتەوە.

جا خوێنەری بەرێز!

بۆیە ئەم شەش خاڵانەم خستنەڕوو هەتا زۆر چاك چۆنێتی دەستپێکردنی کۆشش کردنو هەڵهێنجانـمان لەبەرچاو بێو مێژووو چۆنێتی مەزەبەکانیش ڕوون بێتەوە.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە کە هەڵوێستو بیروبۆچونی خۆمان دەربارەی مەسەلەی ئیجتیهادو مەزەبەکان بخەینە ڕوو، بەڵام پێشەکی ڕاو بیروبۆچوونی زاناو پێشەوایانمان لەوبارەوە دەخەینەڕوو، ئەوجار لە چەند خاڵێکی کورتدا هەڵوێستی خۆشمان دەخەینەڕوو.

یەکەم: مەسەلەی کۆششکردنو هەڵهێنجان (الاجتهاد والإستنباط) لەبارەی کۆششکردنو هەڵهینجانەوە لەنێو زانایانی ڕابردووو ئێستاشدا ڕاجیاییو مشتومڕێکی زۆر، لە زۆر ڕووەوە هەیە، بەڵام ئەوەی کە پەیوەندی بە مەبەستی ئێمەوە هەیە لێرەدا بەس مەسەلەی داخران یان دانەخرانی دەرگای کۆششکردنو هەڵهێنجانە. بەشێك لە زانایان پێیان وایە کە لە دوای سەدەی چوارەمی کۆچییەوە دەرگای ناوبراو داخراوەو هیچ کەسێك پێی ناکرێتەوە[2]،

(1) ئەو چوار مەزەبە تایبەتن بە جەماوەری موسڵمانانەوە کە بە (أهل السنة والجماعة) ناسراون، دەنا شیعەکانیش مەزەبی جۆراوجۆریان هەبوون بەڵام ئێستا دووانیان ماون، یەکەم کەهی زۆربەیانە مەزەبی جەعفەری دوازدە ئیمامی‌یە کە پێشەوایەکەی ئیمام جەعفەری صادقە، دووەم مەزەبی زەیدی یە، کە پێشەوایەکەی زەیدی کوڕی عەلی (زین العابدین) کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی یە، وە مەزەبی (الأباضية)ش کە هی (خوارج)ە ماوە.

2) بۆ وێنە بڕوانە فتوای شێخ محمد الحامد کە لەوبارەوە گووتویەتی (والذي علينا علمه و العمل به، هو ما قرره فقهاؤنا رحمهم الله من ان الاجتهاد المطلق في الاحكام ممنوع بعد ان مضت اربعمائة سنة من هجرة سيدنا مولانا محمد رسول الله... لئلا يدعي الاجتهاد من ليس من اهله...من اجل ذلك رأى العلماء الاتقياء اقفال هذا الباب...) الأئمة المجتهدون، ل 92، 93 .

بەڵام بەشێکی دیکەیان کە ئەمانیش زۆربە (اکثرية)ن و کەڵە زانای زۆر بە ـێڕەزاو ڕۆچووشیان تێدا هەن[1]، دەڵێن: داخرانی دەرگای گۆڕین، ج ـگە ـلە ئەفـ ـسانە چیدی نیەو قسەیەکە (ما أنزل الله به من سلطان)، چونکە ئەو دەرگایە ـخواو پێغەمبەر ﷺ لە خەڵکیان کردۆتەوەو, هیچ کە ـسێکیش ـبۆی ن ـیە ـلەخۆوە بڕیاری وان هەڵبوەشێنێتەوە، وە هەڵبەتە ئەوا ـنەش ـکە دە ـعوای گا ـڵەدرانی دەرگای ناوبراو دەکەن، نە لە قورئان و سوننەت و نە لە ئیجماع و نە لە قیا ـسدا بەڵگەیان بەدەستەوە نیە بۆ ئیسپاتی دەعواکەیان[2].

دووەم: مەسەلەی چوار مەزهەبەکان (المذاهب الاربعة): د ـیارە هەڵوێ ـستی زانا ـیان دەربارەی چوار مەزهەبەکانیش، هەر بەرهەمو ـئەنجامی هەڵوێ ـستو بۆ چونیانە دەربارەی مەسەلەی پێشوو, ئەوانەی کە بڕوایان بە داخرانی دەر ـگای کۆ ـششو هەڵهێنجان هەیە لە دوای سەدەی چوارەمەوە، دەڵێن لە ـسەر هەرمـ ـسوڵمانێك فەرزە لاساکەرەوە (مقلد)ی یەکێك لەو چوار[3] مەزهەبانە بێت, ـبەڵام ـئەوانی دیکە دەڵێن ئەوە مەرج نیە, تەنانەت هەندێکیان هەن دە ـڵێن: ئە ـگەر ـکابرا نەشگەیبێتە پلەی کۆششکردن، هەر نابێ تەقلید بکات, بەڵکو یان دە ـبێ ـبۆ خۆی لێبکۆڵێتەوە ئەگەر توا ـنای ـهەبێ, ـیان ئە ـگەر توا ـنای توێژیـ ـنەوەو بەدواداگەڕانی نەبێ[4], پرس بە زانایانی سەردەمی ـخۆی بـ ـکات. ئە ـمە ـبە کورتی بیروڕای زانایانە دەربارەی ئیجتیهادو تەقلید.

---

1) بڕوانە (ارشاد الفحول ...) للشوكاني, ل 224, وە بڕوانە (تحـ ـفه الـحـ ـتاج) ب10, ل 109, ا ـبن حـ ـجر الهيتمي .

2) (أسنوي) لەشەرحی (منهاج الاصول)ی بیضاوی دا گووتیەتی: (و دعوى انقضاء أهله لا دليل عليها ـمن الكتاب ولا السنة ولا الاجماع ولا القياس فهي باطلة) بڕوانە (أشنائی با ـتحولات ـمذاهب در ا ـسلام) ب 109 , محمد سعيد ابراهيمي.

3) بڕوانە (تحفة الفحول) ب 10 ل 109 .

4) بڕوانە (ارشاد الفحول ..) للشوكاني ب 236، هەروەها سەرنجی (الوجيز)ی (عبدالكريم زيدان) بدە.

ئێمەش لەبەر تیشکی قورئانو سوننەتداو، لەبەر تیشکی قسەی ئەو زانا بەڕێزانەدا هەڵوێستی خۆمان سەبارەت بە مەسەلەی ئیجتیهادو شوێنکەوتنی چوار مەزەبەکان لەم چەند خاڵەدا دەخەینە ڕوو:

1- مادام هیچ حوکمێکی شەرعی بەبێ بەڵگە (دلیل) ئیسپات ناکرێو هیچ دەعوایەك بەبێ شایەد وەرناگیرێ، مەسەلەی کۆتایی پێهاتنی ئیجتیهادیش[2] هیچ بەڵگەیەکی متمانە پێکراوی لەسەر نیە، کەواتە ناتوانین بڵێین: دەرگای ئیجتیهاد داخراوە.

2- ئەوەندەی کتێبی زانایانم موتالا کردوون (لە بواری:" اصول الفقه "دا بەس سێ قسەم هاتوونە بەر چاوان کە لایەنگرانی داخرانی دەرگای ئیجتیهاد لەوبارەوە کردبیانن:

أ- دەعوای ئیجماع کران لەسەر داخستنی دەرگای گۆڕین!

ب- دەڵێن مەرجە دەبێ موجتەهیدی موتڵەق وەك چۆن پێشەوا سەرمەزەبەکان بنچینەکانی مەزەبەکانیان داڕشتوون، ئەویش یا ساو بنچینەی دیکەی سەربەخۆ دابڕێژێ، دەنا بە موجتەهیدی موتڵەق دانانرێ.

ج- دەڵێن مەرجە دەبێ بابای موجتەهید بتوانێ لە هەموو مەسەلەیەکدا فتوا بدات! بەڵام ئێمە پێمان وایە هیچ کام لەم سێ قسانە ناکرێنە بەڵگەی ڕاستی دەعوای داخرانی دەرگای ناوبراو، چونکە:

یەك: چۆن دەگونجێ دەعوای ئیجماع بکرێ لە حاڵەتێکدا چەندان کەسی وەك (قفال وقاضي حسين وسيوطي وابن عبدالسلام وابن دقيق العيد و شوكاني وآمدي وغزالي وآسنوي، .... هتد) بڕوایان بە داخرانی دەرگای گۆڕین

(2) مەبەست لە (اجتهاد) لێرەدا ئیجتیهادی موتڵەقە، چونکە ئیجتیهاد لە چوار چێوەی مەزەبێکی دیاریکراوو ئیجتیهاد لە چەند مەسەلەیەکی تایبەتیدا بە ڕای هەموو زانایان هەر بەردەوامن.

نەبووەو, هەندێکیان[1] خۆ شیان بە موجتەهیدی موتلەقو سەربەخۆ (مستقل)یش زانیوە؟!

دوو: ناتوانین بڵێین چوار پێشەوا سەرمەزهەبەکان بنچینەکانی کۆ شش‌و هەڵهێنجانیان دارشتوون, چونکە وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە، پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانیشی‌و شوێنکەوتووان (التابعين)یش لە پێش سەرمەزهەبەکاندا هەر لەسەر هەمان ڕچە ڕۆیشتوون‌و, ئەو بنچینانەیان هەر بەکارهێناون! ئایا ئەوانیش ﷺ بە تایبەتی لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ هەر لەبەر تیشکی قورئان‌و سوننەت‌و ئیجماع‌و قیاس‌و باقی سەرچاوەکانی یاسادانان (مصادر التشريع) وەك (استصحاب وعرف والمصالح المرسله وشرع من قبلنا و....هتد)دا فتوایان نەداوە؟ هەڵبەتە ناونەهێنرانی ئەم بەڵگە شەرعییانە (الأدلة الشرعية)ش ناکرێتە بەڵگەی کارپێنەکران‌و بەرچاونەکرانیان لەپێش پێشەوا سەرمەزهەبەکاندا, بەتایبەتی لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا(خوا لێی ڕازی بێ).

سێ: مەرج نیە موجتەهید وەڵامی هەموو پرسیارێك بزانێ‌و بتوانێ لە هەموو بارێکەوە فتوا بدات, ئەوەتا ئیمام مالیك کە یەکێك بووە لە چوار پێشەوا سەرمەزهەبەکان, چل (40) پرسیاری لێکراوە بەس وەڵامی چواریانی داوەتەوەو, لە وەڵامی (36)یاندا گوتویەتی نازانم (لا أدري)[2]، ئنجا نەك

---

(1) لەوانە (سيوطي وشوكاني) وە (ابن حجر)یش لە (تحفة المحتاج) ج10، ص109 دەربارەی (قفال وقاضي حسين) گوتوویەتی (وكيف يمكن القضاء على الأعصار بخلوها عنه (يقصد المجتهد) والقفال نفسه كان يقول لسائله في مسائل الصبرة: تسألني عن مذهب الشافعي أم عما عندي؟ وقال هو وآخرون منهم تلميذه القاضي حسين: لسنا مقلدين للشافعي بل وافق رأينا رأيه ....).

2) بڕوانە (المستصفى من علم الاصول) للامام ابي حامد الغزالى ب 2، ل 254.

هەر ئەو بەڵکو غەزالی گوتوویەتی: چەندان جار شافیعی بە گرە هاوەڵان (اصحاب)یش لە ئاقار زۆر مەسەلاندا داماون و بێ وەڵام بوون[1].

ئنجا رای پەسندو بەهێز (الرای الراجح) لەلای تێکرای زانایان ئەوەیە کە دروستە (اجتهاد) بەش بکرێ, واتە دەگونجێ بابای موجتەهید لە هەندێك مەسەلەی تایبەتیدا بگاتە پلەی ئیجتیهادو ئیجتیهاد بکات, بێئەوەی لە هەموو مەسەلەکانی شەرعدا گەیبێتە پلەی ناوبراو[2].

3- هیچ شتێکی ماقووڵ نیە ئینسان نەبۆ خۆی بەرێیە بزانێ نە بەدوای شارەزایەك بکەوێو هەروا گۆترەکارییو کوێرانە ملی رێیە بگرێ.

کەواتە مەسەلەی شوێنکەوتن (تقلید)ی یەکێك لەو مەزەبانەی کە لەنێو زانایاندا جێی ئیعتیبارن شتێکی پێویستە بۆ هەر کەسێك کە نەگەیبێتە پلەی کۆششکردنو هەڵهێنجان، بەڵام چەند ئاگادارییەکی گرنگیشمان لەوبارەوە هەن:

یەك/ چوار مەزەبەکانو غەیری وانیش بەس شەرحو لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی قورئانو سوننەتن, کەواتە شەریعەتی ئیسلامی لە جوغزی چوار مەزەبەکانو غەیری وانیشدا کورت هەڵنەهاتوە, بەڵکو هەرکام لە چوار مەزەبەکانو غەیری وانیش جۆرێکە لە جۆرەکانی لێکدانەوەو شەرحی قورئانو سوننەت.

دوو/ کەواتە شتێکی هەڵەو لەگەڵ عەقڵو شەرعدا نەگونجاوە کە خۆشویستنو عاتیفەو دەمارگیریی مەزەبیی وامان لێبکات, ئیسلامی وا فراوانو پانو

---

1) بڕوانە (المستصفى من علم الاصول) للامام ابي حامد الغزالى ب 2 ل 254 .

2) بڕوانە (جمع الجوامع) هب 2 ل 286، کە گوتوویەتی: (والصحیح تجزئو الأجتهاد) هەروەها سەرنجی (ارشاد الفحول ..) بدە ل 224. (غزالى)یش گوتوویەتی: (ولیس الاجتهاد عندی منصبا لا یتجزأ بل یجوز أنْ یقال للعالم بمنصب الإجتهاد في بعض الاحکام دون بعض) ب 2، ل 303، هەروەها خاوەنی (الوجیز فی اصول الفقه) وە خاوەنی (فواتح الرحموت) ج 2 ص 264, هەمان ڕایان هەیەو هەر ئەوەش ڕاستو لە گەڵ عەقڵو نەقڵدا گونجاوە.

پۆر لە جوغزی هەر چوار مەزەبەکانیشدا ببینین چ جای یەکێکیان، مادام وابێ, با ئاگاداربین و بەناوی (تەقلید)ەوە ئیسلام لە خەڵکی گ چکە نەکەینەوەو ڕەحمەتی فراوانی خوایان لێ تەسك نەکەینەوەو, نە هەر چوار مەزەبەکان و نە هیچ کامێکیان لە خەڵکی نەکەینە (ئاین)و (ئیسلام)ێکی تایبەتی!

سێ/ أ- هەرچەندە زانایان ئاوا پێناسەی (تقلید) دەکەن: (اخذ القول بدون معرفة دليله)، بەڵام سەرجەم زانایان دەڵێن واچاکە با بای (مقلّد) هەوڵی زانینی بەڵگەی ڕاستی فەتوا (فتوا)یەکەی بدات, بەڵکو هەندێکیان پەی بردن بە بەڵگەی ڕاستی (ئیجتیهاد) بە مەرجی تەقلید دەزانن[1].

ب- مەرج نیە مرۆڤ یان موجتەهیدبێ یان لاساکەرەوە(مقلّد)، بەڵکو لەنێوان موجتەهیدو موقەللیددا پلەیەکی دیکە هەیە, ئەویش هی بابایە کە کە نەگەیوەتە پلەی ئیجتیهاد, بەڵام بە وەدواکەوتنی بێئاگایانەش قایل نیە، بەڵکو وێرای پابەندبوونی بە یەکێك لە مەزەبەکانەوە, بەردەوام هەوڵیش دەدات بە پێی توانا لێ بکۆڵێتەوەو لە هەر مەسەلەیەکدا بەڵگەی کام پێشەوا، یان چ قسەو ڕایەکی پێ پتەوتر بێت هەڵیدەبژێرێ ئەمەش نە (تلفیق)ەو نە بەدوای ئاساندا گەڕان (تتبع الرخص)یشە کە زۆر لە زانایان قەدەغەیان کردوون, بەڵکو بە دوای ڕاستترو چاکتردا گەڕانە[2]، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ...﴾ (الزمر-18).

چوار/ هەرچەندە پێشەوا سەرمەزەبەکان خوا پلەیان بەرزتر بکاتەوە, هیچ درێغییان نەکردوە لە دۆزینەوەی هەق و ڕای ڕاست لە هەر مەسەلەیەکدا کە

1) خاوەنی (جمع الجوامع) دەربارەی تەقلید گوتوویەتی: (.. ويلزم غير المجتهد وقيل بشرط تبين صحة اجتهاده وقيل لا يقلد العالم وان لم يكن مجتهداً ب 2 ل 393 , هەروەها گوتوویەتی (وللعامي سؤاله عن مأخذه استرشاداً ثم عليه بيانه ان لم يكن خفياً) ب 2، ل 397.

2) بڕوانە (جمع الجوامع) ب2، ل400-401, هەروەها سەرنجی (الوجيز) بدە , ل 314.

فەرموویانە, بەڵام ئەگەر هاتو دوای لێکۆڵینەوەی وردو قووڵ، بە بەڵگەی شەرعی پتەو دڵنیاو مسۆگەر بووین کە فلان پێشەوا بە فلان ئایەتو فەرموودە، یان فلان بەڵگە بەهەڵەدا چووە, یان قسەکەی بێهێزەو لەهی وی چاکترو بەهێزترمان دەستکەوت، پێویستە بێ سێو دوو بە چینە سەر ئەو ڕایەی کە بە هەقو ڕاست یان بە ڕاستتری دەزانین[1]، ئەمەش لادان نیە لە قسەی پێشەوایانمان, چونکە (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق), بەڵکو ئەو ڕەفتارەمان جێبەجێ کردنی فەرمانی ئەو پێشەوا بەرێزانەیە کە گوتوویانە: (اذا صَحَّ الحديث فهو مذهبي)[2]!! وە لە پێش وانیشدا خوا ( عزّو جلّ) لەسەری پێویست کردووین کە بەدوای ڕا ستترو چاکتر بکەوین، وەك فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ...﴾(الزمر-18)، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئاگاداری دووشتان بین:

أ- بەناوی هەق دۆزینەوەو لێکوڵینەوەوە لە ئاقار پێشەوایانماندا تووشی بەدبینیو بێئەدەبیی نەبینو، خەڵکیش نەخەینە گێژی دوودڵییو گومانەوە لەبارەی پێشەوایانمانو مەزەبەکانیانەوە.

ب- وەك چەند جاری دیکەش گوتوومانە خۆمانو خەڵکیش بناسینو قسەی لە خۆمان گەورەتر نەکەینو, لانی کەم موتالایەکی بەرهەمی زانایانمان بکەینو سەرەدەرییەك لە قورئان وسوننەتو (اصوا الفقه)دا بکەین, بەرلەوەی هیچ بیروڕایەکی تایبەتی دەرببڕین!

1) خاوەنی (العبادة في الاسلام)یش هەمان ڕای هەیە, کە (د. يوسف القرضاوي)یە.
2) بڕوانە وتارەکەی (شيخ محمد الحامد) لە کتێبی (الأئمة المجتهدون)دا، ل 92.

## چەند پێناسەیەکی گرنگ[1]

1- القرآن: قورئان ئەو کتێبەیە کە لەلایەن خواوە بۆ (محمد) پێغەمبەری خوا ﷺ نێرراوەو لە (مصحف)اندا نووسراوەتەوە بە شێوەی تەواتور بە ئێمە گەیشتوە.

2- السنة: سوننەت ئەو قسەو کردەوەو دانپێداهێنان (تقرير)انەن کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە ئێمە گەیشتوون.

3- الفقـه: (فقه) لە زاراوەی شەرعدا یانی زانیاری هەبوون بەو یاسا شەرعییە کردەیی یانە کە لە ئەنجامی کۆششکردندا پەیدابوون.

جیاوازی نێوان (شەریعەت)و (شەرع)یش لە دوو شتاندا کورت دەکرێتەوە:

أ- شەریعەت بە دەقەکانی قورئانو سوننەت دەگوترێ کە لە ڕێی وەحی یەوە بە ئێمە گەیشتوە، بەڵام شەرع بە قسەو فەتوای زانایان دەگوترێ کە لە ڕێی کۆشش کردنەوە پەیدابووە، هەرچەندە لە کتێبە شەرعییەکاندا جگە لە شەرع شەریعەتیش خراوەتەڕوو، چونکی شەرع بۆ خۆی شەرحی شەریعەتە!

ب- شەرع تایبەتە بە یاسا کردەوەیی یەکانی (الاحكام العملية)ەوە، بەڵام شەریعەت سەرلەبەری یاساکانی ئیسلام دەگرێتەوە.

4- الإجماع: ئیجماع بریتیە لە یەکدەنگ (متفق) بوونی کۆشش کەرانی ئوممەتی ئیسلامی پاش مردنی پێغەمبەر (محمد) ﷺ لە چاخێکدا لەسەر هەر کارێك.

5- القياس: قیاس بریتییە لە یەکسانکردنی مەسەلەیەك کە دەق لە سەر حوکمەکەی نیە لەگەڵ مەسەلەیەکدا کە دەقی لەسەرە لەبەر بەشداربوونی لە عیللەتی حوکمی مەسەلە دەق لەسەر بووەکەدا.

---

1) بۆ نووسینی ئەم پێناسانە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتوە: 1- (الوجيز في اصول الفقه) عبدالكريم زيدان. 2- (المستصفى من علم الاصول) الإمام الغزالي. 3- (تحفة المحتاج) ج1، ل 20 ابن حجر الهيتمي. 4- (جمع الجوامع) تاج الدين ابن السبكى. 5- (ارشاد الفحول) للشوكاني. 6- (فواتـح الرحموت بشرح مسلم الثبوت) عبدالعلي نظام الدين الانصاري.

6- الإجتهاد: بریتیە لە بەکارهێنانی ئەوپەڕی توانا لەلایەن موجتەهیدەوە بۆ وەدەستهێنانی زانیاری دەربارەی ئەو یاسا شەرعییانەی کە دەقیان لەسەر نییە لە ڕێگەی هەڵهێنجانەوە، کەواتە: موجتەهیدیش بابایەکە کە مەرجەکانی کۆشش کردن و هەڵهێنجانی تێدا هاتبنە دی.

7- التقلید: تەقلید بریتیە لە وەرگرتنی قسەی موجتەهید بەبێ زانینی بەڵگەی قسەکەی, وە لەسەر غەیری موجتەهید پێویستە, هەندێکیش دەڵێن بەڵکو شارەزایی هەبوون بەڕاستیی بەڵگەکەی مەرجە, وە هەندێك گوتوویانە با بای زانا ئەگەر موجتەهیدیش نەبێ نابێ تەقلید بکات.



# خـاڵی نۆیـــەم

## (تەزکیـەی نەفـس و ڕێبـازەکانی تەصـەووف)

بەڕێزان:

هەوڵ دەدەم لە سێ بڕگاندا هەڵوێستی خۆمان لە مەڕ تەزکیەی نەفس و ڕێبازەکانی تەصەووف بخەمەڕوو:

### یەکـەم: پێناسـەی تەزکیـەی نەفس:

پێش ئەوەی زاراوی تەصەووف (التصوف) بکەوێتە گۆڕێ، زانایانی ئیسلامی ئەوانەی کە دەربارەی لایەنی مەعنەویی و ئەخلاق و سلووك قسەیان کردوە زیاتر وشەی تەزکیە (التزکیة)، وە جاری واش هەیە وشەی (إحسان)یان بەکارهێناوە، بۆیە بە پێویستی دەزانم بۆ پێناسەی (تەزکیەی نەفس) سەرنجی چەمك و واتای هەر کام لە وشەی (تزکیة) و(إحسان) بدەین لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا:

## 1- وشـەی (تزكیـة):

لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا لە (زكى، يزكو، زكاةً, وتَزْكِيةً) هاتووە, (زكى) بە واتای (نما) دێت, واتە: گەشەی كرد, وە بە واتای (طَهُرَ)ش دێت, واتە: پاك بۆوە, وە بە واتای (صَلَحَ)ش دێت, واتە: چاك بوو. كەواتە: وشەی (تزكية) هەم مانای گەشەكردنو زیادكردن دەگەیەنێو هەم مانای پاكبوونەوەو هەم مانای چاكبوون, واتە: وشەی (تزكية) هەرسێك وشەی (النموّ والطّهارة والصّلاح) دەگرێتە نێو خۆی.
وە لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ وشەی (إحسان) بەكارهاتوە, بۆ پێناسەی لایەنی تەزكیە ئەخلاقو سلووك, وەك لە فەرموودەكەی ناسراو بە فەرموودەی (جبريل)دا دەردەكەوێ, كە (جبريل) پرسیاری ئیسلامو ئیمان, لە پێغەمبەر ﷺ دەكات, پاشان بۆ جاری سێیەم دەربارەی (إحسان) پرسیاری لێدەكاتو دەڵێ: ( ما الإحسان؟) (إحسان) چی یە؟

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (الاحسان أن تَعْبُدَ الله كأنك تراه, فأن لم تكن تراه فأنه يراك)[1]، واتە: ئیحسان ئەوەیە كە بە جۆرێك خوا بپەرستیو بەندایەتی بۆ بكەی, وەك ئەوە كە لەبەرچاوت بێو ببینی, یاخود پێت وابێ كە ئەو تۆ دەبینێ، ئەگەر سەرنج بدەینە پێناسەكردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ (إحسان), دەبینین هیچ زیادەی لە ئیسلامو ئیمان باس نەكردوە, لە ئیسلامدا پێنج پایەكانی باس كردوون, واتە: شایەتمانو پێنج فەرزەی نوێژو زەكات دانو ڕۆژوو گرتنو حەج كردن, كە هەموویان ئاشكرانو ڕواڵەتنو لەبەرچاون. لە پێناسەكردنی ئیمانیشدا شەش پایەكانی ئیمانی باس كردوون, واتە: ئیمان بە خواو بە فریشتەكانو كتێبەكانو پێغەمبەرانو ڕۆژی دواییو قەزاو قەدەر, بەڵام لە باسی ئیحساندا, پێغەمبەر ﷺ شتێكی نوێی باس نەكردوە, بەڵكو هەر فەرمویەتی: ئیحسان ئەوەیە كە

(1) رواه مسلم عن عمر بن الخطاب -رضي الله عنه-, برقم: 1 8, والبخاري عن أبي هريرة -رضي الله عنه- برقم: 50 بلفظ قريب منه .

بەندایەتی بۆ خوا بکەی و بیپەرستی بەشێوەیەك کە پێت وابێ دەیبینی، یان ئەو تۆ دەبینێ، کەواتە: ئیحسان بریتیە لە چاك ئیسلام بەڕێوەبردن و چاك ئیمان هێنان، ئنجا وەك گوتراویشە: ئیسلامەتی ئاشکرایەو ئیمان پەنهانە (الإسلام علانیە، والإیمان سر)، چونکە ئیسلام پابەندییەکی ڕواڵەتی و ئاشکرایە بە ئەندامەکان ئەنجام دەدرێ، بەڵام ئیمان زیاتر شتێکی دەروونی (باطنی) یە، هەر چەندە شوێنەوارەکانیشی لە میانەی کردەوەو هەڵوێستدا دەردەکەون. کەواتە: ئیحسان ئەوەیە کە تۆ ئیمانەکەت ئیمانێکی زۆر باش بێ و ئیسلامەتییەکە شت ئیسلامەتییەکی زۆرچاك بێ، واتە: لە (إیمان)و (اسلام)ی خۆتدا (محسن) بی و بە چاکی ئیمان بێنی و بە چاکیش ئیسلام ڕەنێو بێنی و بەڕێوەی بەری، ئا ئەوە ئیحسانە، بە واتایەکی دی ئیسلام قۆناغی یەکەمی مسوڵمانەیەتییەو ئیمان قۆناغی دووەمیەتی، لە سەرەتاوە[1] ئینسان شایەتمان دێنێت، بەڵام مەرجیش نیە ئیمان چووبێتە نێو دڵی، لە قۆناغی دووەمدا وردە وردە ئیمان تێکەڵ بە دڵ و دەروون دەبێت و ڕەگ و ڕیشە دادەکوتێ، پاشان شوێنەوار و پەرێزی لە هەڵس وکەوت و ڕەفتاری ئینساندا دەردەکەوێ، دوایی، کە ئیمانەکە زیاتر ڕۆ چوو، ئینسان دەگاتە حاڵەتێك ئیمانەکەی لە حاڵەتی (علمی) یەوە، کە دەزانێ خوا هەیەو ڕۆژی دوایی هەیەو فریشتەکان هەن، لەو حاڵەتی (علم)ەوە دە گۆڕێ بۆ حاڵەتی (شهود)، واتە: لە پێشدا هەر بە زەین دەزانێ، بەڵام لە دواییدا بە دڵ دەبینێ، وە لە ڕاستیدا وشەی شایەتمان تەعبیر لەو جۆرە ئیمانە دەداتەوە، تۆ دەڵێی: (أشهد أن لا اله الا الله، وأشهد أن محمداً رسول الله) شایەدیی دەدەم، واتە: بە چاوی دڵ دەبینم و لەسەر بناغەی ئەو بینینە شایەدیی دەدەم .... ئێستاش با سەرنجی قورئان بدەین و بزانین وشەی (تزکیة) لە قورئاندا چۆن بەکارهاتوە: ئایا وەك

---

1) بەڵام مەرج نیە هەموو جارێ وابێ، بەڵکو جاری وا هەیە ڕاستەوخۆ ئیمان پەیدا دەبێ و لە دڵ و دەرووندا ڕیشە دادەکوتێ و پاشان گەردن کەچی و پابەندیی پەیدادەبێ.

ئەهلی تەریقەت‌و تەصەووف (تزكية) دەڵێن: تەنیا حاڵەتێكی دڵ‌و دەروونی یەو هەندێك مەسەلەی ئەخلاقییەو هیچ پەیوەست نیە بە لایەنەكانی دیكەی ژیان‌و گوزەرانەوە؟ وە ئایا ڕاستە كە (إحسان) تەنیا ئەوەیە، كە تۆ لە حاڵەتی پەیوەندی لەگەڵ خوادا ئیمانی شهودیی (الإيمان الشهودي)یت بۆ دروست بێ؟ یاخود هەم (تزكية)و هەم (إحسان)یش, بەڵێ زیاتر سەروكاریان لەگەڵ دڵ‌و دەرووندا هەیە, وە زیاتر سەروكاریان لەگەڵ پەیوەندی نێوان خواو ئینسان دایە, بەڵام هەموو لایەنەكانی دیكەی ژیانیش دەگرنەوە؟!

سەرەتا با سەرنجی وشەی (تزكية) بدەین لە چەند سیاقێكی قورئانیداو پاشانیش دێینە سەر باسی (إحسان):

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ۞ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ۞ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا ۞ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾[1]، واتە: سوێند بە نەفس‌و بەوەی كە دروستی كردوەو ڕێكی خستوە, جا خراپەكاریی‌و پارێز كاریی فێركردوە, بەڕاستی سەرفرازە ئەو كەسەی كە خۆی (تزكية) كردوە, وە بەڕاستی پەشیمانەو بەدبەختە ئەو كەسەی كە نەفسی خۆی شاردۆتەوە. با سمان كرد كە (تزكية) واتە: پاككردن‌و چاككردن‌و گەشەپێدان، كەواتە: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا﴾، واتە: بەڕاستی سەرفرازە ئەو كەسەی كە نەفسی خۆی پاك كردۆتەوە لە چڵك‌و چەپەڵ‌و ژەنگ‌و ژاری كوفرو شیرك‌و نیفاق‌و گوناهە گەورەكان (الكبائر)و گوناهە بچووكەكان (الصغائر), چ گوناهی دەروونی, چ گوناهی ڕواڵەتی, وەكو خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَذَرُواْ ظَاهِرَ الإِثْمِ وَبَاطِنَهُ﴾ (الانعام-120)، واتە: لە گوناهی ڕواڵەتیی واز بێنن‌و لە هی دەروونیش. دیارە گوناهە دەروونییەكان بنك‌و ڕیشەی گوناهە ڕواڵەتییەكان‌و خراپترن، كەواتە: تەزكیەی نەفس, كاتێك دێتەدی كە ئینسان هەم دەروونی خۆی پاك كردبێتەوەو هەم سیفەتە باشەكانی لەخۆیدا گەشە

1) (الشمس 7-10).

پێدابێ، وە هەم خۆی چاك كردبێ، كە هەڵبەتە لە ئەنجامی (تخلیة وتحلیة)دا چاك بوون (صلاح)یش دروست دەبێ، لە ئەنجامی خۆ بژاركردن لە سیفەتە بەدەكان (رذائل)و خۆ ڕازاندنەوە بە خەسڵەتە پەسندەكان (فضائل)، حاڵەتی چاكیی (صلاح) بۆ ئینسان دێتەدی، ئەو حاڵەتەی كە پێغەمبەر ﷺ دە فەرموێ: (ألا ان في الجسد مُضغةً اذا صَلَحَتْ صلح الجَسَدُ كُلُّه واذا فَسَدَتْ فَسَدَ الجَسَدُ كُلُّه الا و هي القَلْبُ)[1]، واتە: ئاگاداربن! لە جەستەی ئینساندا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر ئەو باش بوو، جەستە هەمووی باش دەبێ، وە ئەگەر ئەو تێكچوو، جەستە هەمووی تێكدەچێ ئەویش دڵە. دوایی فەرموویەتی: (وقد خابَ مَنْ دسَّاها) بەڕاستی ماڵ وێرانو زیانبارە ئەو كەسەی، كە نەفسو دڵو دەروونی خۆی شاردۆتەوە لەژێر چڵكو چەپەری گوناحو تاوانو خراپەكارییدا.

لە ئایەتێكی دیكەدا دەبینین، كە (تزكية) پەیوەندی بەوەوە هەیە، كە ئینسان لە ڕێبازی شەیتان دووركەوێتەوەو لە گوناهە گەورەكان خۆی بپارێزێ، دە فەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَلَوْلا فَضْلُ اللهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَكِنَّ اللهَ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ وَاللهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[2]، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، بە دوای هەنگاوەكانی شەیتان مەكەون، هەر كەسێك بەدوای هەنگاوەكانی شەیتان بكەوێ، بێگومان (شەیتان) فەرمانی پێدەكات بە گوناهە دزێوو ناقۆڵاو ناپەسندەكان ﴿دەشگونجێ مەبەست لە (فحشاء) ئەو گوناهانە بن، كە پەیوەندییان بە لایەنی زایەند (جنس)ەوە هەیەو، مەبەست لە (منكر)یش ئەو گوناهانە بێ كە پەیوەندییان بە دەستدرێژیی كردنە سەر مافەكانی خەڵكەوە هەیە﴾، وە ئەگەر بەخششو بەزەیی خوا نەبێ لەسەر ئێوە، ئەوە بێگومان هیچ كام

1) متفق عليه .
2) (النـور -21) .

لە ئێوە تەزکیە نابن (و حاڵەتی پاکیی و چاکییتان بۆ نایەتە دی)، بەڵام خوا هەرکەسێکی بیەوێ تەزکیەی دەکات، بێگومان خوا بیسەرەو زانایە.

لێرەدا دەبینین خوای کاربەجێ لە پێشدا دەفەرموێ: بەدوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون و خۆتان لە (الفحشاء والمنكر) بپارێزن، کە شەیتان فەرمانیان پێدەکات، دوایی دەفەرموێ: ئەگەر بەخششی خوا نەبێ هیچ کامتان تەزکیە نابن.

کەواتە کاتێك ئینسان لە هەنگاوەکانی شەیتان دووردەکەوێتەوەو لە (الفحشاء والمنكر) دەپارێزێ، کە حاڵەتی (تزكية)ی بۆ دروست بوو بێ، کە ئەویش بە یارمەتی و هیدایەتی خوا نەبێ نایەتەدی، هەروەها بەهۆی تەزکیەوە، ئینسان ماڵی خۆی دەبەخشێ، یاخود بەهۆی ماڵ بەخشینەوە، ئینسان تەزکیەی نەفسی بۆ پەیدا دەبێ، وەکو خوای زاناو توانا فەرموویەتی: ﴿**خُذ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلاَتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ**﴾[1]، واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ) لە ماڵ و سامانیان زەکات وەربگرەو پاکیان بکەوە بەهۆی ئەو زەکاتەوە، وە تەزکیەیان بکە بەو هۆیەوە، وە سەڵاتیان بۆ بنێرەو دووعایان بۆ بکە، بێگومان دووعاو سەڵاتی تۆ بۆ ئەوان مایەی ئارامییە، وە خوا بیسەرو زانایە.

کەواتە: یەکێك لە هۆکارەکانی تەزکیەی نەفس بریتییە لە ماڵ بەخشین و سەرفکردنی لە پێناوی خوادا، هەروەها یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی تەزکیە بریتییە لە: پابەندبوون بە ئادابەکانی شەرعەوە لە هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتییەکاندا، وەك خوای تاك و پاك فەرموویەتی: ﴿**فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ**﴾[2]، واتە: (لەکاتی سەردانی ماڵاندا) ئەگەر کەستان نەبینی لەو ماڵەدا مەچنە نێوی هەتا مۆڵەت نەدرێن، وە ئەگەر پێشتان گوترا: بگەڕێنەوە، یەکسەر

---

1) (التوبة -102).
2) (النور -28).

بگەڕێنەوە, (ئەو گەڕانەوەیەتان لەسەر دڵ قورس نەبێ) ئەوە بۆ ئێوە دەبێتە تەزکیە وە خوا بەوەی دەیکەن زانایە.

کەواتە: پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانو خۆڕازاندنەوە بەئادابە بەرزە کۆمەڵایەتیەکانیش یەکێك لەوانە سەلام کردنو مۆڵەت وەرگرتنە بۆ چوونە ماڵی خەڵك, ئەگەر مۆڵەتیش نەدرا گەڕانەوەیە بەبێ قەڵس بوون, ئەوەش هەر دەبێتە مایەی تەزکیەی نەفس.

دیسان نەزەر نەکردنو نەڕوانین بۆ ئافرەتانی نامەحرەمو داوێن پاك، ئەویش هەر دەبێتە هۆکاری تەزکیە, وەك خوا -عزّ وجلّ- دەفەرموێ: (**قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ**)[1]، واتە: بە بڕواداران بڵێ لە چاوی خۆیان بگرنەوە, وە داوێنی خۆیان بپارێزن, ئەوە مایەی تەزکیەی چاکترە بۆیان, بێگومان خوا شارەزایە بەوەی کە بەکارامەییەوە دەیکەن.

وە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی چاكو شەرعییانەش لە بواری ماڵو خێزاندا، دیسان مایەی تەزکیەیە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿**وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْاْ بَيْنَهُم بِالْمَعْرُوفِ ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ**﴾[2]، واتە: ئەگەر ئافرەتانتان تەڵاق داو گەیشتنە کاتی خۆیان -کە بتوانن شوو بکەنەوە- ڕێگایان لێ مەگرن کە شوو بکەنەوە, مادام لەنێو خۆیاندا بە چاکی ڕێککەوتبن، ئا ئەوە کەسانێکی لە ئێوە پێ ئامۆژگاری دەکرێ کە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئا ئەوەتان مایەی تەزکیەی چاکترو پاکیی زیاترە, وە خوا دەزانێو ئێوە نازانن.

1) (النور- 30) .
2) (البقرة 232).

وە تەزكیە چ بۆ زیادبوونی ئیمان بەهۆی تاعەتەوە, وە چ بۆ پەیدابوونی ئەسڵی ئیمان بەهۆی ئیمان هێنانەوە, بۆ هەردووكیان پێویستە، چونكە تەزكیە تەنیا یەك شت نیە كە كۆتایی پێ بێت و ببڕێتەوە, بەڵكو زۆر ڕەهەندی هەن و مانایەكی فراوانی هەیە, وەك چۆن ڕەهەند (بعد) و مانایەكی تایبەتی هەیە كە بریتیە لەوەی ئیمان و ئیسلامەكە زۆر چاك بێت, مانایەكی فراوانیشی هەیە كە هەموو شتێك دەگرێتەوە, لەوبارەوە, خوای بەبەزەیی لەبارەی (ابن ام مكتوم)ەوە كە دەچێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش لەوكاتەدا سەرگەرمی قسەكردن دەبێ بۆ هەندێك لە سەرانی (قورەش) جۆرێك لە ڕەخنەو گلەیی ئاڕاستەی پێغەمبەر ﷺ دەكات دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى﴾[1]، واتە: تۆ چووزانی بەڵكو تەزكیەی پەیدا دەبوو, واتە (لێی گەڕابای با گوێی گرتبایە لە ئایەتەكانی قورئان و ڕووت لێی وەرنەگێڕابایە).

كەواتە: لە دوای ئیمانیش، تەزكیە هەر بەردەوامە, وە بۆ ئەو كەسەش كە كافرو موشریك بووە تەزكیە هەر پێویستە، چونكە خوای بێ نیازو جێی نیاز لەبارەی ئەو كابرا كافرە یان كۆمەڵە كافرەوە كە پێغەمبەر ﷺ زۆری مەبەست بوو ئیمان بێنێ, لە هەمان سیاق دا فەرموویەتی: ﴿وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّى﴾[2]، واتە: وە ئایا ئەگەر ئەو كەس (كافر)ە تەزكیە نەبێ تۆ چ زیانێك دەكەی؟! واتە: مادام گوێ ناگرێ و ئامادە نیە كەسانی هەژار بێن بۆ مەجلیسەكەی, تۆش گوێیان مەدەیە و وازیان لێ بهێنە، وە لە كۆتایی باسی وشەی تەزكیەدا, دەڵێین: (تەزكیە)كردن یەكێكە لە چوار ئەركە سەرەكییەكانی پێغەمبەر ﷺ كە لەنێو ئۆممەتی خۆیدا جێبەجێیان بكات, ئەوەش لە چوار شوێنی قورئاندا دووبارە بۆتەوە كە ئەمانەن: (البقرة 129, البقرة 151, آل عمران 164, الجمعة 2).

---

1) (عبس- 3).
2) (عبس- 7).

لە سوورەتی (البقرة 129)دا دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ﴾ لێرەدا وشەی (تزكية)ی لە (ويعلمهم الكتاب والحكمة) دوا خستوە، بەڵام لە ئایەتەکانی دیکە لە هەرسێکیاندا وشەی (تزكية)ی پێش (ويعلمهم الكتاب والحكمة) خستوە, بەڵام جێی سەرنج ئەوەیە کە لە هەر چواریاندا خستوویەتە دوای (يتلوا عليهم آياته)یەوە, واتە: لە هەر چوار شوێنەکاندا خوای کاربەجێ باسی ئەرکی پێغەمبەر ﷺ دەکات کە بریتیە لە چوار شتی سەرەکی وەك فەرموویەتی: ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوەو تەزکیەیان دەکات, وە کتێبیان فێر دەکاتو, حیکمەتیان فێر دەکات، وەك دەبینین لە هەر چوار شوێنەکەدا بەسەردا خوێندنەوەی ئایەتەکان خراوەتە پێشەوە, لە سێ شوێنیشدا تەزکیە خراوەتە پێشەوەو فێربوونی کتێبو حیکمەت خراوەتە دوایە, لە یەك شوێنیشدا تەزکیە خراوەتە کۆتاییەوە.

لێرەدا ئەوە دەردەکەوێو وەردەگیرێ کە یەکەمینو سەرەکیترین ئەرك (وظيفة)ی پێغەمبەر ﷺ بریتیە لە خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا، بەڵێ رێبازی پێغەمبەر ﷺ ئەسڵو مەتنەکەی بریتیە لە قورئان، بۆیە یەکەمین ئەرکی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە، کە ئایەتەکانی خوا بەسەر خەڵکیدا بخوێنێتەوەو تێیان بگەیەنێ، دیارە هەر کەسێکیش بیەوێ دینداریی بکاتو لە شەریعەتو دینی خوا ( عزّ و جلّ) بەهرەمەندبێ, دەبێ هەر لە ئایەتەکانییەوەو لە قورئانەوە دەست پێ بکات.

ئنجا بۆیەش لە سێ شوێندا دوای: (يتلوا عليهم آياته) دەفەرموێ: (ويزكيهم)، تاکو حاڵی بین کە ئایەت بەسەردا خوێندرانەوەو وەرگرتنی ئایەتو شارەزابوون لە قورئانو وەرگرتنی قورئان, دەبێ یەکسەر ببێتە هۆی تەزکیەو مایەی پاك بوونو چاك بوونو گەشەکردنی ئینسانو لە خوا نزیکبوونەوەی، ئنجا دوای ئەوە فەرموویەتی: (ويعلمهم الكتاب) کە من پێم وایە مەبەست لە (کتاب) لێرەدا قورئان نیە, چونکە پێشتر باسی قورئان کراوە, بەڵکو مەبەست لە کتێب لێرەدا

بەرنامەی ژیانو ئەو دەستوورو یاسایانەن، کە ڕێکخستنی ژیانو گوزەرانی تاكو خێزانو كۆمەڵگا پێویستی پێیانەو لە قورئانو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ وەردەگیرێن، پاشان فەرموویەتی (والحكمة)، کە من پێم وایە مەبەست لە (حكمة)یش لێرەدا کارامەییو لێزانییو وەستایی یە لە چۆنیەتی جێبەجێکردنو پیادەکردنی شەریعەتدا, وە ڕەوشتو ئاکاری بەرزو پەسند جوانو دڵگیرە[1]، مەبەستم ئەوەیە، کە تەزکیە بەبێ وەرگرتنی قورئانو شارەزایی لە قورئان بۆ ئینسان، پەیدا نابێت, وە لە بەرانبەریشدا ئینسان ناتوانێ چاك لە کتێبی خوا حاڵی بێت بەبێ تەزکیەو ئینسان هەتا نەفسی تەزکیە نەبێ, لە ڕاستیدا فێربوونی کتێبو حیکمەتی بۆ نارەخسێو مەیسەر نابێ.

## 2- وشـەی (إحســان):

ئێستاش با سەرنجێکی وشەی (إحسان) بدەین, لە چەند سیاقێکی قورئاندا تاکو زۆر بە ڕوونی بۆمان دەرکەوێ کە چەمكو واتای وشەی (إحسان)یش دیسان شتێکی جوزئیی و یەك ڕەهەند نیەو تەنیا حاڵەتی دەروونی نیە, بەڵکو فراوانەو زۆر ڕەهەندی هەن, بۆ وێنە: خوای پەروەردگار لە باسی تۆڵە (قصاص)دا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاء إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ﴾[2]، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە, تۆڵەتان لە سەر نووسراوە لە کوژراوەکاندا، ئازاد بە ئازاد, کوێلە بە کوێلە, مێ بە مێ چا هەرکەسێك لەلایەن براکەیەوە شتێك بەخشرا (کە مەبەست تۆڵەیە) ئەوە با هەم

1) بەڵگەشم بۆ ئەوە ئەوەیە کە خوای کاربەجێ لە سوورەتی(الاسراء)(22-39)دا پاش ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە ئەدەبی بەرزو ڕەوشتی پەسند، دەخاتەڕوو فەرموویەتی: (ذلك مما أوحى اليك ربك من الحكمة) .
2) ( البقـرة  178).

بابای خاوەن هەق بە جوانیی شوێن هەقەکەی بکەوێ‌و، هەم بابای هەق کەوتووە لاش بە چاکی تەسلیمی بکات...

کەواتە: (إحسان) مەسەلەی تۆڵە وەرگرتنەوەو خوێندانیش دەگرێتەوە، وە لە تەلاق دانیشدا بە هەمان شێوە (إحسان) هەر هەیە, وەك دە فەرمویێ: ﴿الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ...﴾[1] چونکە تەڵاقدان دەگونجێ بە شێوەیەکی خراپ بێت‌و دەشگونجێ بە چاکەکاریی (إحسان)ەوە بێت، وە دەر بارەی شوێنکەوتنی کۆچکەران (مهاجرین)و پ شتیوانان (أنصار)یش خوای کار بەجێ فەرموویەتی: ﴿وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ﴾[2]، واتە: پێ شکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچکەران‌و لە پشتیوانەکان, وە ئەوانەی کە بە چاکی دوایان کەوتوون, خوا لێیان ڕازییەو ئەوانیش ڕازین، چونکە دەگونجێ کەسێك ئیددیعای شوێنکەوتنی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بکات, بەڵام ڕاست نەکات‌و بەخراپە دوایان بکەوێت، بەڵام دەبێ بە چاکی (إحسان) دوایان بکەوێ‌و ئەوان چۆن دینداریيان کردوە ئەویش ئاوا بیکات.

دیسان خوای پەروەردگار (إحسان)ی خۆی کردۆتە پادا شت بۆ (إحـسان)ی بەندەکانی, وەك فەرموویەتی: ﴿هَلْ جَزَاء الإِحْسَانِ إِلا الإِحْسَانُ﴾[3]، ئایا پاداشتی چاکەکاریی جگە لە چاکە چی دیکەیە؟ وە خوا (سبحانە وتعالی) لە دوای بەندایەتیکردن بۆ خوا باسی چاکەکاریی (إحسان) لەگەڵ بەندەکانی کردوە, وەك فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ لاَ تَعْبُدُونَ إِلاَّ اللّهَ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْناً﴾[4]، واتە کاتێك

1) (البقرة 129).
2) (التوبة 100).
3) (الرحمن 60) .
4) (البقرة 83).

پەیمانمان لە نەوەکانی ئیسرائیل وەرگرت, کە تەنیا خوا بپەرستن, وە لە گەڵ باب و دایك و لەگەڵ خزمان و هەتیوان و نەداران چاك بن, وە قسەی چاك بۆ خەڵك بکەن. وە خوای بێهاوتا ڕوونی کردۆتەوە کە باشترین دینداریی ئەوەیە کە (إحسان)ی تێدا بێت, وەك دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لله وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾(1)، واتە: دینداریی و مسوڵمانەتی کێ لە هی ئەو کەسە باشترە کە ملکەچی خوا بووەو لە دینداریییەکەشیدا چاکەکارە ؟!

هەروەها ماڵ بەخشینیش چاکەکاریی تێدایە, وەك فەرموویەتی: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ اللهِ وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوَاْ إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾(2) لە ڕێی خوادا ماڵ ببەخشن، وە بەدستی خۆتان خۆتان مەفەوتێنن, وە چاکە بکەن, بێگومان خوا چاکەکارانی خۆش دەوێ. هەروەها چاوپۆشی کردن لە خەڵك و عەفووکردنیان لە بەرامبەر هەڵەو کەم و کووڕی یەکانیاندا, ئەوەش هەر (إحسان)ە, وەك خوا فەرمویەتی: ﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاء وَالضَّرَّاء وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾(3)، واتە: ئەوانەی ماڵی خۆیان لە خۆشی و ناخۆشیدا دەبەخشن و ئەوانەی ڕقی خۆیان قووت دەدەنەوەو چاوپۆشی لە خەڵك دەکەن, بێگومان خوا چاکەکارانی خۆش دەوێ. وە خۆڕاگریی (صبر)یش لە گەرمەی جەنگدا هەر (إحسان)ە, زۆربەی ئەهلی تەریقەت و تەصەووف وا دەزانن کە (إحسان) هەر ئەوەیە ئینسان لە ماڵی خۆی خەریکی زیکر و فیکر بێت, بەڵام دەبینین خوای بێوێنە ئەوانەی ناوناوە (محسن) کە لە گەرمەی جەنگ و جیهاددا لە بەرامبەر دوژمنانی ئیسلامدا نابەزن و خۆڕاگرن و پشوو درێژن, وەك دە فەرموێ: (وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُواْ لِمَا أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ اللهِ وَ مَا

1) (النساء – 125).
2) ( البقرة – 197).
3) ( آل عمران- 134).

ضَعُفُواْ وَمَا اسْتَكَانُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ ۞ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلاَّ أَن قَالُواْ ربَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ۞ فَآتَاهُمُ اللّهُ ثَوَابَ الدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ الآخِرَةِ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾(1)،

وەك دەبینین لەم ئایەتەدا خوای پەروەردگار ئەوانەی ناوناوە چاکەکار (محسن) کە لە جەنگو جیهادی ڕێی خوادا خۆڕاگرنو خۆشەویستی خۆی بۆ دەربڕیون.

هەروەها (إحسان) گەلێك شت کۆدەکاتەوە وەك شەونوێژ, پاڕانەوە, داوای لێبوردن کردن, ماڵ بەخشین, وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ۞ آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُحْسِنِينَ ۞ كَانُوا قَلِيلاً مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ۞ وَبِالأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ۞ وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾(2)، واتە: پارێزکاران لەنێو باغو باغاتو کانیو سەرچاوەی زۆردان ئەوەی کە پەروەردگاریان پێیان دەدا وەری دەگرن, بێگومان ئەوان پێش ئەوە (لە دونیادا) چاکەکار بوون (چاکەکارییەکەیان ئەوەبوو کە) شەو کەمو دەخەوتن (وبە زۆری سەرگەرمی بەندایەتیو شەو نوێژو قورئان خوێندنو زیکرو فیکر بوون) وە دەمەو بەیان پێش ئەوەی بەرەبەیان بێت داوای لێبوردنیان لە خوا دەکرد, وە لە ماڵو سامانیشیاندا مافی سواڵکەرو مافی خەڵکی بێبەشیان دابین دەکرد سواڵکەر ئەوەیە کە داوات لێ دەکات, بێبەش ( محروم) ئەوەیە کە خۆی داوا ناکات, بەڵکو دەبێ بۆ خۆت بزانی کێیەو سەلیقەت پێیبێ شکێو هاوکاری بکەی.

کەواتە (إحسان) هەم شەو نوێژە, هەم پاڕانەوەو داوای لێبوردن کردنە, هەم ماڵ بەخشینە....هتد. کەواتە هەر کەسێك دەیەوێ لە چەمكو واتای ڕاستەقینەی هەر کام لە (تزكية)و (إحسان) حاڵی بێت, کە ئایا لە قورئاندا بۆ چ مەبەستێك

---

1) ( آل عمران: 146-148).
2) ( الذريات: 15-19) .

بەکارهێنراون، دەبێ بەو شێوازەی خستمانەڕوو لەو سیاقانەدا کە ئەو دوو وشەیان تێدا بەکارهێنراون سەرنجیان بدات, هەڵبەتە ئەوکاتەش وەك لە سەرەتاوە باسمان کرد بۆی دەردەکەوێ کە هەرکام لە تەزکیەو ئیحسان، چەمكو واتایەکی فراوانو گشتگیرو فرە ڕەهەندیان هەیەو تایبەت نین بە لایەنێکی دیاری کراوەوە، هەرچەندە پەیوەندییان بە لایەنێکـی دیاری کراوەوە کە لایەنی دەروونی مەعنەوییە پتەوتر بێت، لە برگەی دووەمیشدا تیشکی زیاتر دەخەینە سەر ئەم بابەتە.

## دووەم: مەڵبەندی تەزکیەی نەفس و بەرهەم و شوێنەوارەکەی:

بەڕێزان!

مەڵبەندو چەقی تەزکیەی نەفس بریتیە لە ڕووحی ئینسان، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ وەك پێشتر هێنامان - فەرموویەتی: ئاگاداربن! لە جەستەی ئینساندا پارچەیەك هەیە، ئەگەر ئەو پارچەیە باش بێ؛ جەستە هەمووی باش دەبێ، وە ئەگەر خراپیش بوو؛ جەستە هەمووی خراپ دەبێ، بزانن کە ئەویش دڵە[1]، کەواتە دەبێ ئینسان هەوڵ بدات لە ڕێی تەزکیەوە دڵی ساغ (قلب سلیم)وە دەست بێنێ، چونکە خوای پەروەردگار (عزّو جلّ) بە شێوەیەکی ڕوون و ڕا شکاو، سەرفرازیی قیامەتی بەستۆتەوە بە دڵی ساغ و سەلامەتەوە، وەك فەرموو یەتی: ﴿يَوْمَ لا يَنفَعُ مَالٌ وَلا بَنُونَ ۞ إِلاَّ مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾[2]، واتە: ئەو ڕۆژەی کە نە ماڵ و سامان و نە کوڕان، سوود (بە ئینسان) ناگەیەنن، مەگەر کەسێك بە دڵێکی ساغ و سەلامەتەوە بچێتە لای خوا.

جا ئێستا با سەرنج بدەین: لە قورئانێدا خوای زاناو شارەزا چوار وشەی بۆ حاڵەتی و مەعنەویی مرۆڤ بەکارهێناون، کە ئەمانەن: (روح، نفس، قلب، عقل).

أ- جا هەر چی وشەی (روح)ە ناوە بۆ لایەنی دەروونیی و دیوی پەنهانی ئینسان و خوای کاربەجێش ئاماژەی بەوە کردوە، کە (روح) شتێکی تایبەتە بەخۆیەوەو نهێنییەکە مرۆڤ ناتوانێ دەرکی بکات: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ

---

1) کە پێشتر دەقی فەرموودەکەمان هێناو (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە.
2) ( الشعراء: 88، 89).

مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾(3) ئنجا لەڕا ستیدا حەقیـ قەتو جەوهەری مرۆڤ لە ڕووحەکەیدا شێرراوەتەوە، ئە گەرنا ڕووەكو ماددەی بێ ژیانو ژیاندارانیش(2) لەم جەستەیەدا لە گەڵ ئێ مەدا بە شدارن, وا تە ئەو گەردیلەو ماددەیەی کە جەستەی ئێمەی لێ پێک دێ, هی ژیانلە بەرانو ڕووەکیـش هەر لەوە پێکدێ، بەڵگەش لەسەر ئەوە کە مرۆ ڤ لە دووبە شی سـەرەکیو دوو پێکهێنەری بنەڕەتی پێکهاتوە کە بریتیـن لە:

1- ڕووحی خوایی. 2- جەستەی خاکیی.

فەرمایشتی خوای زاناو شارەزایە, بۆ نموونە فەرموویەتی: ﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الإِنسَانِ مِن طِينٍ ۞ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِن سُلالَةٍ مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ ۞ ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِ....﴾ (السجدة: 7-9).

وە فەرموویەتی: ﴿إِذ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِن طِينٍ ۞ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ﴾ (الحجر: 28-29).

وەك دەبینین خوای بەرزو مەزن (عزّو جلّ) هەم لەبارەی دروستکردنی ئادەم (علیه السلام)و هەم وەچەکەیشی‌یەوە ڕایگەیاندوە کە لە دوو پێکهێـنەری سەرەکی دروستی کردوون، کە جەستەیەکی خاکیی‌و گیانێکی خوایی‌یە! بۆیەش گوتوومانە حەقیقەتی مرۆڤ لە ڕووحەکەیدا شێرراوەتەوە, چونکە (جە ستە) خاڵی هاوبەشی نێوان ئینسانو دروستکراوەکانی دیکەی وەك: ڕووەكو ماددەی بێ ژ یانو زیـ ندەوەرو ژیاندارا نەو بەس ڕوو حە کە ئینـ سان هە یەتی‌و دروستکراوەکانی دیکە لێی بێبەشن!

---

3) (الإسراء- 85).

2) ئەگەر وشەی گیان ماناو تەرجەمەی وشەی (روح) بێ, من وشەی (گیاندارو گیانلبەر)م بۆ غەیری مرۆ ڤ پێ هەڵەیە، چونکە لە ڕاستیدا (گیان) تایبەتە بە مرۆڤەوەو قورئانیش بۆ غەیری مرۆڤ بەکاری نەهێناوە, جگە لە(جبریل و وەحی) بۆیە وشەی ژیاندارو ژیانلەبەرم بەکارهێنا.

ب- ئنجا وشەی (نفس)یش, لەڕاستیدا هەر مەبەست پێی (روح)ە, بەڵام کاتێك کە ڕووح دەچێتە جەستەوەو داخوازییەکانی جێبەجێ دەکات و غەریزەکانی تێر دەکات, بەو ئیعتیبارە پێی دەگوترێ نەفس، بۆیە لە قورئاندا مەدح و زەم هیچ کاتێك ئاراستەی (روح) نەکراون, بەڵکو ئاراستەی نەفس کراون, چونکە ڕووح بۆ خۆی هەر چاك و پاکە, بەڵام وەختێك کە دێتە نێو جەستەوە یان شایستەی مەدح دەبێ, یان شایستەی زەم دەبێ, ئەگەر بەدەن بەرەو خوا وەربچەرخێنێ, ئەوە شایستەی مەدح دەبێ, وە ئەگەر بەرەو ئارەزووەکانی بیسووڕێنێ شایستەی زەم دەبێ! بۆ نموونە: خوا (عزّ و جلّ) فەرموویەتی: ﴿إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ....﴾(یوسف-35)، واتە: بێگومان نەفس زۆر فەرمان بە خراپە دەکات, کە دیارە مەبەست پێی نەفسی چاك و پاك نەکراوە، هەروەها فەرموویەتی: (وَلاَ أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ﴾(القیامة-2), واتە: نەخێر وانییە سوێند دەخۆم بە نەفسی ڕەخنەگرو لۆمەکەر.. دیارە لێرە مەدحی ئەو جۆرە نەفسانە کراوە کە ڕەخنە لە خاوەنەکەی دەگرێ.

هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ﴾(الفجر-27)، واتە ئەی نەفسی ئارامگرتوو, لێرەش هەر مەبەست مەدحە, جا ئایا نەفس بە چی ئارام دەگرێ؟! خوا فەرموویەتی: ﴿أَلاَ بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾(الرعد – 28)، کەواتە: بە یادی خواو بە پەرستنو بەندایەتی بۆ خوا, نەفس ئارام دەگرێ.

ج – (عقل) مەبەست لە وشەی (عقل) کە لە قورئاندا تەنیا بە صیغەی کردار (فعل) هاتوە – ئەو لایەنەی ڕووحە کە دەرکی شتانی پێدەکات و پێی تێدەگات، شایانی باسیشە کە هەر کام لە وشەکانی (لبّ و فؤاد وحجر ونهية)ش لە قورئانێدا بە مانای عەقڵ بەکارهاتوون, وەك لەم ئایەتانەدا دەبینرێ:

﴿وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُوا الأَلْبَابِ﴾(ص- 29), ﴿إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً﴾(الاسراء- 36). ﴿..هَلْ فِي ذَلِكَ قَسَمٌ لِّذِي

حِجْرٍ﴾(الفجر-5 ). ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لأُوْلِي النُّهَى﴾(طه 128).

د- (قلب): وشەیەکی دیکەیە لە قورئانێدا بۆ تەعبیر کردن لە لایەنی مەعنەوی ئینسان بەکارهاتوە بریتیە لە دڵ (قلب)، کە مەبەست پێی چەقو کانگای ئیرادەو سۆزو هەستو نەستە لە مرۆڤدا، هەر بۆیەش خوای کاربەجێ دڵ (قلب)ی بە ساغیو نەخۆشی وەسف کردوە بە پێچەوانەی (فؤاد و لب و حجر و نهیة)ەوە کە مەدحو زەم نەکراون: خوا فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ لا يَنفَعُ مَالٌ وَلا بَنُونَ ۞ إِلاَّ مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾(الشعراء: 88-89)، وە فەرموویەتی: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ...﴾، بەڵێ لە ڕاستیدا هەرکام لە (نفس و عقل و قلب)، (دەروونو ژیریو دڵ) هەرسێکیان هەر ناون بۆ گیان (روح)و هەر ڕووحە ئەو ناوانەی هەن، چونکە (روح) ئیش بە مێشك (دماغ) دەکاتو کردوویەتی بە مەڵبەندی بیرکردنەوەو کەشفکردن، وە ئیش بە دڵ (قلب) دەکاتو کردوویەتی بە کانگای ویستنو نەویستنو خۆشویستنو ڕق لێبوونەوە، وە جەستەش ئیش پێدەکاتو لەگەڵی ئاوێتە (مُتلَبّسْ) بووەو کردوویەتی بە تۆڕو شەداوو وەسیلەو ئامراز بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانو تێرکردنی غەریزەکان، جا ئیشی سەرەکی تەزکیەو ئیحسان، ئەوەیە کە ئەو نەفسە بێتە ژێر باری شەرعو لە ژێر باری هەواو ئارەزووەکانو شەیتان بێتە دەرێ، چونکە هەرکات نەفس هاتە ژێر شەرع، عەقڵەکە هەر بیر لەوە دەکاتەوە کە ڕەزامەندیی خوای تێدا یەو، دڵ (قلب)یش بەس بەرەو ئەوە وەردەچەرخێ کە خوا پێی خۆشەو خۆشی دەوێو ئەوەشی ڕق لێ دەبێتەوە کە خوا ڕقی لێیەتی، هەربۆیەش خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ۞ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ۞ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا ۞ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾[1]، چونکە کە نەفس تەزکیە بوو واتە

1) (الشمس: 7-10) .

پاكو چاك بوو, ئەوكاتە عەقڵیش باش دەبێ، دڵیش باش دەبێو جەستەش هەمووی بەرەو خێرو بەرەو چاكەو بەرەو خوا وەردەچەرخێ.

ئنجا ئایا لە كاتێكدا ئینسان حاڵەتی تەزكیەی نەفسی بۆ پەیدا دەبێتو دەگاتە پایەی ئیحسان, چ گۆڕانێكی بەسەردا دێت؟

بەكورتی دەڵێین: بابای نەفس تەزكیە بوو ئیمانەكەی لە حاڵەتی زانیارییەوە دەگۆڕێ بۆ شهوودیی, واتە: ئیمانەكەی لە ئیمانێكی (ذهني) و (علمي) ڕووتەوە دەگۆڕێ بۆ ئیمانێكی (شهوودی) كە تەنیا حاڵی بوون, نیە, بەڵكو حاڵی بوونەكەی تێدا دەبێتە حاڵ, وە تەنیا تێگەیشتن نیە, بەڵكو تێگەیشتنەكەی تێدا دەبێتە پێگەیشتنو، تەنیا زانین نیە, بەڵكو زانینەكەی ئاوێتە دەبێ لەگەڵ توانینو ئەوەی دەیزانێ, دەیتوانێ, چونكە زۆر كەس هەیە شتی دەزانێ, بەڵام ئیشی پێ ناكات, بۆچی؟ چونكە حاڵەتی تەزكیەی بۆ پەیدا نەبووە نەفسەكەی پاكو چاك نیە.

ئەوە دەربارەی ئیمان, لەبارەی خواپەرستییو بەندایەتیشەوە, ئینسانێك كە خاوەنی تەزكیەی نەفس بێتو گەیشتبێتە پلەی ئیحسان بەندایەتیو خواپەرستییەكەی لە (تكلّف)ەوە دەگۆڕێ بۆ (طبع), لە پێشدا ئینسان بە نارەحەتییەوە دەیكاتو تامو چێژ لە عیبادەتەكەی وەرناگرێ, بەڵام هەركات نەفسەكەی تەزكیە بوو, زۆر تامو چێژی لێ وەردەگرێ، بۆیە كە سێك تەزكیەی نەفسی نەبێ, دەڵێ: با نوێژەكان لە كۆڵ خۆمان بكەینەوە, بەڵام كەسێك نەفسی تەزكیە بووبێ, دەڵێ: با بەهۆی نوێژەكانمانەوە ئیسراحەت بكەینو بحەسێینەوە، بۆیە كە كاتی نوێژ دەهات, پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (أرحنا بها یا بلال)، واتە: ئەی بیلال بانگ بدەو ئیسراحەتمان پێبكە بەهۆی نوێژەوە، وە لە فەرموودەی ڕاست (صحیح)دا هاتوە كە: (كان ﷺ اذا حزبَهُ أمْرٌ لَجأ الی الصلاة) واتە: كاتێك پێغەمبەر ﷺ توشی سەغڵەتییەك دەبوو یەكسەر پەنای دەبردە بەر نوێژ.

هەروەها ئەو كەسەی تەزكیەی بۆ پەیدا بووبێ, حاڵەتی ئەخلاقیشی دە گۆڕێو لە گیرۆدەیی بە سیفەتە دزێوو ناشیرینەكان (الرذائل)ەوە, دەگۆڕێ بۆ خۆ ڕازاندنەوە بە سیفەتە بەرزو پەسندەكان (الفضائل), بۆ وێنە, هەر نازانێ درۆ بكات یان دزی بكات, وە خیانەت نازانێو ئەمینە, وە داوێن پیسو دەستو دەم پیس نیەو داوێن پاكو دەستو دەم پاكە, وە خۆ بە زلگر نیەو خۆی وەك خەڵك یان كەمتریش سەیر دەكات، وە كینەو بوغزو حەسەدی نیەو دڵی پڕە لە بەزەییو سۆزو خۆشەویستی، وە ترسانو ملكەچی نامێنێ بۆ خەڵكو دەڕازێتەوە بە نەفس بەرزییو بوێرییو ئازایەتیو نەسڵەمینەوە، وە ڕژدییوچرووكیی نامێنێو سەخاوەتی بۆ پەیدا دەبێت، هەروەها هەموو سیفەتە نزمەكانی لادەچنو بە سیفەتە بەرزەكان دەڕازێتەوە.

بەڵێ: تەزكیەی نەفس هەموو ئەم شوێنەوارانە پەیدا دە كات, هەم لە ڕووی ئیمانو عەقیدەوەو هەم لە ڕووی خواپەرستیو تاعەتەوەو هەم لە ڕووی ڕەو شتو ڕەفتارەوە.

## سێیەم: سەرنجدانێکی خێرا لە تەصەووف و ڕێبازەکانی:-

لە ڕاستیدا لە سەرەتاوە ڕێبازەکانی تەصەووف (طرق التصوف) بەم شێوەیە نەهاتوون و سەریان هەڵنەداوە، کە ئێستا هەن، چونکە ئێستا خەڵك پێی وایە، کە هەرکام لەو پێشەوایانەی ڕێبازەکانی تەصەووف هاتوەو ڕایگەیاندوە، کە من ئەو ڕێبازەم بۆ دامەزراندوون و ئێوەش بەدوام بکەون!! بگرە ڕەنگە زۆر لە خەڵکی خوێندەواریش هەر وابزانێت و پێی وابێت کە هەر کام لە: (شیخ جُنَیدْ البغدادي وابوحامد الغزالـي وعبدالقادر الگیلانی و بهاءالدین نقشبندي و سید أحمد السّرهندي و مولانا خالدو .... هتد) بە خەڵکی گوتوە: من ئەم ڕێبازەم دا ناوەو وەرن بەدوام بکەون!! بەڵام نەخێر ئەوە وانیەو هیچ کام لەو زانا و پێشەوایانە خەڵکی بۆ لای خۆی، یان ڕێباز (طریقة)ێکی تایبەت بانگ نەکردوە، بەڵکو هەموویان خەڵکیان تەنیا بۆ لای قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بانگ کردوەو جگە لە قورئان و سوننەت، هیچی دیکەیان بە دەستەوە نەبووە، بەڵام خەڵك لە دوای ئەوان، چونکە قورئان و سوننەتیان بۆ هەزم نەکراوەو توانایان بە سەریاندا نەشکاوە، لە جیاتی بڵێن: خوا (عزّ وجلّ) وای فەرمووەو پێغەمبەری خوا ﷺ وای فەرمووە, گوتوویانە " گەیلانی وای گوتوەو وای کردوەو، غەزالی بەوجۆرەی گوتوەو نەقشبەندی وای گوتوەو.... هتد. ئیدی وردە وردە خەڵکی سادەش وا یان زانیوە، کە ئەو شتانەی لەو زاناو پێشەوایانەوە نەقڵ دەکرێ و دەگێڕرێتەوە، هی خودی خۆیانەو، یەکسەر خۆیان پاڵداوەتە لای ئەو کەسانەو، یەك گوتوویەتی: من قادریم و ئەوی دی گوتوویەتی: من نەقشبەندیم و... هتد!

وەك چۆن: (ابو حنیفة و مالك و شافعي و أحمد و سفیان الثوري و ابوجعفر الطبري)، و سەرجەم ئەو پێشەوایانە، کە ئیجتیهادیان کردوە لە بواری شەرع (فقه)دا، هیچ کام لەوانە خەڵکی بۆ لای خۆی بانگ نەکردوە، بەڵکو خەڵك

پرسیاریان لێ کردوون و، ئەوانیش فەتوایان بۆیان داوە, پاشان لە دوای خۆیان خەڵك فەتواکانیان کۆکردووەتەوە، هی هەرکامێکیان کردوە بە ڕێڕەوو (مذهب)ێکی دیاریکراو بە دوایان کەوتوون! ئاوا بەم شێوەیە هەم ڕێبازەکانی تەصەووف (طرق التصوف)و هەم ڕێڕەوەکانی شەرع (المذاهب الفقهیة) لەدوای خۆیان خەڵك کردوویانن بە ڕێبازو بە دوایان کەوتوون، بگرە هەندێکیان لە خۆیان کردوون بە (دین)ێکی تایبەت!! بەڵام بێگومان ئەوە هەڵەو تێپەڕاندن (إفراط)ە، وە هەڵوێستی ڕاست ئەوەیە کە بابایەکی شافیعی مەزهەب نابێ پێی وابێ کە ئەگەر لە شتێکدا لە مەزهەبی شافیعی لایدا ئەوە لە (دین) لا یداوە، چونکە ئیمام شافیعی (خوا لێی خۆش بێ) دینی بۆ نەهێناوین، بەڵکو (دین)ی بۆ تەفسیر کردووین! پاشان سەرباره خۆیشی بەوە ڕازی نییە کە وەك دینو شەریعەتێکی پابەندکەر (شریعة ملزمة) مامەڵە لەگەڵ فەتواو بۆچوونەکانیدا بکەین، ئەوەتا (النووي) خاوەنی (المجموع) -خوا لێی خۆش بێ- لە چەند شوێنێکدا هەندێك فەتواو قسەی ئیمام (شافعی) دێنێ, پاشان دەڵێ: ئەوە قسەکەیمان لا بردو ئەو فەرموودە ڕاستەمان لە جێگەی دانا, دەڵێ: چونکە ئیمام ( شافعي) خۆی گوتوویەتی: هەرکات لە مەسەلەیەکدا قسەیەکم کردبێو فەرموودەیەکی لە سەر هەبوو کە ڕەنگە من ئەو فەرموودەیەم نەزانیبێ، ئێوە یەکسەر فەرموودە کە لە جێگەی قسەکەی من دابنێن, جا (النووي) دەڵێ: کەواتە: ئێمە وەسیەتەکەی شافیعی جێبەجێ دەکەینو ئەو فەرموودەیە لە جێی قسەکەی دادەنێین! منیش دەڵێم: هیچ گومانی تێدانیە ئەگەر گریمان شافیعی ئەو وەسیەتەشی نەکردبایە دەبوو هەر وامان کردبایە, بۆچی؟! چونکە: ئێمە دینداری دەکەینو (دین)یش لە قورئانو سوننەتدا بەرجەستەیەو (شافعی)ش تەفسیری دینی بۆ ئێمە کردوەو مەزهەبی (شافعي)، تێگەیشتنی (شافعی)یە دەربارەی (دین), نەك دینێکی تایبەت!! هەروەها لە بواری تەزکیەو تەصەووفیشدا: ( گەیلانی)و (نەقشبەند) کاتی خۆی ڕێبازێکی جیایان نەهێناوە, بەڵکو ڕێبازەکەیان هەر قورئانو سوننەت

بووە، بەڵام خەڵك لەدوای ئەوان پێ یانگوتوون: رێ بازی ( قادریی)و رێ بازی (نەقشەبەندیی)و ئەوانی دیکەش هەروا.

ئەوەی باسمان کرد حەقیقەتی رێبازەکانی تەصەووفی راستو رەسەنەو لە ئەسڵدا ئاوا سەریان هەڵداوەو پەیدابوون. بەڵام خەڵك بە لا ساییکردنەوەو بە نەزانیی و بێئاگایی، ئەو رێبازانەیان لە خۆیان کردۆتە دینێکی تایبەت کە وەك گو تمان لە بنەرەتدا چەند رێبازێکی تەزکیە بوونو چاك بوونو پاك بوون بوونو بۆ ئەوە داندرابوون کە بەتایبەت لایەنی رووحییو ئەخلاقیی لە ئینساندا بەهێز بکەنو گەشە پێبدەن.

ئێستاش با سەرنجی ژمارەیەك لە هەڵەو پەڵەکانی ئەهلی تە صەووفی ئەم رۆژگارەمان بدەین:

## چەند هەڵەیەکی کوشندەی ئەهلی تەصەووفی ئەم رۆژگارە:

**یەکەم: زۆر لە رێبازەکانی تەصەووف، لە رچەو رێبازی کاتی خۆی کە ئیمامو پێشەوایەکان دایانناوە، کە هەر بریتی بووە لە قورئانو سوننەت[1] لایان داوە:**

بەڵێ لە دوای پێشەوایەکانی رێبازەکانی تەصەووف زۆر لە شوێنکەوتووانیان لەو راستە شەقامە لایانداوە، هەر لە ناوەکەیەوە بگرە تا هەموو بوارە کانی دیکە، چونکە هەر خودی وشەی (تصوف) مشتو مڕی زۆری لەسەرە کە ئا یا لە ئەسڵدا لە چیەوە هاتوە؟ هەندێك دەڵێن: لە (صوف)ەوە هاتوە، کە بە مانای (خوری) دێ، وە هەندێك دەڵێن: لە (أصحاب الصفة)ەوە هاتوە، وە هە ندێك

1) دیارە لێرەدا مەبەستمان تەنیا ئەو قوتابخانە پەروەردەیی یانەن کە زا ناو پێ شەوایانی رە سەنی ئی سلام دایانناون، وەك: (جنيد البغدادي و عبدالقادر گیلانیو أبو حامد الغزالیو...هتد)، بەڵام کەسانی وەك (ابن عربي وابن سبعينو حلاج) لەو حیسابەی ئێمە بەدەرن.

دەڵێن: لە (فیلوسوفیا)وە هاتووەو زۆر قسەی دیکەشی لەسەرن, بەڵام ڕاست وایە کە لە (صوف)ەوە هاتوە, (ابن تیمیة) دەڵێ: زیاتر وا پێدەچێ لە ( صوف)ەوە هاتبێ, کە ئەو جۆرە کەسانە لەبەر دونیا بەکەم گرتن‌و ژیانی سادە بەرگی خوورییان لەبەر کردوە وەك لە (مجموع الفتاوى)دا هاتوە.

بەڵام ئێمە کە وشەی (تزكية)مان هەیە کە وشەیەکی قورئانییەو، و شەی (إحسان)مان هەیە کە وشەیەکی قورئانی‌و سوننەتییە بۆچی و شەی (تصوف) بەکاربهێنین؟! ئنجا کە بەکاریانهێناوە بە هەرحاڵ ئێمە ناڵێین ئەوە شتێکی زۆر خراپە, چونکە هەر کام لە وشەکانی (تجويدو أصول الفقه و نحو و صرف وبلاغة) ئەوانە هەموویان چەند و شەو زاراوە (مصطلح)ێکن کە دواییی داهێنراون‌و ئەوە گرفت نیە, بەڵام گرفت‌و کێشـەی گورچك بڕ ئەوەیە کە تەصەووف لە نێوەڕۆکی خۆی خاڵی بکرێتەوە!

**دووەم: هەڵەیەکی دیکەی ڕێبازەکانی تەصەووف لەوەدایە کە سەرجەم ئیسلامیان لە لایەنێك لە لایەنەکانیدا کورت کردۆتەوە:** کە بریتیە لە لایەنی مەعنەویی‌و ئەخلاقیی‌و زیکرو فیکر! ئنجا لە خەڵکیش ناسەلمێنن کە ئیسلام هەر ئەوەندە نیە! لە سۆنگەی ئەوەوە کە زۆریان شارەزا نین لە قورئان‌و سوننەت, وا دەزانن کە ئیسلام هەر بریتیە لە زیکرو فیکرو عیبادەتی شەخسی، بە زۆر لە ئەهلی تەصەووف حەساسیەتیان هەیە بە قورئان‌و سوننەت‌و بەڵگەی شەرعیی‌و جەنگ‌و جیهادو حوکم‌و سیاسەتی ئیسلامی‌و کۆمەڵ‌و حیزبە ئیسلامییەکان‌و... هتد[1].

1) دیارە ئێمە قسە لە حاڵەتی گشتی ئەهلی تەصەووف دەکەین لە کوردستاندا بە تایبەت, بەڵام ناڵێین یەك یەکی ئەهلی تەصەووف‌و پێڕو تاقمەکانی بەو جۆرەن .

**سێیەم: دوورکەوتنەوە لە جادەی شەرع، بەهۆی بێئاگایی لە قورئانو سوننەت:**

بۆ نموونە: ئەهلی تەصەووف سێ وشەو زاراوەیان داهێناون کە بریتین لە: (الشريعة والطريقة، والحقيقة)و بە حیسابی خۆیان دەڵێن: شەریعەت بۆ هەموو خەڵکییە، واتە بۆ خەڵکی عەوام، وە تەریقەت بۆ خەڵکی تایبەتی (خواص)یەو، حەقیقەت بۆ خەڵکی تایبەتی تایبەت (خواص الخواص)!!

ئنجا ئایا ئەوەیان لە کوێ هێناوە؟! بێگومان ئەسڵو ئەساسی نیە، چونکە خوای کاربەجێ تەنیا یەك شتی ناردوە، کە شەریعەتە وەك فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ﴾ (الجاثية -18)، ئاشکراشە کە شەریعەتێك کە بۆ پێغەمبەری کۆتایی ﷺ هاتوە جگە لە قورئانو سوننەت چی دیکە نیە! ئنجا ئایا طریقەت یانی چی؟! مەبەست لە (طريقة) بە لێکدانەوەی ڕاستو دروست ئەوەیە کە بەو شێوەی پێغەمبەر ﷺ شەریعەتی خوای جێبەجێ کردوە، دەبێ بەو شێوەیەش شەریعەت پیادە بکرێت واتە: مەبەست لە (طريقة) دەبێ هەمان شت بێ کە فەرمووودەناسان (مُحَدِّثون) پێی دەڵێن: (السنة) واتە: ڕێباز، کە مەبەست پێی ڕێبازی پێغەمبەری خوایە ﷺ، واتە: ئەو ڕێبازو چۆنیەتییەی کە پێغەمبەری خوا گرتوویەتەبەر بۆ پیادەکردنی شەریعەت! حەقیقەتیش دەبێ بریتی بێ ئەگەر بویسترێ ماناکەی ڕێكو ڕاست دەربچێ لە حەقیقەتەکانی ئیسلامو ئیمانو تەقواو ئیحسانو یەقینو شوکرو صەبرو...هتد، کە لە ئەنجامی ئیش پێکردنی شەریعەتدا بەو شێوەیەی سوننەت دیاری کردوە، کە تەریقەتی پێغەمبەرە ﷺ، دەیانگاتێو وەدەستیان دێنێ! کەواتە: دەبێ ئەهلی تەصەووف وریا بنو بزانن کە سێ جۆرە دینمان نین، یەکیان شەریعەتو یەکیان تەریقەتو یەکیان حەقیقەت، بەڵکو تەنیا هەر یەکمان هەیە کە شەریعەتەو بە دوای شەریعەت دەکەوین، بە پێی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺو دەگەینە ئەو ڕاستیو

حەقیقەتانەی کە پێغەمبەرو هاوەڵان (أصحاب)و دۆستانی خوا (أولياء الله) پێیان گەیشتوون, هەر کەسە بە ئەندازەی خۆی.

**چوارەم: گیـرۆدەبوون بە بیدعەت و چەند شێوەیەکی هاوبەش بۆ خوا دانان:**

ئەسڵی تەزکیەو پلەی ئیحسان بۆ ئەوەیە کە ئینسان تەنیا خوا بپەرستێ, وە بەو شێوەیەش بیپەرستێ کە خوا فەرموویەتی, کەچی سەیر دەکەین, لە ڕێی تەصەووفەوەو لە سۆنگەی دوورکەوتنەوەوە لە قورئانو سوننەتو بێئاگایی لە شەرع, زۆرێك لە مسوڵمانان گیرۆدەی داهێنان (إبتداع)و هاوبەش بۆ خوا دانان (الإشراك بالله) بوونە، وەك: پاڕانەوە لە مردوو, پشت بە ستن بە مردوو, چاوەڕوانی شیفا بۆ هاتن لە مردوو, کە بێگومان ئەوانە هەموویان شیرکی گەورەن, دیارە ناڵێیـن: هەرکەس وای کرد ئەوە بێ سێو دوو مو شریکەو لە دین چۆتە دەرێ, بەڵکو دەبێ بۆی ڕوون بکرێتەوەو لێی حاڵی بکرێ, وەك پێشتر باسمان کرد بەڵام ئەگەر هەر لەسەری بەردەوام بوو، پاش بەڵگە لە سەر تەواوکران (إتمام الحجة)یش، ئەوە لە بازنەی ئیسلامیش دەچێتە دەرێ.

**پێنجەم: دروستکردنی دامو دەزگای تایبەت:**

لە کوردستاندا (تەکیە) بۆ تەریقەی (قادریی), وە (خانەقا) بۆ تەریقەی (نەقشی)، ئەوەش بە هەرحاڵ ئەگەر وەك خوێندنگای شەرعی (المدرسة الشرعية) بن، کە کاتی خۆی لە مزگەوتەکاندا هەبوون, با تەکیەو خانەقاش هەبن بۆ پەروەردەو تەزکیە، بەڵام ئەگەر تەکیەو خانەقا بکرێتە جێدار (بديل) بۆ مزگەوتو، جەنابی شێخ لە خانەقاو تەکیەوە نەیەتە مزگەوتو، نوێژی بە کۆمەڵ لەگەڵ مسوڵماناندا نەکات، بێگومان ئەوە بیدعەیەو شتێکی تازە داهێنراوەو، خۆ جیاکردنەوەیە لە مسوڵمانان!

**شەشەم: کورت هەڵێنانی سەرچاوەکانی تەصەووف لە چەند کە سێك‌و چەند کتێبێکدا:**

تەصەووف ئەگەر بریتی بێت لە تەزکیەی نەفس‌و پلەی ئیحسان، ئەوە بەر لە هەموو کتێبێك لە قورئان‌و سوننەت دایە، وە هەموو زانایان هەر یەکەیان بە ئەندازەی خۆی بەشیان هەبووە لە تەزکیەو پلەی ئیحساندا، زۆر شتێکی نارەواو ناڕاستە، کە وابزانرێ مەسەلەی تەزکیەو ئیحسان لەسەر چەند کەسێکی دیاریکراوو چەند کتێب‌و سەرچاوەیەك قۆرخ کراوە! بەڵکو تەزکیەی نەفس خاڵی هاوبەشی نێوان سەرجەم مسوڵمانانە هەرکەسە بە ئەندازەی ئیمان‌و تەقوای.

**حەوتەم: هەڵەیەکی دیکەی ئەهلی تەصەووفی ئەم ڕۆژگارە ئەوەیە، کە بەکاردەهێنرێن‌و (استغلال) دەکرین لەلایەن ڕژێم‌و حیزبە عەلمانییەکانەوە:**

بەڵێ کەسانێك لە ئەهلی تەصەووف لەلایەن ڕژێم‌و حیزبە عەلمانییە دژبە دینەکانەوە دەکرێنە داردەست‌و بەکاردەهێنرێن، هەڵبەتە هەموویان نا، بەڵام خەڵکێکیان هەیە کە دونیاپەرستە، یان سادەو فەقیرحاڵ‌و نەفامە، بەگژ لایەنە ئیسلامییەکاندا دەکرێ‌و دەکرێتە داردەستێك، کە بۆ مەبەستی شووم بەکاردەهێنرێ، وەك لە بەرانبەریشدا زۆرجار ڕژێم‌و حیزبە عەلمانییەکان هەوڵ دەدەن، کە لەنێو سەلەفییەکانیشدا کە زۆر توند لەگەڵ ئەهلی تەصەووف تێك دەگیرێن کەسانێك بکەنە داردەستی خۆیان جا چ بۆ دژایەتی ئەهلی تەصەووف بە تایبەت، یان بۆ دژایەتی تەوژمی ئیسلامی بە گشتی!

ئنجا لە کۆتاییشدا بە پێویستی دەزانم ئەگەر زۆر بە کورتی‌و گوشراوییش بێ ئامـاژەیەك بە هەندێك هەڵەو پەڵەی نەیارانی تەصەووفیش بکەم.

## هەندێك هەڵەو پەڵەی نەیارانی تەصەووف بە گشتی

بەڕێزان:

خوای کاربەجێ (سبحانه وتعالى) فەرمانی پێکردووین کە دادگەر (عادل) بین و لە قسەو هەڵوێستماندا دەربارەی خەڵکی ئاگامان لە خۆمان بێت و گیرۆدەی ستەم و بێویژدانیی نەبین, وەك فەرموویەتی: ﴿...وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا...﴾(الانعام 152) واتە: وە هەر کات قسەتان کرد دادگەربن.

وە فەرموویەتی: ﴿...وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى...﴾(المائدة -8) واتە: وە با ڕق لێبوونەوەتان بۆ کۆمەڵێك وا تان لێنەکات نادادگەربن, دادگەریی بکەن ئەوە لە پارێزکارییەوە نزیکترە... هەروەها خوای تاك و پاك فەرمانی پێکردووین کە شتی خەڵکی بەکەم نەگرین و لە گەڵیان بێئینساف نەبین, وەك لەسەر زمانی (شعیب) -علیه سلام- ڕوو بە گەلەکەی فەرموویەتی: ﴿...وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ..﴾(الشعراء 183)، واتە: وە شتی خەڵك بە کەم مەگرن و خراپەکاریی لە زەویدا بڵاومەکەنەوە. جا من پێم وایە کە ئەوانەی بە گشتی نەیارو دژی ڕێڕەو (إتّجاه)ی تەصەووفن بەبێ هەڵاواردن (إستثناء)و بەبێ لە یەك جیاکردنەوەی ڕاست و چەوت و پاك و پیس، کەم و زۆر خۆیان دووچاری نادادگەریی و بێئینسافی کردوە دەرهەق بە ئەهلی تەصەووف، پێشم وایە ئەگەر لەوبارەوە گەڕابانەوە بۆ بەرهەم و کەلەپوورو ئەزموونی زانایانی پێشەوایانمان دووچاری ئەو هەڵوێستە نەدەبوون, بۆ نموونە: (ابن تیمیة) -ڕەحمەتی خوای لێبێ- هەرچەندە زۆریش دژی بیدعەت و هەڵەو پەڵەی هەندێك لە ئەهلی تەصەووف بووە، بەڵام ئەوە وای لێ نەکردوە کە لەگەڵیان بێ ئینساف بێت و لە کتێبەکانیدا ڕێزو حورمەتی زۆر دادەنێ بۆ کەسانی وەك شێخ جونەیدی بەغدادیی و عەبدولقادری گەیلانی و عەدی کوڕی

موسافیرو..هتد، وە لە (مجموع الفتاوی)کەیدا دوو بەرگی تەواوی تەرخان کردوون بۆ تویژینەوە لەبارەی تەزکیەو تەصەووفەوە بەناوی: (التصوف والسلوك)، هەروەها (إبن قیم الجوزیة)ش ڕەحمەتی خوای لیبێ بە هەمان شیوەو لە کتیبە نایابە کەی خۆی (مدارج السالکین)دا کە سێ بەرگی گەورەیەو تەرخانی کردوە بۆ تویژینەوەی بابەتی تەزکیەی نەفس, قسەو باسی نەستەقو کالاکداری زۆری پێ شەوایانی مەیدانی تەزکیەو تەصەووف نەقڵ دەکات.

ئیستاش با ئاماژەیەکی کورت بە هەندیك هەڵەوپەڵەی ئەو جۆرەکەسانە بکەین کە بە گشتیو کیوماڵ تەصەووفو ئەهلی تەصەووف ڕەت دەکەنەوە:

1- هەبوونی هەستیاریی (حساسیة)و دڕدۆنگیی بەرانبەر بە ئەهلی تەصەووفو ئەو بەرهەمو کەلەپوورەی کە شارەزاو پسپۆڕانی ئەو مەیدانە بەر هەمیان هیناوە! بۆ وینە: کتیبی (إحیاء علوم الدّین)ی ئیمام غەززالی کە بە سەرچاوەیەکی گەورەو گرنگی بابەتی تەزکیەو ئەخلاق دادەندریو خەڵکیکی زۆر لە هەموو چاخو ڕۆژگارەکاندا لیی بەهرەمەند بوون, هەر لەبەر ئەوەی چەند فەرموودەیەکی لاواز یان هەڵبەستراوو (موضوع)ی تیدان, یان لە هەندیك بواردا جۆریك لە زیدەڕۆییو تیپەڕاندن (المبالغة والافراط)ی تیدایە, بۆ نموونە: لە بواری دونیا بە کەمگرتن (زهد)دا، زۆریك لەو جۆرە کەسانە خۆیان لەو هەموو گەوهەرو مروارییانە بیبەش کردوە کە دەریای ئەو کتیبە گرنگە گرتوونیە خۆی! کە دیارە ئەوەش هەڵەیە چونکە جگە لە کتیبی خوا هیچ کتیبیکی دیکە لە هەڵە پاریزراو نابیو، بە هۆی هەبوونی چەند دانە میوەیەکی ڕزیو یان نەگەیو لە باغیکی میوەدا، کەودەنییە ئینسان خۆی لە بەرومیوەی چاکی ئەو باغە بیبەش بکاتو، بە تەئکید بابای وا بیمیوە سەر دەنیتەوە، چونکە باغیکی بیعەیب هەرگیز نادۆزیتەوە مەگەر باغەکانی بەهەشتی خوا (عزّ وجلّ)!

2- بە زۆری ئەو جۆرە کەسانە لە کاردانەوەی زۆر گرنگیی و بایەخدانی ئەهلی تەصەووف بە خواپەرستی تایبەتیی و فیکرو...هتد، خۆیان دووچاری جۆرێك لە وشکی کەمتەرخەمی لە بواری مەعنەوییدا کردوەو، ئەگەر هەندێك لە ئەهلی تەصەووف دووچاری تێپەڕاندن (إفراط) بوون، ئەوانیش گیرۆدەی دەردی بە زایەدان (تفریط) هاتوون!

3- هەڵەیەکی دیکەی ئەو جۆرەکەسانە ئەوەیە کە دێنن هەڵە کەموکووڕیی یەکانی ئەهلی تەصەووف زۆر زەق دەکەنەوەو گەورەیان دە کەن، لەولا شەوە خێرو چاکەکانیشیان ژێر لێو دەخەنو نادیدە دەگرن!

بۆ وێنە: ئەو ڕاستییە مێژوویی یە نادیدە دەگرن کە کاتی خۆی خەڵکێکی زۆری دونیا بەتایبەت شوێنە دوورە دە ستییەکانی وەك ڕۆژ هەڵاتی ئا سیاو باکووری ڕووسیاو خوارووی ئەفریقیا، لە ڕێی ڕێبازە کانی تە صەووفو پێشەوایانی تەصەووفەوە بانگەوازی ئیسلامیان پێگەیشتوەو هاتوونە نێو ئیسلامەوە! هەروەها هەر لەنێو دەوڵەتی ئیسلامیدا زۆر یێك لە پێشەوایانی تەصەووف کاریگەرییەکی گەورەیان هەبووە بۆ چاککردنو پەروەردەکردنی خەڵكو بەرەو خوا گێڕانەوەیانو لە گوناهو هەڵە پڕینگاندنەوەیان، بۆ نموونە: عەبدولقادری گەیلانی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) کە لە شاری بە غدا دانیشتوە، گوتوویەتی: دەوری پێنج هەزار (5000) کەس لە جوولەکەو نە صرانییەکانی نیشتەجێی بەغدا لەسەر دەستی مە سوڵمان بوونو زیاتر لە سەد هەزار (100000) کەس پیاوکوژو ڕێگرو داوێن پیسو شەراب خۆرو خرا پەکاریش لەسەر دەستی ئەو گەڕاوەنەوەو بوونە چاکەکارو وازیان لە خراپە هێناوە!

4- هەڵەیەکی دیکەشیان ئەوەیە کە لە جیاتی هەڵە بۆ ڕاستکردنەوەو ئامۆژگاریی و قسەی خێر، هەڵدەستن بە کافرو موشریك لە قەڵە مدانی ئەهلی تەصەووفو لە بازنەی ئیسلامو ئیمان بردنە دەریان! کە بێگومان ئەوەش چ لە

ڕووی شەرعیی و چ لە ڕووی بەرژەوەندی واقیعییەوە هەڵەو بێجێیە, وەك لە خاڵی دەیەمدا باسی دەکەین.

ئنجا لە ڕاستیدا ئازایەتیو هونەر ئەوەنیە کە بەشێکی زیاتری مسوڵمانانی ئەهلی قیبلە بەهۆی هەڵەو کەموکوڕییەکانیا نەوە لە ئیسلام بەریەدەری، بەڵکو ئازایەتیو هونەر ئەوەیە کە خەڵکی نامسوڵمان بێنیە نێو ئیسلامەوەو مسوڵمانانی لارو هەڵە ڕاست بکەیتەوە!

5- هەڵەیەکی دیکەی ئەو جۆرە کەسانەش ئەوەیە کە لەبەرانبەر ئەهلی تەصەووف و غەیری وانیشدا هەست بە خۆپەسندیی و ئیمتیاز دەکەن و پێیان وایە کە شوێنکەوتنی قورئان و سوننەت و پەیڕەویکردن لە پێشینەی چاك (السلف الصالح) شتێکە لەسەر وان تاپۆ کراوەو خەڵکی دیکە لێی بێ بەشەو سەر بەهەشە!

جا لەڕاستیدا ئەو جۆرە کەسانە لەو هەڵوێستەیاندا زۆر وەك هەندێك لە ئەهلی تەصەووف دەچن کە پێیان وایە هەر لەبەر ئەوەی ناویان (صوفي) یە لە هەموو خەڵکی خوا صافترو چاکترن و خەڵکی دیکە هەمووی لێڵ (کدِرْ)و چڵکن و کۆڵکنە! بەڵام بێگومان ناو هیچ لە نێوەڕۆك و ناگۆڕیّ و سەد ساڵ ناو لەخۆت بنێی ( صوفي) ئەگەر بە کردەوە خۆتت تەزکیە نەکردبیّ و صاف نەبووبییەوە, بایی فلسێکە, وە ئەگەر سەد ساڵ ناو لەخۆت بنێی (سلفی) بەڵام بە کردەوە شوێن پێشینی چاك نەکەوی لە عەقیدەو عیبادەت و ڕەوشت و جیهادو.. هتدیاندا بە هۆی ناوەکەتەوە هیچت پیّ نابڕیّ!

هەروەها پێویستە هەموولایەك بزانن کە پابەندیی بە قورئان و سوننەتەوەو گرتنی ڕێبازی پێشینی چاکمان لەلایەك، وە تەزکیەی نەفس و خۆ چاك و پاك و ساغ و صاف کردن لەلایەکی دیکەوە, خاڵی هاوبەشی نێوان سەرجەم مسوڵمانانن و هیچکەسیش پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتووە کە ناو لەخۆی بنیّ (سلفي) تاکو بتوانیّ

شوێنی قورئانو سوننەتو ڕێبازی سەلەفی صالح بکەوێ, یان ناو لەخۆی بنێ (صۆفی) تاکو بتوانێ تەزکیەی نەفسی خۆی بکاتو بۆ خوا ساغو صاف بێتەوە!! بە بەڵگەی ئەوە کە هاوەڵانی بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) خوا لێیان ڕازی بێ لە هەمووکەس پابەندتر بوون بە قورئانو سوننەتەوە، جگە لە (مسوڵمان)یش هیچ ناوێکی دیکەیان نەبووە, هەروەها لە هەموو کەس ساغو صافتر بوونو جگە لە ڕێبازی موحەممەد (طریقة محمد) ﷺ هیچ ڕێبازێکی دیکەیان نەگرتووەو نازناوی (صوفیو موریدو دەروێشو دێوانە)شیان نەبووە!

لە کۆتایی ئەم باسەشدا دەڵێم[1]: لە ڕاستیدا ئێمەی مسوڵمان ئەگەر وەك پێویست لە قورئانو سوننەت شارەزا بینو لە هەموو ڕوویێکەوە پێیانەوە پابەند بین, هەرچی خێرو چاکەی دونیاو دوا ڕۆژە چنگمان دەکەوێو وەك هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەریش ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ دەبینە مسوڵمانی کاملو هاوسەنگ (متزن)و, وێڕای زانیاری (علم) پارێزکاریی (تقوی)و وێڕای عیبادەت سیاسەتو، وێڕای خەم لە خەڵك خواردن، دونیا بە کەمگرتن، وێڕای ڕەوشتو ئاکاری بەرزو جوان جەنگو جیهادو سەنگەرگرتن لە دوژمنانو...هتد, لە خۆماندا دێنینەدیو لە جیاتی لاتەڵییو لاسەنگیی، گشتگیریيو هاوسەنگیی لە دینداریيو طاعەتو مسوڵمانەتییەکەماندا پەیدادەبێ!

1) ئێمە توێژینەوەی تێرو تەسەلی خۆمانمان لەبارەی تەزکیەی نەفسەوە لە کتێبی: (ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون)دا کردووە، بڕوانە: چاپی چوارەم، نووسینگەی تەفسیر.

# خاڵی دەیـــەم

# بەکافـــر دانان (التـکفیر)

بەڕێزان!

خوا پشتیوان بێ لەم خاڵی دەیەمەدا بە کورتیو پوختی ئەوەی کە بەڕاستو دروستی دەزانینو پێمان وایە هەڵوێستی زانایانی ڕەسەنی ئیسلامە، دەربارەی مەسەلەی بەکافر دانان (تکفیر) دەیخەینەڕوو:

جا سەرەتا دەڵێین:

مرۆڤی مسوڵمان دەبێ هەمیشە وریای خۆی بێ کە هەرگیز قسەی ناشیرینو لەگەڵ شەرع نەگونجاوو نەشیاوی بەدەمدا نەیەت, چونکە مسوڵمان دەبێ چاوی، دەستی, زمانی, دڵی, هەموو ئەندامە ڕواڵەتیو پەنهانەکانی خۆی کۆنترۆڵ بکات, شتێك ئەنجام نەدەنو شتێکیان لێ نەپشکوێتەوە کە پێچەوانەی شەرع بێو مایەی خەشمو تووڕەیی خوا بێت.

بگرە بابای مسوڵمان، نەك هەر دەبێ خۆی لە شتی گوناحو تاوان بپارێزێ, چ بە زمان, چ بە دڵ, چ بە چاو, چ بە باقی ئەندامەکانی, بەڵکو مسوڵمان دەبێ خۆی لە شتی پووچیش بپارێزێ، وەك خوای پەروەردگار لە مەدحی بڕوادارانـدا دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ۞ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ۞ وَالَّذِينَ

هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ۞ وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ[1]، واتە: بەڕاستی سەرفرازن ئەو بڕوادارانەی کە لە نوێژەکانیاندا زەبوونن، واتە گەورەیی و ڕێزو ترسی خوایان لە دڵ دایە ئەندامەکانیشیان ئارامن و جوو لەجووڵ ناکەن، دوای ئەوە دەفەرموێ: ئەوانەی خۆیان لە (لغو) دەپارێزن (لغو)ش هەر قسەیەك و هەر کردەوەیەکە کە پاداشتی نەبێ, با گوناهیش نەبێ, واتە شتی پووچ و بێسوود, دوای ئەوە دەفەرموێ ئەوانەی هەمیشە خەریکی تەزکیەن، لێرەدا وشەی (زکاة) مەبەست پێی زەکاتی ماڵ نیە, بەڵکو بە واتای تەزکیە بوون چاك بوون و پاك بوون دێت.

بەڵێ مسوڵمان دەبێ وریابێ و شتێك نەڵێ و شتێك نەکات, کە نەك هەر ناشەرعی بێ, بەڵکو هەر شتێك سوودو کەڵکیشی نەبێ دەبێ خۆی لێ بپارێزێ، چ جای وشەی بەکافر دانان و بە فاسق دانان و بە گوناهبار دانانی خەڵك, بێگومان ئەوە شتێکی زۆر گەورەیە, چونکە لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە فەرموویەتی: (سِبابُ المسلم فسُوق وقتالُهُ كُفر)[2], واتە: جنێودان بە مسوڵمان فیسقە و جەنگ لە دژکردنیشی کوفرە، جا لەبەر ئەوەی ئێمە لە بەرگی یەکەمی ئەم زنجیرە دەرسەدا بە درێژی باسی ئەوەمان کردوە کە مەترسی و گوناح و خراپەی بەکافر دانانی خەڵك بەبێ بەڵگەی شەرعی چەندە گەورەیە, لێرەدا ناگەڕێینەوە سەری و حەواڵەی وێتان دەکەمەوە.

ئێستاش با بێینە سەر دەقی بابەتەکەمان, کە خوا پشتیوان بێ لەم سێ خاڵەدا دەیخەینە ڕوو:

---

1) (المؤمنون: 1-4).

2) متفق عليه عن ابن مسعود رضي الله عنه, البخاري برقم: 48, ومسلم برقم: 116.

## 1- پێناسەی (كفر).

### أ- لە ڕووی زمانەوانییەوە:

وشەی (كفر) لە زمانی عەرەبیدا بەم شێوەیە پێناسە كراوە، (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (الكفر في اللغة: سَتْرُ الشَّيء, وَوُصِفَ اللَّيلُ بالـ كافر لـ سَتْرِها الأ شخاص, والزّراع, كما قال تعالى: ﴿كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ﴾ (الحديد 20)، لِـ سَتْرِه البَذْر في الأرض, وكفر النعْمة و كُفرانُها سَتْرُها بِتَرْك أداءِ شُكْرِها, و قال تـ عالى: ﴿فَلا كُفْرَانَ لِسَعْيِهِ﴾ (الانبياء- 94)[1] پوختەی مانای قسەكەی ئەوەیە كە وشەی (كفر) لە ئەسڵی زمانی عەرەبییدا بە واتای ( ستر) داپۆشین دێت, پەردە بەسەردادانی شتێك, وشەی (لیل) شەوگار, لە زمانی عەرەبیدا بە ( كافر) ناوی هاتوە, چونكە خەڵكی دادەپۆشێ، وە (زراع)یش جوتیار كـ شتوكاڵ دا چێن, لە قورئاندا بە (كفار) هاتوە, چونكە ئەویش دانەوێڵە لە زەویدا دەچێنێ و تێیدا دەشارێتەوە, وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ﴾، واتە: وەك بارانێك كە جووتیارەكان بە ڕووەكەكەی سەر سام دەبن و زۆری پێ دڵخۆشن. وە بۆیەش دەگوترێ (كفران النعمة), چونكە ئەو كەسەی كە سپڵەیە بەرامبەر بە چاكەی خوا, یان چاكەی خەڵك, وەك ئەوە وایە كە نیعمەتەكەی داپۆشیبێ و لەبیری بردبێتەوەو پەردەیەكی بەسەر دادابێ و وەك ئەوە كە هەر چاكەی لەگەڵدا نەكرابێ!

### ب- لە ڕووی شەرعەوە :

لە زاراوەی شەرعیشدا, دیسان (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (الكفر نقيض الا يمان وأعظم الكفر جُحود الوحدانية, او الشريعة, أو النبوة, والكفران في جحود النعمة

---

1) مفردات ألفاظ القرآن، لراغب الاصفهاني، ل 714 .

أكثر استعمالاً, والكفر في الدين أكثر, والكفور فيهما جميعاً, قال تعالى: ﴿فَأَبَى الظَّالِمُونَ إِلاَّ كُفُورًا﴾(الاسراء -99)، وقال تعالى: ﴿فَأَبَى أَكْثَرُ النَّاسِ إِلاَّ كُفُورًا﴾(الفرقان -50)، ويُقال فيهما: كَفَر فهو كافرٌ, قال تعالى في الكفران: ﴿لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ﴾ (النمل -40), والكافر على الاطلاق: متعارفٌ في مَنْ يَجْحَدُ الوحدانية, أو النبوّة, أو الشريعة, أو ثلاثتهم)[1]، هەروەها (ابن منظور)یش هەر بە هەمان شێوە پێناسەی وشەی (كفر) دەكات لە ڕووی شەرعەوە كە دەڵێ: (و قال اللّيث: إنّما سُميَ الكافِرَ لأنَّ الكفر غَطّى قَلْبَهُ كُلَّه, وقيل: لما دعاه الله الى توحيده فقد دعاه الى نِعمته وأحبَّها لَهُ اذا أجابه الى ما دعاه اليه, فلما أبى ما دعاه اليه من توحيده كان كافراً نعمة الله, أي مُغَطّياً لها بأبائِهِ حاجباً لها عنه)[2].

پوختەی مانای قسەی ئەم دوو زانا پایە بەرزە خوا لێیان خۆش بێ ئەوەیە كە دەڵێن: (كفر) لە زاراوی شەرعدا پێچەوانەی ئیمانە, (وە گەورەترین جۆری كوفر بریتیە لە دان پێدانەهێنانی یەكتایی خوا, یان دان نەهێنان بە شەریعەتی خوادا, بە هەمووی, یان بە بەشێكی)[3] وە دان نەهێنان بە پێغەمبەرایەتی (یەكێك یان زیاتر لە پێغەمبەران) علیهم الصلاة والسلام)دا وە وشەی (كفران) زیاتر بۆ سپڵەیی بەرامبەر بە نازو نیعمەتەكان بەكاردەهێنرێن, وشەی (كفر)یش زیاتر لە كوفری دینیدا كوفر بەرامبەر بە خوا بەڵام وشەی (كفور) بۆ هەردووكیان بەكاردێ, وەك خوای بەرزو مەزن دە فەرموێ: ﴿فَأَبَى الظَّالِمُونَ إِلاَّ كُفُورًا﴾، واتە: ستەمكارەكان ڕازی نەبوونو هەر كوفریان كرد, كە دەگونجێ هەم بە مانای بێبڕوایی بێتو هەم بە مانای سپڵەییو ناسوپاسییش.

---

1) مفردات ألفاظ القرآن، لراغب الاصفهاني، ل 714-715.

2) لسان العرب، لابن منظور، بەرگی2، ل 118 122.

3) ئەوەی نێوان دوو كەوانەكە هی خۆمە بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست.

وە کە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿فَأَبَى أَكْثَرُ النَّاسِ إِلاَّ كُفُورًا﴾، واتە: زۆر بەی خەڵکی هەر (کفور)یان هەڵبژارد, ئەوەش دەگونجێ بە مانای بێبڕوایی بێت, یاخود بە مانای سپڵەیی‌و ناسوپاسی.

وە بۆ هەردووکشیان دەگوترێ: (کفر), کە هەم بە مانای بێبڕوایی دێت‌و هەم بە مانای سپڵەیی‌و ناسوپاسی (کفران النعمة) دێت, وەکو خوای بەرز لەسەر زمانی (سلیمان) -علیه السلام- دەفەرموێ: ﴿لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ﴾(النمل-40)، دوای ئەوەی کە عەرشی شاژنی (سبأ)یان بۆ هێنا فەرمووی: ئەوە بەخشش‌و نیعمەتی خوایە لەسەر من, بۆ ئەوەی تاقیم بکاتەوە, ئایا سوپاسی دەکەم‌و بە چاکەو نیعمەتەکەی دەزانم, یاخود (بە پێچەوانەوە) سپڵەو ناسوپاس‌و بێوەفا دەبم! هەر کە سێکیش سوپا سی خوا بکات‌و (چاکەی خوای لەبەرچاو بێ) بە قازانجی خۆی تەواو دەبێ, وە کە سێکیش سپڵەو پێنەزان بێ, خۆی زەرەر دەکا, بێگومان پەروەردگارم بێ نیازو بەخشندەیە.

بەڵام وشەی (کافر) ئەگەر بە ڕەهایی لە دەقەکانی قورئان‌و سوننەتدا بەکاربێ, مەبەست پێی کەسێکە بێبڕوا بێت, واتە: کوفری عەقیدەیی هەبێ, جا چ بڕوای بە یەکتایی خوا نەبێ, چ بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) یەکێکیان یان زیاتر, وە چ بڕوای بە شەریعەتی خوا نەبێ بە هەمووی یان بە بەشێکی‌و نکوولیی لێبکات، بۆیەش بێبڕوا (کافر) ئەو ناوەی لێنراوە, چونکە (کفر) دڵی دادەپۆشێ، یان لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو نیعمەتی ئیمانەی کە خوا بانگی کردوە وەری بگرێ، بابای (کافر) ئەو نیعمەتە وەرناگرێ‌و دایدەپۆشێ.

ئەوە بە کورتی پێناسەی کوفر (کُفر) بوو, هەم لە ئەسڵی زمانی عەرەبیداو هەم لە ڕوانگەی شەرع و لە زاراوی شەرعدا.

## 2- جۆرەكـانی كوفـر:

(كفر) بە گشتی دوو بەشە: كوفری گەورەو كوفری بچووك.

كوفری گەورە, زانایان چەند ناوێكیان بۆ بەكارهێناون كە ئەمانەن: (الكفر الأكبر, الكفر الاعتقادي, الكفر البواح, الكفر المُخْرِجُ مِن المِلَّة) واتە: كوفری گەورە, كوفری عەقیدەیی, كوفری ئاشكرا, كوفرێك كە ئینسان لە بازنەی ئیمان و ڕێبازی ئیسلامەتی دەباتە دەرێ.

هەروەها بۆ كوفری گچكەش چەند ناوێكیان بەكارهێناون كە ئەمانەن (الكفر الأصغر، الكفر العملي, كفر دون كفر, كفر النعمة) واتە: كوفری بچووك, كوفری كردەیی, كوفری بچووكتر لە كوفری گەورەو كوفری خوار كوفر, كوفری نازو نیعمەت.

### أ- كوفـری گچكـە (الكفر الأصغر):

بریتیە لە هەر قسەو ڕەفتارێك كە شەرع ناوی لێ ناوە (كفر), لەبەرئەوەی ئەو قسەو ڕەفتارە لە مسوڵمان ناوەشێتەوەو قسەو ڕەفتاری كافرانە، ئەگەرنا كوفری گچكە بە مانا باوەكەی كوفر كوفر نیەو مرۆڤی مسوڵمان لە بازنەی ئیسلام و ئیمان ناباتە دەرێ.

جا خوای پەروەردگار وشەی (كفر)ی كە لە قورئاندا بەكارهێناوە بە زۆری بە مانا ڕەها (مطلق)یەكەی بەكاریهێناوە كە كوفری گەورەیەو، مەبەست ئەوەیە كە ئەو شتە كوفرەو ئەو كەسە بێبڕواو كافرو بێدینە, بەڵام هەندێك جاریش خوای بەرزو بێوێنە، وشەی (كفر)ی بە مانای كوفری نیعمەت بەكارهێناوە, وەك پێش تر نموونەمان بۆ هێنایەوە.

بەڵام لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ وشـەی (كفر) زۆرجار بۆ كوفری بچووك

بەکارهاتوە, بۆ وێنە:

1- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (سباب المسلم فسوق وقتاله كفر)[1]، واتە: جنێودان بە مسوڵمان فیسقە, وە جەنگ لەگەڵداکردنی (كفر)ە.

ئنجا بەچی دەزانین کە لێرەدا وشەی (كفر) مەبەست پێی کوفری بچووکە؟!

بە بەڵگەی ئەم ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا...﴾(الحجرات 9), واتە: ئەگەر دوو کۆمەڵ لە بڕواداران بە یەکەوە جەنگیان کرد, کەواتە جەنگ دەکەن بە یەکەوەو یەکدی دەکوژن ناویشی ناون بڕوادار! لێرەشدا کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: جەنگ لەگەڵداکردنی مسوڵمان کوفر (كفر)ە, واتە: کوفری بچووکەو سیفەتی کافرانە چونکە بە زۆری کافر بەیەکەوە جەنگ دەکەن و یەکدی دەکوژن و خوێنی یەکدی دەڕێژن, بەڵام مسوڵمانان نەك هەر نابێ خوێنی یەکدی بڕێژن, بەڵکو دەبێ زمانیشیان بەرامبەر بەیەکدی بپارێزن.

2- لە فەرموودەیەکی دیکەدا فەرموویەتی: (إِثْنَتان في الناس هما بهم كُفْرٌ, الطَّعْنُ في النسَّبِ والنياحة على الميِّت)[2]، واتە: دوو سیفەت لەنێو خەڵکدا کوفرن, تانەدان لە ڕەچەڵەکی یەکتری, وە شین گێڕان لە سەر مردوو وە پێهەڵاگوتنی، لێرەشدا پێغەمبەر ﷺ ئەو دووانەی بە (كفر) داناون, بەڵام بە چەندین بەڵگە, ئێمە دەزانین کە مەبەست پێی کوفری بچووك و سیفەتی کافرانە, واتە ئەو دوو سیفەتانە شایستەی ئەهلی کوفرو نیفاق و شیرکن, نەك شایستەی ئەهلی ئیمان و ئیسلام.

3- وە لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە: (من أتى حائضاً, أو امرأةً في دُبُرِها, أو كاهناً فصدقة بما يقول, فقد كفر بما أنزل على مُحَمَّدٍ)[3]، واتە: هەر کە سێك

---

1) متفق عليه عن ابن مسعود رضي الله عنه.

2) رواه مسلم عن أبى هريرة -رضي الله عنه, برقم 121،(67).

3) رواه ابو داود والترمذي وابن ماجه وصححه الألباني في آداب الزفاف.

بچێتە لای هاوسەری خۆی لە کاتێکدا کە لە حەیزدایە, یان لە پاشت (واتە لە کۆم)یەوە بچێتە لای یاخود بچێتە لای فاڵچی (کاهن)ێك, پرسی پێبکات‌و بەڕاستی بزانێ لە وەڵامەکەیدا, ئەوە کوفری کردوە بەوەی کە نێرراوەتە خوار بۆ سەر (محمد) ﷺ.

دیارە هەرکام لە: چوونە لای ئافرەتی حەیزدارو لەپشتەوە لەگەڵ ئافرەت جووت بوون, وە چوونە لای فاڵچی‌و پرس پێکردنی‌و، پاشان بەڕاست زانینی, تەنیا گوناهی گەورەن‌و هیچیان ئینسانیان پێ کافر نابێ, فەرموودەکەش مەبەست پێی ئەوەیە، کە هەر کام لەو سێیانە کردەوەو ئاکاری کافرانن.

ئنجا کوفری نیعمەتیش (كفران النعمة) دوو جۆری هەیە: بە زۆری بە واتای بێوەفایی‌و سپڵەیی‌و ناسوپاسی دێ، کە کوفری بچووك‌و گوناهی گەورەیە, بەڵام جاری واش هەیە (كفران النعمة) بە کوفری گەورە دادەنرێ, وەك ئەوە خوا نیعمەت بە ئینسانێك بدات، کەچی ئەو کەسە سوپاسی خوا نەکات‌و سپڵەو پێنەزان بێ‌و نیعمەتەکەی خوا لە ڕەزامەندیی خوا بەکارنەهێنی، ئەوە گوناهی گەورەیە, بەڵام ئەگەر خوا نیعمەتێکی پێبدات بڵێ نیعمەتەکە هی خۆمەو بۆخۆم پەیدام کردوەو خوا پێی نەدوام!! ئەوە بێگومان ئەو ڕەفتارە کوفری گەورەیەو ئینسانی پێ کافر دەبێ, بە بەڵگەی ئەو چەند ئایەتانەی، کە لە سووڕەتی (القصص 78-82)دا دەربارەی (قاڕوون) هاتوون, قاڕوونیش کابرایەکی زۆر دەوڵەمەند بووەو، تەنانەت کلیلی دەرگای خەزێنەکانی بە زەحمەت بە چەند پیاوێکی بەهێز هەڵگیراون, وەك ئایەتەکان باس دەکەن، بەڵام کاتێك گەلەکەی ئامۆژگاری دەکەن, لە وەڵامیاندا دەڵێ: ﴿....إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي...﴾[1]، واتە: ئەو پارەو سامان‌و نیعمەت‌و دەوڵەمەندیی‌یە بەس بەهۆی زانیاری خۆمەوە پەیدام کردوە (و خوا نەیداومێ!)، جا دیارە ئەوە کوفری گەورەیە, چونکە لە کۆتایی ئایەتەکاندا خوا

1) (القصص 78) .

فەرموویەتی: ﴿...وَيْكَأَنَّهُ لا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ﴾[1]، واتە: خوا (قاروون)ی بەکافر داناوە، لەبەر ئەوەی کە نیعمەتو بەخششی خوای بەهی خۆی داناوە، نەیگێڕاوەتەوە بۆ لای خوا (سبحانه وتعالى).

کەواتە: ڕاستە جاری واش هەیە سپڵەییو بێوەفایی بەرانبەر خواو چاکەو نیعمەتەکانی دەبێتە کوفری گەورە. ئەوە بەکورتی لەبارەی کوفری گچکەوە.

## ب- کوفری گەورە (الكفر الاكبر):

بەڕێزان! من دوای ئەوەی سەرنجی قورئانو سوننەتو گەلێك کتێبمدا توانیم حەڤدە (17) جۆر کوفری گەورە سەرژمێر بکەم, کە لە هیچ کتێبێکدا نەمبینوە ئەوەندە بەیەکەوە سەرژمێر بکرێن, بۆیەش بەوکارە هەڵسام, چونکە مورجیئە (المرجئة) کە بەداخەوە هەندێ لە زانایانی گەورەی ئەم ڕۆژگارەش لەم مەسەلەیەدا کەمو زۆر لەژێر کاریگەریی فیکری (المرجئة) دان, (المرجئة) بنچینەیەکیان داناوە, دەڵێن: (ولا يخرج العبد من الايمان الا بجحود ما أدخله فيه)[2]، واتە: بەندە لە بازنەی ئیمان ناچێتە دەرێ مەگەر بەهۆی دان پێدانەهێنانی ئەو شتانەی کە پێیان چۆتە نێو ئیمانەوە[3]، ﴿وەك دان هێنان بە یەکتایی خوا (عزّو جلّ)و بە ناوو سیفەتەکانیو بە پێغەمبەرایەتی (محمد) ﷺ و بە ڕاستییەتی دینو شەریعەتی خواو بە ڕۆژی دوایی, بە فریشتەکانو بە بوونی (جن), بە کتێبەکانی خواو بە پێغەمبەرانیو بە قەزاو قەدەر,...هتد دا﴾، واتە مەگەر دان بە یەکێك لەو شتانەدا نەهێنێ کە پێیان بۆتە مسوڵمان, ئەگەرنا بە هیچ شتێکی دیکە کافر نابێت!!

جا ئەوە کە باسکرا بنچینە (قاعدة)یەکە زۆرێك لە خەڵکی لە سەر ئەو بنچینەیە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دیاردەی کوفرو کافربوونی خەڵكو لە دین

1) (القصص- 82).

2) متن العقيدة الطحاوية .

2) ئەوەی نێوان دووکەوانەکە خۆم زیادم کردوە بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست .

دەرچوونی خەڵکدا کردوە, یەکێك لەوانە زانای پایەبەرزی فەرمووده‌ناس (مُحَدِّثْ), (الشیخ نا صرالدین الال بانی) یە کە خز مەتێکی زۆری لە بواری زانیاری فەرموودەناسیدا کردوە, بەڵام بەڕاستی لەو مەسەلەیەدا بەهەڵەدا چووە کە لە زۆر کتێبو کاسێتدا داکۆکی لەسەر ئەوە کردوە کە ئینسان تەنیا بە دان پێدا نەهێنان (جحود) کافر دەبێ! بەڵام ئێمە با سەرنجی چەند ئایەتێکی قورئان بدەین، تاکو وەك ڕۆژی ڕوون بۆمان ئاشکرا بێ کە کوفری دان پێدا نەهێنان (کفر الجحود) جۆرێکە لە حەڤدە (17) جۆری کوفر کە ئینسانیان پێ لە دین دەردە چێو کافر دەبێ, یان پێیان لە حاڵەتی کافر بووندا دەمێنێتەوە:

## جۆری یەکەم: (كفر الأنكار):

واتە: کوفری نکوولیی لێکردنو نەچوونە ژێربار، کە بریتییە لە دان پێدانەهێنان بە دڵو زمان, وەك مولحیدەکان (الملاحدة), خوای بەرزو بێوێنە لەبارەی ئەو جۆرە کوفرەوە فەرمووویەتی: ﴿يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ﴾(النحل 83), واتە: چاکەو نیعمەتی خوا دەزانن، بەڵام نکوولیی لێدەکەن وە زۆربەیان کافرن.

## جۆری دووەم: كفر العنـــاد):

(عناد)یش وەك (راغب الاصفهانی) گوتوویەتی[1] بریتییە لەوەی کە ئینسان سەرسام (معجب) بێ بەوەی، کە لەسەریەتیو خۆی پێوە هەڵکێشێو شانازی پێوە بکات, کەواتە: کافری (عنید) یان (معاند) ئەو کافرەیە، کە بە کوفرەکەی سەرسامەو خۆی پێوە بادەداتو شانازیی پێوە دەکات, خوای باڵادەستو زاڵ فەرموویەتی: ﴿أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ﴾(ق 24), واتە بخەنە نێو دۆزەخەوە هەر کافرێکی لە کوفردا ڕۆچووی خۆهەڵکێشەری شانازیکەر...، هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيدًا﴾(المدثر 16)، واتە: ئەو(کافر)ە لە

1) بڕوانە، (مفردات الفاظ القرآن)، ص590، لفظ (عند) .

بەرامبەر ئایەتەکانماندا کافرو خۆهەڵکێشەرو شانازیکەر بوو.

## جۆری سێیەم: (کفر الجحـــود):

(جحود) واتە: زانینی بە عەقڵ‌و دڵ‌و دان پێدانەهێنان‌و پێ لێنەنانی بە زمان، کابرا دەزانێ خوا هەقە، پێغەمبەر هەقە، دین‌و شەرعی خوا هەقە، بەڵام بە زمان دانی پێداناهێنێ، وەك خوای زاڵ‌و کاربەجێ دەربارەی دارو دەستەی فیرعەون (آل فرعون) فەرموویەتی: ﴿وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا....﴾[1]، واتە: بە زمان دانیان بە موعجیزەکانی مووسادا (علیه السلام) نەهێنا، هەرچەندە دڵیان یەقینی هەبوو کە ڕاستەو هەقەو لە خواوەیە.

## جۆری چوارەم: (کفر الکبـر):-

(الکبر) واتە: خۆ بەزلگریی، ئەمیش لە کوفری عینادییەوە نزیکە، بەڵام خاوەنەکەی لەبەر خۆ بەزلگریی‌و خۆ پێ گەورەبوون حەق قبووڵ ناکات، وەك خوای زاناو توانا دەربارەی ئیبلیس فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾[2]، واتە: وە کاتێك بە فریشتەکانمان گوت کڕنووش (کڕنووشی ڕێز) بۆ ئادەم بەرن، یەکسەر کڕنووشیان برد جگە لە (ئیبلیس)، ڕازی نەبوو، وە خۆی بە زل گرت‌و چووە ڕیزی کافرانەوە. دیارە ڕەتکردنەوەی فەرمانی خواش لەبەر خۆ بە زلگریی کوفرە.

## جۆری پێنجەم: (کفر النفاق):

کوفری نیفاقیش بریتیە لە دان پێداهێنانی زمان (إقرار اللسان)، بەڵام بەبێ بڕوا پێهێنانی بە دڵ، وەکە خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ

1) (النمل -14).
2) (البقرة -34).

﴿مِنَ النَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا﴾[1]، واتە: دەغەڵەکان (منافقین) لە تەختی هەرە ژێرەوەی دۆزەخ دان, وە هیچ پشتیوانیێکیشت دەست ناکەوێ بۆیان.

## جۆری شەشەم: (كُفر الكُره, أو الكَرْه أو الكراهية):

ئەم جۆرە کوفرەش بریتیە لەوەی کە ئینسان ڕق لیێبوونەوەو بوغزی لە دڵ دا بێ بەرانبەر شتێك لەو شتانەی خوا ناردوویەتی, وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾[2]، واتە: ئەوانە بۆیە کافربوون, چونکە ڕقیان هەڵسا لەوەی کە خوا ناردوویەتە خوارێ.

## جۆری حەوتەم: (كُفْر الاستهزاء):

ئەم جۆرە کوفرەش بریتییە لەوە کە ئینسان بە چاوی سووك تەماشای خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ و ئایینەکەی بکاتو گاڵتەیان پێ بکات, وەك خوای تۆڵەستێن فەرموویەتی: ﴿.... قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ۞ لاَ تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾[3]، واتە: ئایا گاڵتە بە خواو ئایەتەکانی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن! بیانوو مەهێننەوە, ئەگەر ئیمانیشتان هەبووبێ خۆتان کافر کردوە.

## جۆری هەشتەم: (كفر الأستحلال أو التحريم):

ئەم جۆرە کوفرەش بریتیە لەوە کە کەسێك هەڵسێ بە حەلاڵکردنی شتێك، کە خوا (عزّ وجلّ) حەرامی کردوە, یان بە حەرام دانانی شتێك، کە خوا حەلاڵی کردوە, چونکە ئەگەر بە نەزانییو بە تەئویل نەبێ بە هەردووکیان ئینسان کافر دەبێ, وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: ((عن عدي بن حاتم قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ

1) ( النساء- 145 ) .
2) ( محمـد- 9 ) .
3) ( التوبة: 65-66 ) .

وفي عُنُقي صَليبٌ من ذَهَبٍ, فقال: ياعدي أخْرَج هذا الوَثَنَ من عُنُقِكَ: فـ قرأ هذه الآية: ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ﴾، قال: قلت يا رسول الله: إنْ كناّ نَعْبُدهُم! فقال: ألَيْسَ يُحَرّمون ما أحلَّ الله فَتُحرِّمونهُ ويُحلّون ما حرَّم الله فَتُحلِّونَهُ؟! قال: قلت: بلى. قال: فتلكَ عِبادَتُهُم))[1]، واتە: عەدی کوڕی حاتەم دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەر ﷺ خاچێکی زێڕم لە گەردن دابوو, فەرمووی: ئەی عەدی ئەو بتە لەملت دارنەو فڕێی بدە, ئنجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَـهًا وَاحِدًا﴾، واتە: جوولەکەو نەصرانییەکان زاناو ڕاهیبەکانی خۆیان لە جیاتی خواو لەگەڵ خوا کردن بە پەروەردگار, هەرچەندە فەرمانیشیان پێ نەکرابوو، کە جگە لە یەك پەرستراو بپەرستن، (عدي) دەڵێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەماندەپەرستن, پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەدی حەڵاڵیان لێ حەرام نەدەکردن‌و حەرامیشیان بۆ حەڵاڵ نەدەکردن‌و ئێوەش شوێنیان نەدەکەوتن؟ دەڵێ گوتم: با, فەرمووی: دەجا ئا ئەوە پەرستنیانە. بەڵێ حەڵاڵکردنی حەرامێك‌و حەرامکردنی حەڵاڵێك کوفرە, کەسێکیش لەوەدا شوێنیان بکەوێ بێگومان کافردەبێ.

## جۆری نۆیـــەم: (كفر الأعراض):

واتە: کوفری پشت تێکردن‌و پشت هەڵکردن, وەك خوای بەرز لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ...﴾[2]، واتە: کێ ستەمکارترە لەو کەسەی کە ئایەتەکانی پەروەردگاری وەبیرهێنرانەوە (و بۆی خوێنرانەوە) کەچی پشتی تێکردن‌و لە بیری چۆوە چی کردوەو (بۆ قیامەتی پێشی خستوە) مەبەست لەو جۆرە کوفرەش ئەوەیە کە سێك لە دینی خوا تێنەگەیشتبێ‌و ئامادەش نەبێ گوێ بگرێ‌و حاڵی ببێ‌و هەر لـــە

1) رواه الطبري, بڕوانە (جامع البيان) ج10، ص120, رقم 16559.
2) ( الكهف -57 ).

نەزانیی‌و بێئاگایی خۆیدا بمێنێتەوە.

**جۆری دەیەم: (كفر الشـك):**

واتە: كوفری دوودڵیی‌و گومان، وەك خوای بێوێنە فەرموویەتی: (﴿**بَلْ هُمْ فِي شَـكٍّ مِّن ذِكْرِي بَلْ لَّمَّا يَذُوقُوا عَذَابِ**﴾[1]، واتە: بەڵكو ئەوان (كافرەكان) دوو دڵن سەبارەت بە بەرنامەو قورئانی من، بەڵكو تا ئێستا سزای سەختی منیان نەچێشتوە (بۆیە وا بێمنەت‌و بێترس‌و باكن).

**جۆری یازدەیەم: (كفر الشـرك):**

واتە: كوفری هاوبەش بۆ خوا دانان لە یەكێك لە بەدیهێنەرایەتی‌و پەروەردگاریێتی‌و ناوو سیفەتەكانی‌و پەرستراوێتیدا، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿**إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ**﴾[2]، واتە: خوا لەوە نابوورێ كە هاوبەشی بۆ دابنرێ، (كە هەر جۆرە هاوبەش دانانێك دەگرێتەوە).

**جۆری دوازدەیەم: (كفر الطَّعـــن):**

واتە: كوفری تانەوتەشەر لێدان‌و ڕەخنەو توانج گرتن لە ئیسلام، وەك خوا فەرموویەتی: (**وَإِن نَّكَثُواْ أَيْمَانَهُم مِّن بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُواْ أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لاَ أَيْمَانَ لَهُمْ** ﴾[3]، واتە: ئەگەر (كافرەكان) پەیمانەكەیان هەڵوەشاندەوە دوای ئەوەی كە پەیمانیان لەگەڵ ئێوە بەستبوو، وە ڕەخنەیان گرت‌و تانەیان لە دینی ئێوەدا، ئێوە جەنگ بكەن لەگەڵ سەرانی كوفردا، چونكە بەڵێن‌و پەیمانیان نیە.

---

1) ( ص -8 ).
2) ( النساء- 47 ) .
3) ( التوبـة- 12 ).

## جۆری سێزدەیەم: (كفر الموالاة):

واتە: كوفری دۆستایەتی كردن, كە مەبەست پێی دۆ ستایەتی كرد نی ئەهلی كوفرە بە شێوەیەكی ڕەها واتە: (الموالاة المطلقة) كە خۆشویستنی دڵو قسەی زمانو كردەوەی ڕواڵەتی دەگرێتەوە, خوا (عزّو جلّ) فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ﴾[1]، واتە: ئەی بڕوادارینە! جوولەكەو گاوران مەگرن بە دۆستو پشتیوان, هەندێكیان دۆستو پشتیوانی هەندێكیانن, وە هەركەسێك لە ئێوە دۆ ستایەتییان بكاتو پشتیان بگرێ ئەوە لەوانە (واتە: وەك ئەوان حسابی بۆ دەكرێ).

## جۆری چواردەیەم: (كفر الاطاعة)

واتە: كوفری گوێڕایەڵیی و فەرمانبەرێتی بۆكردنی ئەهلی كوفر لە شتێكدا كە ناشەرعیی یە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَلاَ تَأْكُلُواْ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ﴾[2]، واتە: وە لە گۆشتی ئەو سەربڕاوە كە ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە مەخۆن، وە ئەگەر بێتو بە قسەی كافرەكان بكەن (لەوەدا كە گۆشتی سەربڕاویان بخۆن) ئەوە ئێوەش دەبنە هاوبەش پەیداكەر (مشرك)! (كەواتە لەهەر شتێكدا كە ناشەرعی بێو بەقسەیان بكەن هەر وایە).

## جۆری پازدەیەم: (كفر عدم الحكم بـما أنزل الله):

واتە: كوفری حوكم نەكردن بەوە كە خوا ناردوویەتە خوارێ كە قورئانو سوننەتە, وەك خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿...وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا

---

1) (المائدة -51).
2) (الأنعام 121)

أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾[1]، واتە: وە کەسێك حوکم نەکات بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوارێ ئەوانە کافرن[2].

## جۆری شازدەیەم: (كفر التحاكم الى الطاغوت):

مەبەست لەم جۆرە کوفرەش ئەوەیە کە کەسێك بۆ دادوەریی یان بۆ چارەسەری کێشەوگرفتو دەمەقاڵێیەك پەنا بۆ تاغووتێك بەرێ، کە ئەو بە پێی بەرنامەو ئارەزووی خۆی کێشەکەی بۆ چارەسەر بکات، وەك خوا فەرموویەتی:﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾ (النساء: 60)، واتە: ئایا تەماشای ئەوانە ناکەی کە پێیان وایە ئیمانیان بەوە هێناوە کە بۆ تۆ نێرراوەتە خوارێو وە بەوەش کە پێش تۆ نێرراوەتە خوارێ, کەچی دەیانەوێ دادوەرییان بەرنە لای تاغووت هەرچەندە فەرمانیشیان پێکراوە کە کوفری پێبکەن! وە شەیتانیش دەیەوێ بە گومڕاییەکی دوور گومڕایان بکات.

## جۆری حەڤدەیەم: (كفر ترك الصلاة) أو (كفر ترك اصل العمل):

نوێژنەکردنی یەکجارەکیش, یاخود نەبوونی ئەسڵی کردەوەش، جۆرێکی دیکەیە لە جۆرەکانی کوفر، ئینسان دەبێ ئەسڵی کردەوەی تێدا بێت, ئەگەرنا بە مسوڵمان لە قەڵەم نادرێ, چونکە یەکێك لە چوار پێکهێنەرەکانی ئیمان بریتیە لە کردەوەی ئەندامەکان, بەڵام نەك هەموو کردەوەیەك وەك خەواریجو موعتەزیلە دەیانگوت, وە نەك وازهێنان لە جینسی کردەوەش وەك مورجیئە دەیانگوت.

---

1) (المائدة- 44 ).

2) ئەو مەسەلەیەمان لە بەرگی چوارەمداو لەکاتی باسی ئیمان بە کتێبەکانی خوادا باش توێژیوەتەوە.

جا زۆربەی هەرە زۆری زانایانی پێشین لەسەر ئەوە یەك دەنگن, كە بەڵای كەمەوە نوێژكردن مەرجە بۆ ئەوەی كە ئینسان بە ئیماندار لە قەڵەم بدرێ، وەك پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر) (رواه أحمد والنسائي والترمذي وصححه وكذلك صحَّحهُ الحاكم والألباني)، واتە: ئەو پەیمانەی لە نێوان ئێمەی مسوڵمانو ئەوان (ی كافر) دایە نوێژە, بۆیە هەر كەسێك وازی لێبێنێ ئەوە كافر بووە، وە فەرموویەتی: (ان بين الرجل و بين الكفر والشرك ترك الصلاة) (رواه مسلم عن جابر بن عبدالله)، واتە: بێگومان لە نێوان ئینسانو كوفرو شیركدا وازهێنانە لە نوێژ.

## 3 چۆنوکەی دەتوانین حوکمی کافربوون بەسەر خەڵکیدا بدەین؟!

لەوبارەوە سێ ڕاوبۆچوون هەن, کە یەکیان تێیی پەڕاندوەو یەکیان کورتی هێناوەو یەکیشیان پێکاویەتیو لە نیشانەی داوە.

جا ئەوانەی کە تێیان پەڕاندوە خەواریجن, ( خەواریج) کاتی خۆی هەبوونو ئێستاش کەسانێك هەن کەمو زۆر لەسەر فیکرو بۆچوونی وانو لە هەر کە سێکدا (کفر)ێکیان بینی یان (شرك)ێکیان بینی لەوانەی باسمان کردن بگرە هەندێك جار ئەو شتە کوفریش نیە-, یەکسەر دەڵێن: ئەوە کافرە بەبێ ئەوەی تەماشا بکەن ئایا ئەو کەسە مەرجەکانی کافر بوونو موشریك بوونی تێدا هاتوونە دی یان نا؟! وە ئایا پەرچەکانی (موانع)ی کافر بوونو موشریك بوون لا چوون یان نا؟! بەبێ لێکۆڵینەوە یەکسەر دەڵێن: کافرە.

جا دیارە ئەوە تێپەڕاندنە لە خەڵك بە کافر دانانو خەڵك لە دین بردنە دەرەوەدا، بەرانبەرەکەیشی بە پێ چەوانەوە کورت هێنانەو بیروبۆ چوون و ڕای (مرجئە)کانە, کە کاتی خۆی هەبوونو ئێستاش کەسانێك هەن کەمو زۆر هەروا بیر دەکەنەوەو دەڵێن: مسوڵمان هەرگیز کافر نابێ، یاخود زۆر بە زەحمەت کافر دەبێو وەك پێشتر باسمان کرد ئەم بنچینە (قاعدە)یەیان داناوە, دەڵێن: (ولا یخرج العبد من الایمان الا بجحود ما أدخله فیه)، واتە: ئینسان لە ئیمان ناچێتە دەرێ مەگەر بە دان پێدانەهێنانی ئەو شتەی کە بردوویەتە نێو ئیمانەوە! بەڵام ئێمە ڕوونمان کردەوە کە خوای کاربەجێ ڕایگەیاندوە کە بەو هەموو شتانە ئینسان کافر دەبێ, کە هەندێکی بە قسەی زارەو, هەندێکی بە کردەوەو ڕەفتارەو هەندێکی بە زمانی حاڵە, کەواتە ئەو دوو ڕاو بۆچوونە هەڵەن, بە دڵنیاییەوە, یەکێکیان لە سنووری شەرع تێی پەڕاندوە, ئەوی دیکەشیان کورتی هێناوەو نەگەیشتۆتە سنووری شەرع،

بەڵام مسوڵمانانی پەیڕەوانی ڕێبازی ئەهلی سوننەت کە زۆربەی هەرە زۆری ئۆممەتی ئیسلام پێك دێنن، ڕاستە شەقامیان گرتوەو دەڵێن: نەخێر وانیە، نەوا یە کە هەرکەسێك کوفرێك یان شیرکێکی لێ بینرا، یاخود کوفرێك یان شیرکێکی لێ بیسترا، یەکسەر (کافر)و (مشرك) بێ، وە نە واشە کە ئینسان تەنیا بەوەی کە لەنێو دڵی دایە ببێتە (کافر)و (مشرك)، بەڵکو مرۆڤ بە قسەی زمانیش کافر دەبێ‌و بە کردەوەی ئەندامەکانیش (کافر) دەبێ‌و (مشرك) دەبێ، بەڵام دەبێ مەرجەکانی (کافر) بوون‌و (مشرك) بوون، بێنە دی‌و پەرچەکانیشی لابچن، ئەوجار حوکمەکە دەدرێ.

جا ئەهلی سوننەت بۆ چۆنیەتی هەڵس‌وکەوت لەبواری بەکافردانان (التکفیر)دا بنچینەیەکیان داناوەو کردوویانەتە بناغە، ئەو بنچینە (قاعدة)یەش ئەوەیە کە دەڵێ: (لابد لأطلاق حکم التکفیر من ثبوت الشروط وانتفاء الموانع) واتە: حەتمەن بۆ بە کافر دانانی کەسێك، دەبێ مەرجەکان هاتبنە دی‌و پەرچەکانیشی لاچووبن، کەواتە: بابزانین مەرجەکانی بەکافردانان‌و پەرچەکانی (شروط التکفیر و موانعه) چین‌و چەندن؟!

## أ- مەرجەکانی بەکافردانان:

ئەوەندەی من سەرنجم دا حەوت مەرجم بینین لەسەرجەم ئەو کتێبانەدا کە باس لەم مەسەلەیە دەکەن، کە ئەمانەن:

**(مەرجی یەکەم):** حوکم بە ڕواڵەت دەکرێت، واتە: بەوەی کە لە ئێمەوە دیارەو حەقی ئەوەمان نیە کە لە دڵیاندا چی هەیە، ئایا دڵیان بە ڕاستزانین (تصدیق)ی تێدایە؟ وە ئایا کردەوەی دڵ (عمل القلب)ی تێدایە؟

ئێمە حەقمان نیە، چونکە ئەوە پەنهانەو لە ئێمەوە دیار نیە، ئێمە تەنیا حەقی قسەی زمان‌و کردەوەی ئەندامەکانمان هەیە، ئەوەی کە دەیبیستین‌و

دەیبینین, بەڵگەش لەوبارەوە زۆرن، بۆ وێنە خوا فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا...﴾[1]، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە, ئەگەر ڕۆیی شتن بۆ جەنگو جیهاد شت ڕوونو ساغ بکەنەوەو کەسێك کە سەلامتان لێ دەکات بە سەلامێکی مسوڵمانانە, مەڵێن: ئیماندار نی! واتە: مادام بە ڕوا لەت مسوڵمانەو دروشمی مسوڵمانانی تێدا دیارە کە سەلام کردنە, نابێ ڕاستەوخۆ گومانی خراپی پێ ببەیو بڵێی مسوڵمان نیە، بەڵام ئەگەر دوایی پێچەوانەی مسوڵمانەتیت لێ بینی, ئەوە شتێکی دیکەیە، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووێ: (أُمرت أَنْ أُقاتِلَ الناس حتى يشهدوا أن لا اله الا الله وان محمداً رسول الله ويُقيموا الصلاة ويؤتوا الزكاة فإذا فعلوا عَصَمُوا مني دمائهم وأموالهم الاّ بحقّها وحسابُهُم على الله)[2]، واتە: فەرمانم پێکراوە کە جەنگ لەگەڵ خەڵکیدا بکەم تا شایەتمان دێنن کە جگە لە خوا پەرستراوێکی دی نیە, وە کە (محمد) ڕەوانەکراوی خوایە, وە نوێژ بەرپا دەکەنو زەکات دەدەن، جا ئەگەر ئەوەیان کرد، ئەوە خوێنوماڵو سامانی خۆیان لە من پاراستوە, مەگەر بە حەقی خۆی (جا ئایا ڕاست دەکەن, یان درۆ دەکەن, لەو شایەتمان هێنانو نوێژکردنو زەکاتدانەدا ئەوە حسابیان لەسەر خوایە).

هەروەها بەڵگەیەکی دی ئەو فەرموودەیە کە پێغەمبەر ﷺ بە (ئوسامەی کوڕی زەیدی) فەرموو: (أفلا شققت عَنْ قَلْبه حتى تعلم أَقالها أم لا!)[3] واتە: بۆچی دڵت لەت نەدەکرد, تا بزانی ئایا بەڕاستی بوو یان بە درۆ؟ کەواتە تۆ حەقت بەسەر دڵی ئەوەوە نیەو تەنها حەقت بە سەر زمانیو کردەوەیەتی, ئەوەی لێی دەبینیو دەبیستی.

---

(1) ( النساء- 94 ).

(2) متفق عليه، عن عبد الله بن عمر رضى الله عنهما , البخاري برقم : 25 . ومسلم برقم : 36 (22) .

3) رواه مسلم عن أسامة بن زيد -رضي الله عنهما- .

**(مەرجی دووەم):** بەکافردانانی گشتی, بە کافردانانی تایبەتی ناگەیەنێ (لا يسْتَلْزِمُ التكفير العام, التكفير الخاص).

جاری وایە بەگشتی دەگوترێ: فلان شتە کوفرە, یان فلان شتە شیرکە, بەلام مەرج نیە کەسێکی تایبەت، فلانو فیسار کەس, کە ئەوشتەی تێدا بینرا, یان لێی بیسترا, یەکسەر بگوترێ کافرە یان موشریکە, بەلکو دەبێ سەیری حالو وەزعی بکرێ ئایا مەرجەکانی هەموو هاتوونەدیو پەرچەکان هەموو لاچوون, ئەمجار دوای ئەوە دەتوانرێ حوکمی بەسەردا بدرێ.

(ابن تیمیة) -رەحمەتی خوای لێ بێ- لە (مجموعة الفتاوى، بەرگی- 35، لاپەرە 165)دا ئەم بنچینە (قاعدة)یە ئاوا دێنێو دەڵێ: (فقد يكون الفعل أو المقالة كفراً, ويطلق القولُ بتكفير من قال تلك المقالة أو فعَل ذلك الفعلَ, ويقال مَنْ فَعَل ذلك فهو كافِرٌ, وَمنْ قال ذلك فهو كافِرٌ، لكن الشخص المُعيَّنَ الذي قال ذلك القول أو فَعَل ذلك الفِعلَ لايُحكمُ بِكُفْرِه حتىّ تقوم عليه الحُجة التي يَكفُرُ تارِكُها)، واتە: جاری وا هەیە کەسێك قسەیەك دەکا, قسەکە کوفرە, کردەوەیەکی هەیە, کردەوەکە کوفرە, دەگوترێ: هەر کەسێك ئەوەی گوت, کافرە, وەهەر کەسێك ئەوەی کرد, کافرە, بەلام بۆ کەسێکی دیاریکراوو تایبەت یەکسەر حوکمی کافربوونی بەسەردا نادەین, بەلکو لێی ورد دەبینەوەو ڕوونی دەکەینەوە: (ئایا مەرجەکانی هەموو تێدا هاتوونەتەدی، وە هەتا بەلگەی لەسەر تەواو نەکرێ, کە هەرکەسێك نکوولیی لێ بکات کافر بێ حوکمەکەی بەسەردا نادەین.

**(مەرجی سێیەم):** دەبێ خەڵك بیانووبڕاو بکرێو ئیقامەی حوجە (اقامة الحجة)ی لەسەر بکرێو عوزری نەهێلرێ، ئەمجار حوکمەکەیان بەسەردا بدەین، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً)(1)، واتە:

(1) (الإسراء -15 ).

تاکو پێغەمبەر نەنێرین, خەڵك سزا نادەین (لەسەر كوفرو كردەوەی خراپ یان) وە دەفەرموێ ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾[1]، واتە: خوا لە سەر هیچ کەس پێویست ناکات, مەگەر ئەوەی کە لە توانایدا هەیە.

بەڵێ ئینسان: کە نەزانێ ئیمان چیە! چۆن ئیمان بهێ نێ؟ وە کە نەزانێ ئیسلام چیە! چۆن بڕوای پێ بێنێ؟! بۆیە هیچکەس تا ئیقامەی حوججەی لەسەر نەکرێ‌و دینی لـێ حاڵی نەکرێ, یەکسەر حوکمی بەسەردا نادرێ.

**(مەرجی چوارەم):** هەموو گوناهێك ئینسانی پێ كافر نابێ:

خەواریج بە هەموو گوناهێك ئینسانی مسوڵمان کافر دەکەن, بەڵام ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت دەڵێن: نەخێر, هەموو گوناهێك خەڵكی پێ كافر نا بێ بەڵكو, گوناح هەیە كوفرە, وەك كڕنووش بردن بۆ بت ( صنم), هەڵوا سینی خاچ بە ملدا, جنێودان بە خواو ئایەتەكانی, یان بە پێغەمبەر ﷺ, هەر دەربڕینێك‌و هەر كردارێك كە كوفر بگەیەنێ, ئەوانە كوفرن, هەروەها هەر قسەو ڕەفتارێك شیرك بگەیەنێ, ئەوە شیركە, بەڵام هەموو گوناهێك كوفرو شیرك نیە, قەتڵ‌و زینا گوناهن, بەڵام كوفرو شرك نین‌و ئینسان لە دین نابانە دەرێ.

**(مەرجی پێنجەم):** ئیمانێكی ڕاشكاوو ئاشكرا بە كوفرێكی ڕا شكاوو ئا شكرا نەبێ هەڵناوەشێتەوە, كەسێك زانیمان ئیماندارو مسوڵمانە بە ئاشكرا, هەتا كوفری ئاشكراو بێ پێچ‌و پەناشی لـێ نەبینین, كە پەردەی بە سەرەوە نەبێ, ناتوانین حوكمی كوفری بەسەردا بدەین, وەك پێغەمبەر صلی الله علیە و سلم دەفەرموێ: (الاّ أنْ تَرَواْ كفراً بواحاً لكم من الله فيه بُرهانً)[2]، واتە: مە گەر كوفرێكی ئاشكرا ببینن كە بەڵگەی شەرعیتان لەسەری هەبێت, لەلایەن خواوە.

(1) ( البقـرة -286).

2) رواه البخاري ومسلم عن عبادة بن الصامت رضي الله عنه, البخاري برقم: 7055, ومسلم برقم: 1709 .

(ابن بطال) کە یەکێکە لە زانایانی ئیسلام, قسەیەکی جوان دەکات کە (ابن حجر العسقلانی) لە (فتح الباري) بەرگی12،لاپەڕە 314) لێی دەگێڕێتەوە, دەڵێ: (مَنْ ثَبَتَ لَه عَقْدُ الایمان بیقین لم یَخْرُجْ منه الاّ بیقین)، واتە: کەسێك بە دڵنیایی‌یەوە زانرابێ کە ئیمانی هەیە, هەتا بە دڵنیایی‌یەوەش نەزانرێ کە کوفری کردوە بەکافر دانانرێ.

بەڵێ کاری بە کافردانان هەرگیز بە گومان پێك نایەت, یان کە سێك قسەیەك دەکات, بەڵام چەند تەئویلێك هەڵدەگرێ, بۆمان نییە یەکسەر حوکمی کوفری بەسەردا بدەین, مادام مەجالی تەئویلی تێدا بێ، یان مادام مەجالی بە هەڵەداچوونی تێدا بێت, بەڵکو دەبێ کوفرەکە بێ پێچ و پەناو ئاشکرا بێ و هیچ پەردەی بەسەرەوە نەبێت.

**(مەرجی شەشەم):** کەسێك کوفرو ئیمانی بەیەکەوە لێ ببینرێن لە یەك کاتدا حوکمی کوفری بەسەردا دەردێ, چونکە ئیمان کە کوفر یان شیرکی تێکەڵ بوو، هەڵی دەوەشێنێتەوە, بەڵام ئەگەر ئیمانەکە کەوتە دوایە ئەوە, حوکمی ئیمانی بۆ دەدرێ، بەڵام ئەگەر بەیەکەوە بینران, یان کوفرو شیرکەکە کەوتە دوایەوە, ئەوە حوکمی کافریی و موشریکی بەسەردا دەدرێ, چونکە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللهِ إِلاَّ وَهُم مُّشْرِكُونَ﴾[1]، واتە: وە زۆربەیان بڕوا بە خوا ناهێنن مەگەر هاوبەشدانەر بن، وەك دەبینین خوای کاربەجێ ئیمانیشی بۆ داناون و بە موشریکیشی لەقەڵەم داون, واتە لەسەرەتاوە ئیمانێك دێنن, بەڵام دوایی شیرکی لەگەڵ تێکەڵ دەکەن و دەبن بە موشریك!

**(مەرجی حەوتەم):** هەرکاتێك لە قورئان و سوننەتدا وشەی کوفر (کفر) یان وشەی شیرك (شرك)مان بینی, مەبەست پێیان کوفرو شیرکی گەورەیە, مەگەر بەڵگەیەك هەبێ کە کوفرو شیرکی بچووك دەگەیەنێ, کەواتە: دەبێ وریا بین و

1) ( يوسف  106 ).

دڵنیابین کە تەنهاو تەنها کاتێك ئینسان حوکمی کافربوونی بە سەردا دەدرێ، کە بەڵگەی شەرعیی لەسەر دابنرێ بە شێوەیەك کە بە تەواویی عوزرو بیانووی ببڕێ.

ئێستاش نۆرەی توێژینەوەی پەرچەکانی بەکافردانان (موانع التكفير)ە:

## ب پەرچەکانی بەکافردانان :

وەك باسمان کرد کاتێك دەتوانین حوکمی کوفر بەسەر کەسێك دابدەین کە کوفری تێدا دەبینین, کە وەك چۆن دەبێ مەرجەکانی تێدا هاتبنەدی, پەرچەکانیش لاچووبن, کە ئەم پێنجەن:

### (پەرچی یەکەم): نەزانین (الجهل):

بەبەڵگەی ئەوە کە خوای بەبەزەیی فەرموویەتی: ﴿رُسُلاً مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾(النساء 165)، واتە: پێغەمبەرانێکی دڵخۆشکەرو ترسێنەرن، تاکو پاش هاتنی پێغەمبەران خەڵکی بەڵگەیان لەسەر خوا نەبێ, وە خوا زاڵی کاربەجێیە. کەواتە: پێش ڕەوانەکرانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)و گەیشتنی پەیامەکەیان بە خەڵکی، خەڵك بەڵگەو بیانووی بەدەستەوەیە، چونکە بە زانیاری وەحی عەقڵو دڵیان ڕۆشن نەبۆتەوە!

هەروەها بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە (أبو هريرة) گێڕاویەتەوەو پێشترتیش لە بەرگی یەکدا هێناومانەو ئەمە دەقەکەیەتی: (عن أبي هريرة أن رسول الله ﷺ قال: قال رجلٌ لم يَعْمَلْ حسنةً قطّ لأهله, إذا مات فَحرِّقوه ثم إذْرُوا نِصْفَهُ في البَرّ ونِصْفَه في البَحرْ فوالله لَئِن قَدَرَ الله عَلَيْه لَيُعذِّبَنَّهُ عذاباً لا يُعذِّبُهُ أحداً من العالمين, فلما مات الرجل فعلوا ما أمرهم: فأمر الله البَرّ فَجَمَعَ مافيه، وأمر البَحرْ فجمعَ ما فيه, ثم قال: لِمَ فَعَلْت هذا؟ قال من خَشْيَتك يا ربّ وأنت أعْلَمُ

فَغَفَر اللهُ لَهُ﴾(1)، واتە: پیاوێك کە هەرگیز چاکەیەکی نەکردبوو بە کە سوکاری گوت: ئەگەر مرد بیسووتێنن پاشان نیوەی لە وشکانییو نیوەی لە دەر یادا پرژو بڵاوبکەنەوە, چونکە بە خوا ئەگەر خوا توانای بەسەر دابشکێ (زیندووی بکاتەوە) بە ئازاردانێك سزای دەدا هیچکەسی لە جیهانی یان ئاوا ئازار نەدابێ, جا کاتێك پیاوەکە مرد ئەوەیان ئەنجامدا کە پێی گوتبوون, ئنجا خوا فەرمانی بە وشکانی کرد ئەوەی نێوە خۆی خڕکردەوە وە فەرمانیشی بە دەریا کرد ئەویش هی نێو خۆی کۆکردەوە, پاشان فەرمووی: بۆچی ئاوات کرد؟! گوتی: پەروەردگارم بۆ خۆت زاناتری کە لە ترسی تۆ بوو! ئنجا خواش لێی بورد.

کەواتە: هەرچەندە کابرا نکوولیی لە سیفەتی توانا و (قدرة)ی خوا کردوە کە بتوانێ پاش سووتێنرانیو بوونە خۆڵەمێش زیندووی بکاتەوە, بەڵام چونکە بەهۆی نەزانینییەوە بووە عەفوی کردوە.

## (پەرچی دووەم): تەئویل (التأويل):

ئەمیش پەرچێکی دیکەی بەکافر دانانە, بۆ وێنە, کەسێك بە تەئویلێکی هەڵە حەڵاڵێك حەرام بکات، یان حەرامێك حەڵاڵ بکات، ئەوە دیسان پێی کافر نابێ, لە بەسەرهاتی (قدامە بن مظعون)و کۆمەڵێك لە هاوەڵان, کە شەرابیان خواردبۆوە بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُواْ إِذَا مَا اتَّقَواْ وَّآمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ ثُمَّ اتَّقَواْ وَّآمَنُواْ ثُمَّ اتَّقَواْ وَّأَحْسَنُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾(المائدة  93). کە هاوەڵان سەرەتا ویستیان بیانکوژن وەك سزای هەڵگەڕانەوەو گوتیان: ئەوا نە حەرامیان حەڵاڵ کردوە! ئەوانیش گوتیان: ئێمە بە حەرامان نەزانیوە، ئەو بەسەرهاتە لە ڕۆژگاری خەلیفەی دووەم (عمر بن الخطاب) -خوا لێی ڕازی بێ- دابوو، بەڵام کە بۆیان ڕوون بۆوە،

---

(1) رواه البخاري برقم 7506 ومسلم برقم: 2756.

(واتە عومەرو هاوەڵانی -خوا لێیان ڕازی بێ-) بە هۆی تەئویلکردنی هەڵەوە بووە، سزایان دانو نەیانکوشتن[1].

## (پەرچی سێیەم): بە هەڵەدا چوون (الخطـأ):

ئەمیش یەکی دیکەیە لە پەرچەکانی بە کافر دانان، وەك خوای زانا فەرموویەتی: ﴿...وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ وَلَكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ...﴾[2]، واتە: وە گوناهتان ناگاتێ ئەگەر بەهەڵە شتێك بڵێن, یان بکەن, کەسێك بەهەڵە کردەوەیەك، یان قسەیەك بکاتو کوفر بێت, مادام بە دڵی نەبووبێو دەربکەوێ، کە لەڕووی هەڵەوە بووە, وەك ئەو کەسەی کە لە خۆشی دۆزینەوەی وڵاخەکەی لە چۆڵەوانی یەکەدا گوتی: (أللهم أنت عبدي وأنا ربُّك)[3]، واتە: ئەی خوایە! تۆ بەندەمیو من پەروەردگارتم، ئەوە بە کافر دانانرێ، چونکە بەهەڵەو لەزار دەرچوون وای گوتوە, وەك پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (أخطأ من شدة الفرح)، واتە: لە سۆنگەی زۆر دڵخۆشبوونەوە هەڵەی کرد!

ئێستاش با دەقی فەرمایشتەکە بێنین بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست: ﴿ عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله ﷺ: لَلَّهُ أَشَدُّ فَرَحاً بتوبة عَبْدِه حين يَتُوبُ الیه مِنْ أَحدكُمْ كان على راحلته بأرضٍ فلاةٍ, فانفَلَتَتْ مِنْهُ, وعليها طعامُهُ و شَرابُهُ, فأيسَ منها, فأتى شجرةً فاضطجع في ظِلِّها وقد أَيِسَ من راحِلَته, فَبَيْنا هو كذلك: إذا هو بها قائمةً عنده فأخذ بخطامِها ثم قال من شِدَّة الفَرَحِ. اللّهم أَنتَ عَبْدي وأنا ربُّك! أخطأ من شدَّة الفرح﴾ واتە: ئەنەس کوڕی مالیك -خوا لێی رازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا زیاتر خۆشحاڵ دەبێ بە گەڕانەوەی بەندەکەی بۆلای کاتێك دەگەڕێتەوە لای (واز لە سەرپێچی دێنێ) لە یەکێکتان کە

1) رواه البيهقي وابن أبى شيبة و عبدالرزاق وابن المنذر.
2) (الأحزاب -5).
3) متفق عليه عن أنس بن مالك -رضي الله عنه-, البخاري برقم: 309, ومسلم برقم: 2747 .

لە چۆڵەوانیی یەكدا لەسەر حوشترەكەی دەبێ‌و كت‌وپڕ لە دەستی بەرهەڵدا دەبێ‌و دەڕوات, لە حاڵەتێكدا كە خواردن‌و خواردنەوەكەیشی هەر لەسەر پشتی ویە! ئیدی لێی نائومێد دەبێ‌و دەچێتە سێبەری درەختێك‌و ڕادەكشێ لە حاڵێكدا كە لە گرتنەوەو دۆزینەوەی ولاخەكەی نائومێد بووە, بەلام هەر هێندە دەزانێ ئەوە ولاخەكەی لەلایەوە ڕاوەستاوە, ئەویش جڵەوەكەی دەگرێ‌و پاشان لەبەر زێدە خۆشحاڵیی دەڵێ: ((ئەی خوایە! تۆ بەندەمی‌و من پەروەردگارتم!)) لەبەر زۆر دڵخۆشبون هەڵە دەكات.

## (پەرچی چوارەم): تۆبزی لیكران (الأكراه):

ئەمیش یەكی دیكەیە لەو شتانەی دەبنە پەرچ‌و ئاستەنگ لەبەردەم بڕیاری بە كافر دانان، هەر چەندە ئینسان[1] كوفرو شیركیشی لێ ببیندرێ یان ببیسترێ, بەڵگەش لەوبارەوە زۆرن بۆ نموونە: خوای كاربەجێ‌و بەبەزەیی فەرموویەتی: ﴿ مَن كَفَرَ بِاللهِ مِن بَعْدِ إيمَانِهِ إلاّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَان وَلَـكِن مَّن شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾(النحل 106)، واتە: هەركەسێك پاش ئیمان هێنانی كوفر بە خوا بكات, مەگەر كەسێك زۆری لێ بكرێ‌و دڵیشی ئارامگرتوو بێ بە ئیمان، بەلام كەسێك سینەی گوشادبێ بە كوفر (و بەدڵخۆشییەوە كوفر بكات) ئەوانە لە خواوە توورەیی‌یان بۆ هەیەو ئازارێكی مەزنیان بۆ دانراوە.

هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتەش وەك (أبو جعفر الطبري)[2] و (النیسابوری)[3] و غەیری وانیش گوتوویانە دەربارەی (عمار بن یاسر) -خوا لێیان ڕازی بێ- هاتۆتە خوارێ, كە هاوبەشدانەرەكانی مەككە باب‌و دایكی (یاسرو

(1) دیارە مەبەست لێرە ئینسانی مسوڵمانە ئەگەرنا بابای ناموسڵمان كوفرو شیركەكەی ئاشكرایە.
(2) (جامع البیان في تأویل آي القرآن)، ج14، ص187 188 .
(3) (اسباب النزول) للنیسابوري, ص258، لەسەر پەراوێزی (مختصر تفسیر الطبري) .

سمیە)یان لەژێر ئەشکەنجەدا کوشت و ئەویشیان زۆر ئازاردا، ئەوەبوو کە لەتاو ئازاری خۆی و بۆ ئەوەی کافرەکان وازی لێ بێنن کوفری بەزاردا هات، پاشان بەگریانەوە چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش دڵی دایەوە فەرمووی: (كيف تَجِدُ قَلْبَك؟!) واتە: دڵت چۆنە؟!

گوتی: (مطمئناً بالايمان) دڵم ئارامگرتوویە بە هۆی ئیمانەوە.

ئەویش فەرمووی: (فأنْ عادُوا فَعُدْ) هەر کات ئەوان ئەشکەنجەیان دایەوە تۆش چیت گوتوە تاکو وازت لێبێنن بگەڕێوە سەری.

(طبري) -خوا لێی خۆش بێ- گوتوویەتی: (فتأويل الكلام إذن من كفر بالله مِنْ بعد إيمانه الا من أكره على الكفر فَنَطَق بكلمة الكفر بلسانِهِ وقلبه مطمئن بالايمان موقِن بحقيقته صحيح عليه عَزْمُهُ غير مَفسْوحٍ الصَّدْر بالكفر لكن من شرح بالكفر صَدْراً فاختاره وآثرهُ على الايمان وباح به طائعاً فعليهم غضب من الله و لهم عذاب عظيم)(1).

واتە: کەواتە: مانای فەرمایشتی خوا ئاوایە: هەرکەسێك دوای ئیمانهێنانی کوفر بە خوا بکات، مەگەر کەسێك تۆبزی لێکرابێ کوفر بکات و بە زمانی وشەی کوفر بڵێ، بەڵام دڵی ئارامگرتوو بێ بەهۆی ئیمانەوە و دڵنیابێ لە حەقیقەتەکەی و عەزمی لەسەری دامەزراوبێ و سینەی گوشاد نەبێ بە کوفر، بەڵام کەسێك بە دڵی کراوەوە کوفر بکات و پەسندی بکات و بەسەر ئیماندا هەڵیبژێرێ و بەویستی خۆی دەری بڕێ، ئەوانە تووڕەیی خوایان بۆ هەیە و ئازارێکی گەورەیان چاوەڕێیە.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (ان الله وضع عن أمّتي: الخطأ والنسيان وما استُكرِهوا عليه) أخرجه ابن ماجه برقم: 2045, وابن حِبّان برقم: 7219 عن ابن عباس رضي الله عنهما، واتە: خوا گوناهی سێ حاڵەتی لە سەر ئوممەتم لابردوە: بەهەڵەداچوون و لەبیرچوونەوە و هەر شتێك بەزۆر پێیان بکرێ.

(1) (جماع البيان)، ج14، ص 188 .

## (پەرچی پێنجەم): لەبیرچوونەوە (النسیان):

ئەمیش یەکی دیکەیە لە پەرچو کۆسپەکانی بەردەم حوکمی بەکافر دانان, بەڵگەش لەوبارەوە زۆرن، بۆ نموونە:

أ- خوا (عزّو جلّ) لەسەر زمانی بەندەکانی فەرموویەتی: ﴿رَبَّنَا لاَ تُؤَا خِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا..﴾ (البقرة –286)، واتە: پەروەردگارمان! ئەگەر لەبیرمان چوو یان هەڵەمان کرد لێمان مەگرە! ئاشکراشە کە خوای کاربەجێ بۆیە بەندەکانی فێری ئەم دووعایە کردوە کە بۆیان جێبەجێ بکات.

ب- هەروەها خوای بەرزو بێوێنە لەسەر زمانی (مووسا) -علیه السلام- بە بەندە صاڵحەکەی هاوەڵی سەفەری دەفەرموێ: ﴿قَالَ لا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا﴾ (الکهف 73)، واتە: ئەگەر بەهۆی لەبیرچوونەوەوە هەڵەم کرد لێم مەگرەو لە ئیشو کارمدا بارگرانم مەکە!

ج- فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە پێشتریش هێنامان: (ان الله وضع عن أمتي: الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه) رواه ابن ماجه وابن حبان عن ابن عباس -رضي الله عنهما-.

کەواتە: هەرکەسێك لە ئەنجامی نەزانینی, یان تەئویلکردنی هەڵە, یان بە هەڵەداچوون, یان زۆر لێکران یان لەبیر چوونەوەوە, کوفری کرد, حوکمی کافر بوونو لە بازنەی ئیسلام چوونەدەری بەسەردا نادرێ، هەتا پەرچو کۆسپەکەی لەبەردەمدا لانەبرێ!

پوختەی مەبەست: هەرکات بمانەوێ بەهۆی دیتن یان بیستنی کوفرو شیرکێکەوە لە مسوڵمانێکدا حوکمی کافر بوونو موشریك بوون دەربکەین پێویستە:

یەکەم: هەرکام لەو حەوت مەرجەی کە پێشتر باسمان کردن ڕەچاو بکەینو دەبێ هەموویان پێکەوە هاتبنەدی.

دووەم: هیچ کام لەو پێنج پەرچ (مانع)و کۆسپەی خستمانەڕوو لە گۆڕێدا نەبن، ئەوجار بۆمان هەیە ئەو بڕیارە بۆ بابای کوفرو شیرك لێ‌دی تراوو بێ ستراو دەربکەین، ئاشکراشە کە جگە لە زا ناو شارەزاو پ سپۆڕانی شەریعەت هیچکەسی دیکە شایستەیی (أهلیة)ی ئەوەی نیە کە بەوکارە هەڵ سێ، چونکە ئەوان نەبێ کێ ئەو وردە کاریی یەی مەر جەکانی کافرکران‌و پەرچەکانی (شروط التكفير وموانعه) دەزانێ.

کەواتە: پێویستە مسوڵمانان بەگشتی خۆیان لەو مەسەلەیە بپارێزن‌و هەر چی ڕاست بۆوە خۆی لە خەڵکی نەکاتە دادوەر (قاضي)و ئیسلام‌و کوفر یان بە سەردا دابەش نەکات‌و ئەو مەسەلە گرنگ‌و هەستیارە بۆ خەڵکی شایستەی خۆی لێ بگەڕێ کە زاناو پسپۆڕانی شەریعەتن.

کۆتایی ئەم باسەش بەم سێ فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنین, کە لە بەرگی یەکەمی ئەم زنجیرە دەرسەشدا هێناومان‌و مانا شمان کردوون، بۆ یە بۆ ماناکردنیان خوێنەری بەڕێز حەواڵەی ئەوێ دەکەینەوە[1]:

1- (مَنْ صلَّى صلاتنا واستقبل قِبْلَتَنا وأكل ذَبيحتنا فذلك المسلم الذي ذِ مه الله وذمة رسولِه فلا تُخْفِروا الله في ذِمَّتِه) -رواه البـ خاري عن أ نس بن مالك-.

2- (مَنْ لَعَنَ مؤمِناً فهو كقَتْلِهِ ومن قَذَفَ مؤمناً بِكُفْرٍ فـ هو كَقَتْ لِه) متـ فق عليه.

3- (لا يَرْمي رَجلٌ رجُلاً بالفسوق ولا يَرْميه بالكفر الاّ ارتدتْ عليه إنْ لم يـ كُنْ صاحبُهُ كذلك) متفق عليه.

1) بڕوانە (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی ..) بەرگی یەکەم، لاپەڕە (201-288) دەر سەکانی (6, 7, 8) (هەڵوەشێنەوەرەکانی شایەتمان‌و ئیمان‌و شایەتمان‌و ئیسلام) .

# خاڵی یازدەیـــەم

# دۆســـتو پشـتیوان

خوای بێ وێنەو تاك فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللّٰهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ﴾(المائدة (55), واتە: بەڕاستی (ئەی مسوڵمانینە) پشتیوانتان بەس خواو پێغەمبەرەکەیو ئەوانەن کە بڕوایان هێناوە, ئەوانەی نوێژێ بەرپادەکەنو زەکاتێ دەدەن, وە زۆر ڕکووع دەبەن.

خوێنەری خۆشەویستم!

ئەم ئایەتە بەپێزە تێماندەگەیەنێ: کەسێك خۆی بە مسوڵمانو هەڵگری قورئان لەقەڵەم بدات، پشتو پەناو مشوورگێڕو دۆستو یاریدەدەری, یەکەم خوا, دووەم پێغەمبەر ﷺ و, سێیەم مسوڵمانانی نوێژکەرو زەکات دەرو ڕکووع بەرن, چا بابزانین چۆنو بۆچی؟!

## 1- خوا سبحانه وتعالی (إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللّٰهُ.....):

لەڕاستیدا تاقە پشتوپەناو جێی هانای ڕاستەقینە[1] و سەربەخۆی بابای

(1) چونکە پێغەمبەرو برواداران کە بە پشتیوانی مرۆڤی مسوڵمان دادەنرێن بەهۆی پەیوەندی هەبوویان بە خواوە خەسڵەتی (پشتو پەنابوون)یان هاتۆتە دی, نەك هەڵقوڵاوی واقیعو زاتی خۆیان بێ, مادام وابێ , لە ئاکامدا تاقە پشتیوانی مرۆڤی مسوڵمان بەس خوای تاكو تەنهایە (سبحانه وتعالی).

مسوڵمان بەس خودایە, چونکە خوا بەدیهێنەرو بنیاتنەرو دانەری بوونەوەرو ڕۆزیدەرو وێنەکێشو بژێو گەیێنو ژیێنەرو مرێنەری ژیاندارانەو, پشت شکێنو لەنێوبەری زۆردارانەو, ڕزگارکەرو سەرخەری چەوساوانەو, هەموو وردو درشتی ئەم بوونەوەرە لەژێر چاودێری وی دایەو هەر ئەو بەسەری ڕادەگات.

جا بەڕاستی بەس زاتێکی ئاوا زاناو تواناو بەبەزەییو کاربەجێو بەرزو مەزنو بەدەنگەوەهاتوو, شایستەی ئەوەیە کە مرۆڤ پشتی پێوە بداتو کارو باری خۆی حەواڵە بکات, وەك فەرموویەتی: ﴿..وَعَلَى اللهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ (آل عمران- 16), واتە: وە با بڕواداران بەس پشت بە خوا ببەستن، دیسان فەرمویەتی: ﴿وَقَالَ مُوسَى يَا قَوْمِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُواْ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ﴾ (یونس- 84), واتە: وە مووسا (علیه السلام) گوتی: ئەی گەلی خۆم ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خودا هێناوە, ئەوە بەس پشت بەوی ببەستن, ئەگەر ئێوە مسوڵمانن، هەڵبەتە کەسێکیش بەڕاستیو بەدڵێکی دامەزراوەوە پشت بە خوا ببەستێ خوای بەسەو هەموو کاروبارێکی بۆ پێکدێنێ, وەك فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا﴾ (الطلاق- 3), واتە: وە هەرکەسێك پشت بە خوا ببەستێت ئەوە ئەوی بەسە, بێگومان خوا ئیشی خۆی دەگەیەنێتە سەر, بێگومان خوا بۆ هەر شتێك ئەندازەیەکی داناوە. پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەوە فەرموودەی زۆرن, بۆ وێنە فەرموویەتی: ((من أحب أن يكون أقوى الناس فليتوكل على الله، ومن أحب أن يكون أغنى الناس فليكن بما في يد الله أوثق منه بما في يديه, ومن أحب أن يكون أكرم الناس فليتق الله)) (رواه ابن أبي حاتم), واتە: کێ پێی خۆشە بەهێزترین کەس بێ باپشت بەخوا ببەستێ, وە کێ حەز دەکات دەوڵەمەندترین کەس بێت با بەوەی کە لەدەستی خوا دایە متمانەدارتر بێت لەوەی کە لەدەستی خۆی دایە, وە کێ دەیەوێ بەڕێزترین کەس بێ با پارێزکاریی لە خوا بکات.

هەڵبەتە پشت بە خوا بەستن‌و دڵ بەخوا قایم بوونیش ئەوە ناگەیەنێ, کە مرۆڤی مسوڵمان پاڵ بداتەوەو, بڵێ ئیش‌و کاری خۆم حەواڵەی خوا کردوەو هیچ نەکات, چونکە خوا ئەم بوونەوەرەی لەسەر چەند یاساو دەستوورێك ڕۆناوەو, بۆ هەر شتێك هۆیەکی داناوەو بابای مسوڵمان دەبێت هەوڵ بدات لەڕێی دۆزینەوەی یاساو دەستوورەکانی بوونەوەرەوەو دەست گەیاندنە هۆیەکان (الاسباب) کارەکانی خۆی مەیسەر بکات, دەنا ئەو کەسەی گوێ نەداتە یاساو دەستوورەکانی بوونەوەرو بە بەرهەڵدایی‌و بێ‌یاسایی مل بەدنیاوە بنێ, سەرەڕای ئەوەی کە تاوانبارە, چونکە پێچەوانەی یاسا سروشتییەکان (القوانين الطبيعة)ی خوا جووڵاوەتەوە, هیچیشی دەستگیر نابێت‌و دەستی لە بنی هەمبانەوە دەردەچێت!!

پێغەمبەریشمان ﷺ ڕۆژێکیان عارەبێکی دەشتەکی دی حوشترێکی پێ بوو, لەپاشان لێی پرسی: کوا حوشترەکەت؟

کابرا گوتی: لە دەرێ بەرهەڵدام کردوەو بە تەمای خوای لێی گەڕاوم‌و پشتم بە خوا بەستوە.

پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: (إعقِلها وتوكلْ) (رواه الترمذی), واتە: بیبەستەوەو پشت بەخوا ببەستە!! کەواتە: خۆمان چیمان لەدەست هات ئەنجامی دەدەین، ئەوەش تواناماں بەسەردا نەشکاو دەستمان نەگەیشتێ، حەوالەی خوای دەکەین‌و پشتی پێدەبەستین.

بەڵێ کارکردنی مرۆڤی مسوڵمان= بەستنەوە + پشت بە خوا بەستن, واتە نە (بەستنەوەی) ڕووت‌و نە (پشت بەخوا بەستنی) بە تەنێ!!

## 2- پێغەمبەر ﷺ (.... وَرَسُولُهُ):

﴿پشت‌و پەنابوونی پێغەمبەر﴾ ﷺ بۆ مرۆڤی مسوڵمان چەمك‌و واتایەکی دیکەی جوێی هەیە لەگەڵ (پشت‌و پەنا بوونی خوا)، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەس ئەوەندەیە بەندەیەکی خۆشەویست‌و بەڕێزو هەڵبژاردەی خودایەو، کردوویەتی بە

پێشەواو ڕابەرو چاوساغمان، دەنا هیچ جۆرە دەستو دەسەڵاتێکی لەو کارانەدا نیە کە خوا ئەنجامیان دەدات، وەك مراندنو ژیاندنو ڕۆزی دانو لێگرتنەوەو ساغ کردنو نەخۆش کردنو سەرخستنو وەبن دان .....هتد.

کەواتە: پشتو پەنابوونی پێغەمبەر بۆ مرۆڤی مسوڵمان، چەمكو واتایەکی دیکەی هەیە کە لەگەڵ کەسایەتیو تواناو دەستەڵاتو پلەو پایەیدا بگونجێ، ئەویش ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ لەو ڕووەوەو بەو ئیعتیبارە پشتو پەناو یاریدەدەرو دۆستی بابای مسوڵمانە، کە ڕێو شوێنو دابو دەستوورێکی وای بۆ بەجێهێشتوە ئەگەر بێتو دەستی تێبگرێو لێی لانەدات، سەرکەوتنو زاڵ بوونو بەمراد گەیشتنی دەبێتە شتێکی مسۆگەرو سروشتی.

جا مادام بابای مسوڵمان بەهۆی گرتنی ئەو سوننەتو ڕێوشوێنەوە بەمراد گەیشتو زاڵ بوو کە پێغەمبەر ﷺ بۆی داناوەو ڕەنگی کێشاوە، مانای وایە پێغەمبەر ﷺ پشتیوانو یاریدەدەرو سەرخەری بووە.

### 3- بڕواداران (وَالَّذِينَ آمَنُواْ....):

پاش خوای (جل جلاله) دەسەڵاتدارو پێغەمبەری پەسندکار ﷺ، خەڵکی مسوڵمانو بڕوادار، تاقە پشتو پەناو دۆستو یاریدەدەری مسوڵمانن، وەك خودا (سبحانه وتعالى) بە پێغەمبەری ﷺ فەرمووە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللّهُ وَ مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾(الانفال- 64)، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ، خواو ئەو بڕوادارانەت بەسن کە شوێنت کەوتوون[1]!

بەڵێ بابای مسوڵمان لەدوای خوا، تاقە قەڵای پشت پێوەدانیو تاکە هێزی پشت پێبەستنی ئەو خەڵکە مسوڵمانو بڕوادارەیە کە لێیان دڵنیایەو متمانەیان

1) ئەم ئایەتە واتایەکی دیکەشی هەیە کە ئاوایە: (ئەی پێغەمبەر تۆو بڕوادرانی شوێنکەوتوت، خواتان بەسە) پاشان بۆم ساغ بۆوە کە ئەم مەعنایەیان ڕاستترو بەهێزترە هەر چەندە خراوەتە پەراوێزیشەوە بۆ ئاگاداری.

پێدەكات! وە بابای مسوڵمان بە هیچ ڕەنگێك ڕێگە بەخۆی نادات كە غەیری مسوڵمانی هاوبڕواو هاوئامانجو هاوسەنگەری هیچ كەسێك بكات بە دۆستو پشتیوانی خۆی بگرێ, خوا لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ۞ الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاء مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ العِزَّةَ لِلّهِ جَمِيعًا﴾(النساء: 138 139), واتە: مزگێنی بدە بە دەغەڵو دووڕووەكان كەوا ئازارێكی بە ئێشیان هەیە, ئەوانەی كە كافران لە جیاتی بڕواداران دەگرن بەدۆست, ئایە دەسەڵاتیان لەلا دەخوازن! بێگومان دەسەڵات هەمووی هی خودایە.

وەك دەبینین دۆستایەتی گرتن لەگەڵ كافرو نامسوڵماناندا لە جوولەكەو دیانو هاوبەش پەرست وبێبڕواو بت پەرستان، بەڵگەو نیشانەی دەغەڵیی و لە ئایین دەرچوونو لەخوا هەڵگەڕانەوەیە، بەڵێ دۆستایەتی گرتن لەگەڵ كافراندا نیشانەی دەغەڵیو لە ئایین دەرچوونو لە خوا هەڵگەڕانەوەیە، چونكە بابای كافر دوژمنو ناحەزی خوایە, دیارە هەر كەسێكیش لە گەڵ دوژمنی خوادا ڕێك بكەوێو پەیوەندی ببەستێ, ناتوانێ بڵێ مسوڵمانمو دۆستی خوامو خوام خۆشدەوێت!

ئەگەر خوای خۆشدەوێت بە دۆستی خۆی دەزانێ بۆچی لە گەڵ دوژمنەكانیدا ڕێك دەكەوێو كلكێ تێك هەڵ دەبەستێ؟! هەر بۆیە شە خوای زانا وردبین فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاء...﴾(الممتحنة- 1), واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە دوژمنی منو دوژمنی خۆتان مەگرن بە دۆست، دیسان فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لاَ يَأْلُونَكُمْ خَبَالاً وَدُّواْ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاء مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ ...﴾(آل عمران- 118), واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لە غەیری خۆتان دۆستو هاوڕاز مەگرن، چونكە لە تێكدانتاندا كەمتەرخەمی ناكەن, وە دەردەسەریتان بە ئاوات دەخوازن, بێگومان لەڕێی قسەی

زاریانەوە رق و قینیان ئاشکرا بووە, وە ئەوەی سینەیان شاردویەتیەوە گەورەترە (لەوەی بە زار ئاشکرایان کردوە). لە جێیەکی دیکەدا خوای بێوێنە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ....﴾(المائدة– 51), واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە جوولەکەو دیانەکان مەگرن بە دۆست, هەندێکیان دۆستی هەندێکیانن, وە هەرکەسێك لە ئێوە دۆستایەتییان بکات بێگومان لەوانە.

وەك دەبینین خوای دادگەر دۆستایەتیکردنی جوولەکەو دیانەکانی کردوە بەهۆی لە ئیسلام چوونە دەرو لە مسوڵمان شۆران!!

جا خوێنەری بەرێز!

بەڕاستی ئەگەر ئەم ئایەتە قورئانیانە بکەینە سەنگی مەحەك و تەرازووی هەڵسەنگاندنی مسوڵمانانی خۆ بە ئوممەتی (محمد) ﷺ زانی ئەمڕۆ, بەتایبەت لەسەر ئاستی دەوڵەت و کیانی سیاسی، مەگەر بەدەگمەن دەنا تای تەرازووی لای وان سەردەکاو سەردەکا!! چونکە زۆرێك لە مسوڵمانان لەم رۆژگارەدا شوێنەکەوتووو لایەنگرو هەواداری جوولەکەو دیانانن یان کلکلی وانن و، بە تەپڵ و زوڕنای وان گەرم دەبن و دەجۆشێن و لەرێی واندا تێدەکۆشن و دەخرۆشێن، بەڵام (حسبنا الله ونعم الوكيل).

تێبینی:-

دیارە پێکەوە ژیان و تەبایی و پەیوەندی نێوان ئەهلی ئیسلام و ئەهلی کوفر بە هەموو جۆرەکانیەوە مەسەلەیەکی دیکەی جیایە لە مەسەلەی دۆستایەتی گرتن (موالاة)و، ئەوەی کە بۆ مسوڵمانان دروست نیە بریتیە لە (دۆستایەتی گرتن)، ئەگەرنا دەستبار پێکەوە گرتن و هاوکاری پێکەوەکردنی ئەهلی ئیسلام لە گەڵ غەیری خۆیاندا، لەو ئامانجە هاوبەشانەدا کە بەرژەوەندییانیانی تێدایە، نەك هەر

دروست (جائز)ە، بگرە پێویست (فرض)یشە، وەك خوا (عزّ و جلّ) فەرموو یەتی: ﴿...وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى...﴾ (المائدة-2)، واتە: وە هاوكاری یەكدی بكەن لەسەر چاكەكاریی و پارێزكاریی(تر).



1) لە بەشی نۆیەم و دەیەمی كتێبی: (بەرنامەی فیكریی كاری ئیسلامی)دا هەتا ڕاددەیەكی باش هەم باسی دوژمن و ناحەزانی تاك و كۆمەڵی مسوڵمان و هەم دۆست و پشتیوانیشیان كراوە و دەتوانی سەرنجی ئەوێ بدەی، وە لە خاڵی دووەمی ئەم بەرگەدا ڕوون كراوەتەوە كە چ كاتێك پەیوەندی هەبوون لەگەڵ ئەهلی كوفردا قەدەغەیە و چ جۆرە دۆستایەتییەكیش لەگەڵ ئەهلی كوفردا سەردەكێشێ بۆ لە بازنەی ئیسلام دەرچوون.

# خاڵی دوازدەیەم:

# دوژمن و ناحەز

خوای میهرەبان فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ ۞ إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾(فاطر: 5-6), واتە: ئەی خەڵکینە! بەڵێنی خوا ڕاستەو دێتەدی, جا با ژیانی دنیا فریوتان نەدات، وە با ( شەیتانی) فریودەر فریوتان نەدات, بەڕاستی شەیتان دوژمنێکە بۆ ئێوە دە ئێوەش بیکە نە دوژمنتان. بێگومان ئەو پێڕی خۆی بانگ دەکات تاکو ببنە هاوەڵی کلپەی ئاگری دۆزەخ.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

گەورەترین و سەرسەختترین دوژمن و ناحەزی (مسوڵمان) شەیتانی بەدو نەفرین لێکراوە, ئەو شەیتانەی کە لەسەر کڕنووشی (ڕێز گرتن) نەبردن بۆ ئادەم لە بەهەشتێ وەدەرێ نراو نەفرینی لێکرا، ئەویش لە داخان سوێندی خواردو شەرتی کرد کە ئەوەندەی پێبکرێ لەگەڵ ئادەم و وەچەکەی بێ بکات و, هەموویان لەڕێ لابدات جگە لە کۆمەڵێکی هەڵبژاردەی کەم[1]!

1) بڕوانە سورەتی (الحجر) لە ئایەتی (28-40).

جا بێگومان شەیتانیش هەر بەتەنێ نیەو دەستەو دایەرەو پێڕو تاقمی تایبەتی خۆی هەیە, جا چ لەوەچەو ڕەگەزی خۆی بێ‌و چ ئەوانە بن کە لەوە چەی ئادەمی خەڵەتاندوونی‌و لەخشتەی بردوون, خوای زاناو وردبین لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ۞ وَأَنْ اعْبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ ۞ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلا كَثِيرًا أَفَلَمْ تَكُونُوا تَعْقِلُونَ﴾(يس: 60–62), واتە: ئەی ڕۆڵەکانی ئادەم! ئەدی ڕام نە سپاردن کە شەیتان مەپەرستن، بەڕاستی ئەو دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە! وە (ڕام نەسپاردن) کە من بپەرستن ئەمەیە ڕێی ڕاست وە بەڕاستی کۆمەڵێکی زۆری لێ سەرگەردان کردن، ئەدی ئەوە عەقڵتان پێ نەدەشکا (کە دوای نەکەون)!!

جا ئێمە ئێستا بە پێناسەکردن‌و پەردە لە سەرلادانی دەستەو دایەرەو پێڕو تاقمەکانی شەیتاندا[1] دەچینە خوارو پلەپلە لە خراپترەوە بۆ خراپ دەڕۆین, بەڵام لە پێشدا مەسەلەیەکی گرنگ هەیە نابێت لێی بێ هەواڵ بین: هەر چەندە شەیتان پێڕو تاقم‌و دەستەی جۆراجۆرو زۆری هەن، بەڵام هەموو ئەو دەستە زۆرو جۆراو جۆرانە لە چییەت (الماهية) کەسایەتی‌و ئامانج‌و مەبەستدا یەکن, بەڵام بۆیە لەهەر سەردەم‌و ڕۆژگارێکدا دروشم‌و ناوێك لەخۆیان دەنێن‌و هەر تاوە بەرگێك دەپۆشن, چونکە ئەگەر وانەکەن چی دی خەڵکیان بۆ فریو نادرێ‌و کەسیان پێ لەخشتە نابرێ, لەسۆنگەی ئەوەوە کە بیروباوەڕەکەیان (کوفرو شیرکە) ڕەگ‌و ڕیشەی نە لە سروشتی مرۆڤ وە نە لە دنیای واقیعدا نیە!!

جا بۆیە ناچارن زوو زوو ناویان بگۆڕن‌و دەمامکی سەر ڕوویان هەرجارە ڕەنگ‌و دیمەنێکی هەبێ!! دیسان ئێمە دەبینین خوای زاناو شارەزاو ئاگادار بە هەموو شتێك, ناوی جۆراوجۆری لە پێڕو تاقمی شەیتان هەڵداون: (الکافرین, الظالمین,

---

(1) ناوی شەیتان (91) جار لە قورئاندا هاتوە (87) جار بەوشەی (شیطان و شیاطین) وە (1) جار بە وشەی (ابلیس)و (1) جار بەوشەی (سفیهنا) وە (1) جار بە وشەی (الخناس) هاتوە.

المسرفين, المنافقين, المتكبرين، الفاسقين.....) هتد، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە خوای بێهاوتا هەرجارە لایەنێکی شووم و بەدی شەیتانانەی لەو پیرۆ تاقمەدا ڕەچاو کردووە, هەر جارە بە ئیعتیبارێك ناوی لـێ ناون, چونکە پیری شەیتان ئەگەر لە لایەنی دەست درێژکردنەوە سەیری بکەی (ظالم)ەو, ئەگەر لە ڕووی ڕەفتارەکانییەوە سەیری بکەی (مجرم)ە, وە ئەگەر لەڕووی دەغەڵی و دووڕوویی یەوە تێی بفکری (منافق)ەو, وە ئەگەر لەو ڕووەوە تەماشای بکەی کە لاڕێ بووە (فاسق)ە, وە ئەگەر چۆنیەتی ژیان و گوزەرانی لەبەرچاو بگری (مسرف)ە، وە ئەگەر لا یەنی ڕەو شتی تێدا ڕەچاو بکەی (کاذب و خائن و متکبر و حاسد و ماکر و بخیل و مختال... الخ)ە.

ئێستاش دێینە سەر توێژینەوەی یەك یەکی ناوەکانی پیری شەیتان:

## 1 (الکـــافرون) بێبڕوایان:

ناوی (کافر) لە قورئانێدا لە هەموو ناوەکانی دیکەی پیری شەیتان پتر دووبارە بۆتەوە, هەڵبەتە ڕێژەی دووبارەکرانەوەی هەر ناوێکیش لە قورئانی قەسەلەجێ دا پەیوەندی بە گرنگیی و بایەخی ئەو ناوەوە هەیە, بەڵێ وشەی (کفر) لە ئەصلی زماندا یانی داپۆشین (الستر) و بە هەموو صیغەکانییەوە (328) جار دووبارە بۆتەوە.

جا هەرچەندە (کافر) واتە (بێ بڕوا)، بەڵام لە ڕوانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە بۆ ئەوەی کابرا بەبێ بڕواو کافر لەقەڵەم بدرێ، مەرج نیە بڕوای بە هیچ شتێکی ئایین نەبێ, بەڵکو بڕوا نەکردن بە ئایەتێکی قورئان و یەك حوکمی ئاشکرای ئیسلام بەسە بۆ کافربوونی مرۆڤ, کەواتە گەورەترین دوژمن و ناحەزی (مسوڵمان) بابای کافرو بێبڕوایە, واتە هەر کەسێك بڕوای بە یەك تاقە یاسای ئیسلام نەبێ, چ جای سەرلەبەری.

## 2و3- (الكاذبون) درۆزنان و (المكذبون) بە درۆزانان:

وشەی درۆزن (كاذب) و بە درۆزان (مكذِّب) دوو ناوی دیكەن لەو ناوانەی، كە خوا لە پێڕی شەیتانی ناون, وشەی (كذب)یش بە هەموو شێوەكانییەوە (216) جاران لە قورئانێدا هاتوە!

جا بێگومان درۆكردن و ئایین بەدرۆ لەقەڵەمدانیش بەر هەمێكی دیكەی مسۆگەرو چاوەڕوانكراوە لە كەسانێكدا، كە دێوەزمەی بێبڕوایی باڵی ڕەشی بەسەردا كێشاون و, لە جلێ تاوی بت پەرستیی و ستەمكاریی و خۆ بەزلگریی هەڵكێشاون, چونكە هەروەك چۆن شەمشەمەكوێرە كە چاوی نین ڕۆژی ڕوونیان پێ ببینێ, هیچ چاری نین جگە لە ڕاكردن و خۆ حەشاردان لە پەناو پەسیوی تاریك و تەڵەمدا، هەروەك چۆن حوشترمەل (نعامة)ی بێ پەڕو باڵ لەكاتی دیتنی ڕاو چیدا جگە لە سەر لە لمدا نوقم كردن، هیچ شتێكی دی دادی نادات!

بابای كافرو خوانەناسیش لە بەردەم تیشكی ڕۆژی بیری خوناسی و مسوڵمانەتییدا بێجگە لە درۆكردن و بەدرۆدانان، هیچی دیكەی لەدەست نایەت.

## 4- (الظالمون) ستەمكاران:

وشەی (ظلم) كە لە ئەسڵی زماندا واتە (كاری بێجێ) وە لە زاراوی شەرعدا بە هەموو جۆرە تاوان و خراپەیەك دەگوترێ كە ئینسان لەزاتی خۆیدا, یان لە ئاقار خەڵكیداو سەبارەت بەوان ئەنجامی دەدات, بەڵام دوا تر بەهۆی بەكارهێنانی عورفەوە تایبەت كراوە بەو جۆرە تاوان و خراپانەی كە دەستدرێژی كردنە سەر خەڵكیان تێدایە, وشەیەكە لە دوای (كفر)و (كذب) لە هەموو ئەو شانە پتر دووبارە بۆتەوە كە ناوەكانی پێڕی شەیتانیان لێ دروست كراوەو (189) جار لە قورئانێدا هاتوە.

جا جێی سەرنج و تێوەڕامان ئەوەیە کە ئەم قورئانە مەزن و بەرزە نەك هەر ڕستەو مەبەستەکانی بەڵکو پیت و وشەکانیشی بە تەرازووی زانیاری خوای زانا کێشراون و لەجێی دیاریکراوی خۆیاندا ڕۆنراون، بۆ وێنە لێرەدا وشەی (ظلم) لەپاش وشەی (کفر) و (کذب) کە بیروباوەڕی پێڕی شەیتان دەردەخەن, لە هەموو وشەکانی دیکەی لەم بابەتە زیاتر دووبارە کراوەتەوە.

جا خوێنەری بەڕێز!

دەزانی ئەم مەسەلەیە چ دەگەیەنێ و چ ئەنجامێگیری (استنتاج)ێکی لێ دەکرێ؟!

دەسەرنج بدە بابزانی: وەك لەڕابردوودا گوتمان خوا پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) بۆ ئەوە ناردوون کە دادگەری (عدالة) لە زەویدا بچەسپێنن، جا بێگومان ستەم و زوڵمیش دژی دادگەرییە، کەواتە هەروەك چۆن لە دوای خوانا سیی و خواپەرستی چەسپاندنی دادگەری لە بەرنامەی خوادا لە هەموو شتێك گرنگترو لە پێشترە, لە دوای بێبڕوایی و بت پەرستییش ستەم و زۆرداریی و چەو ساندنەوە لە هەموو شتێك خراپترو بەدترە!

ئنجا هەروەك چۆن چەسپاندنی دادگەری و یەکسانی و ئازادی، ئەنجام و بەرهەمی سروشتی بیری خوانا سیی ڕا ستەقینەیە, ستەم و چەو ساندنەوەو چینایەتییش فەلسەفەی گوژاڵکی بێبڕوایییە.

## 5- (المشرکون) بت پەرستان:

پاش وشەی (کفر) و (کذب) و (ظلم)، وشەی (شرك)[1] لە قورئانێدا لە هەموو ناوەکانی دیکەی پێڕی شەیتان زیاتر دووبارە بۆتەوە, و شەی ( شرك) سەرجەم (167) جار دووبارە بۆتەوە، چونکە لەڕاستیدا پێڕو دەستەی شەیتان وەنەبێ، کە

1) (شرك) واتە: هاوبەش دانان بۆ خوا لە پەرستراندا, کە یەکسەر دژو پێچەوانەی خوا بەیەکگرتن (توحید)ە.

بیری بێ بڕوایی (الکفر)و بێ‌دینی (زندقة) هەڵدەبژێری, بتوانێ بە بیرێکی بەتاڵو حەتاڵەوەو لە بۆشاییدا ژیان بەرێتە سەر, بەڵکو هەر کەسێك لە ڕاستە شەقامی خواناسیو خوا بەیەکگرتن (التوحید) لاڕێ بێ, یەکسەر شەیتان مەلمی دەگرێو دەیکاتە ئەندامێك لە پێڕی خۆیداو, گیرۆدەی دەردی کوشندەی بتپەرستی دەبێت! کێش دەڵێ کەنگێ وابووەو چۆنو کوا؟! با بەوردی سەرنجێکی بە ویژدان لە مێژووی ڕابردوو کۆنو واقیعی ئێستا بدات!

## 6- (المستکبـرون) خۆبەزلگران:

ناوی شەشەم کە خوا لە قورئانێدا بۆ پێڕو تاقمی شەیتانی بەکارهێناوە، لە وشەی (کبر) دروست کراوە, وە وشەی (کبر) بە هەموو صیغەکانیەوە (161) جاران لە قورئانێدا دووبارە بۆتەوە!! هەڵبەتە ئەم ناوەش لایەنی ڕەوشتو خووی پێڕی شەیتانی تێدا ڕەچاو کراوەو خۆ پێ زۆریو خۆ بەزلگرتنیش، کە پێچەوانەی خۆ بە کەمگرتن (تواضع)ە, پیسترین خەسڵەتە لەنێو خەسڵەتە بەدەکاندا, ئایا هەر ئەم خەسڵەتە نەبوو کە وای لە شەیتانی بەدو نەگریس کرد فەرمانی خوا بشکێنێ؟! وەك فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾(البقرة- 34), واتە: وەکاتێك بە فریشتانمان گوت کڕنووش(ی ڕێزگرتن) بۆ ئادەم بەرن یەکسەر کڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس قایل نەبووو خۆی بەزل گرتو چووە ڕیزی کافرانەوە.

جا لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە خوای وردبین پاش (کبر) باسی (کفر)ی کردوە, تاکو تێمان بگەیەنێ کە تێکڕای ڕەوشتە بەدو نزمەکانو لە پێش هەموانیشەوە خۆ بەزلگری زادەو بەرهەمی درەختی شومو بێ‌خێری بێ‌بڕواییین, هەڵبەتە واقیعیش هەر وایەو هەر دڵو دەروونێك بووبێتە هێلانەی کوفرو بێ‌بڕوایی، جیقنەی فیزو کەشخەکردنو دەمارو لووت بەرزییو خۆ بەزلگریی تێدا

کەڵەکە بووەو وەك ڕیخ و تەپاڵەی پشتیرێکی[1] کۆن کەمرەی بەستوە.

## 7- (الفاسقون) لاڕێ بووان:

وشەی (فسق) لە قورئانێدا بە هەموو شێوە بەکارهێنانەکانی یەوە (53) جار دووبارە بۆتەوەو (فسق)یش واتە لەڕێ دەرچوون، ئەم ناوەش دەریدەخات کە پێڕەوانی شەیتان لەسەر ڕاستەڕێ ترازاوەو تەلاسابووە, هەم ڕاستە ڕێی شەریعەت و هەم فیترەت[2].

## 8- (المفسدون) خراپەکاران:

ناوێکی دیکەی پێڕەوانی شەیتان (خراپەکاران)ە کە لە ماددەی (فسد)ەوە هاتوە, وشەی ناوەبراویش (50) جار لە قورئانێدا دووبارە بۆتەوە بە هەموو شێوە بەکارهێنانەکانییەوە، هەڵبەتە ئەم ناوەش ناوێکی پڕ بە پێستەو کالاّیەکی پڕ بالاّیە بۆ پێڕەوانی شەیتانی بێبڕوای دوور لە خوا, چونکە بەدەردی پێشینان دەڵێن: (گۆزە چی تێدا بێت هەر ئەوەی لێ دەڕژێ), بابای کافرو بتپەرستو خۆبەزلزانو ستەمکارو درۆزنیش جگە لە خراپەکردنو کاولکاری هیچی دیکەی لێ چاوەڕوان ناکرێ! چونکە داری خوار سێبەریشی هەر خوارەو کەسێکیش بۆ خۆی خێری پێوە نەبێت بۆ خەڵکیش خێرێ ناداتەوە، وەك گوتراوە: لە هیچی هیچ پەیدا نابێتو (فاقد الشيء لايعطيه).

---

1) ئەو جێیەی ماڵاتی تێدەکەن پشتیر یان (هۆڵ)ی پێ دەڵێن, بەڵام ئەگەر سەری ئاوەڵابێ و نەگیرابێ پێی دەڵێن ئاغەڵ, وە بە زۆری ئاغەڵ بۆ جێی مەڕو بزنان بەکاردێ.

2) چونکە شەریعەتی خواو فیترەتی ئینسان دووڕووی یەك حەقیقەتن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللهِ....﴾(الروم 30) .

## 9- (الماکــرون) فێڵبـــازان:

وشەی (مکر) کە بە فێڵ‌و تەڵەکە دەگوترێ، بە هەموو ( صیغە)ەکانییەوە (43) جار دووبارە بۆتەوە.

## 10- (الطاغـوت) یاخی:

یەکی دیکە لەو ناوانەی کە قورئان بۆ دەستەو دایەرەی شەیتان هەڵی بژاردوون، بریتیە لە (یاخی)، واتە ئەوانەی لە بەرنامەو حوکمی خوای گەورە یاخی دە بن‌و سنوورەکانی خوایان بەزاندوەو لێیان دەر چوون, ئەم ناوەش کە لە ماددەی (طغی)ەوە هاتوە, بە هەموو شێوە بەکارهاتووەکانی یەوە (40) جار دوو بارە بۆتەوە! هەڵبەتە وەك دەبینین ڕێژەی دووبارە بوونەوەی وشەی (فـ ساد)و (طغ یان) لێك نزیکن, جا ئایا ئەو نزیکییە هیچ نهێنی‌تێدا هەن؟!

با قورئانی بەڕێز وەلامــمان بداتەوە:

﴿الَّذِينَ طَغَوْا فِي الْبِلادِ ۞ فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ﴾(الفجر:11-12)، واتە: ئەوانەی‌کە لە وڵاتدا لە بەرنامەی خوا لایا نداوەو یاخی بوون، دە ست بەجێ خراپەکارییان تێدا زۆرکرد..!!

بەڵێ هەموو دەمێ لە خوا هەڵگەڕا نەوەو لە ئایین لادان‌و یاخی بوون, خراپەکاری‌و تاوان‌و بێ‌سەرەوبەرەیی لـێ دەرەخسێ, وەك لەم ڕۆژگارەدا بە چاوی سەر لە هەموو کون‌و قوژبنەکانی دنیادا دەبینین‌و، هەموو ئینـ سانێکی عا قڵ‌و بەویژدان دەیبینێ, بەڵام چ لە کەسانێك بکەم کە وەك بابای گرانەتێ داری مـ یزاج تێکچووی, ئاوی شیرین بەزاری تاڵ‌و, وەك قالۆنچەی نەفامی بێ‌هۆشی ڕ یخ پێ خۆش, خواریان بەڕاست‌و خراپیان بە چاك‌و پیسیان بە پاك دێتە بەرچاو!!

## 11- (المنافقون) دەغەڵان:

هەرچەندە بابای دەغەڵ (منافق) لە بابای (کافر) پیسترە, وەك خوا فەرموویەتی: (﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾(النساء- 145), واتە: بێگومان دەغەڵان لە پلەی هەرە بنەوەی ئاگری دۆزەخ دان, بەڵام پێم وایە خواش بە کتێبی خۆی زاناترە بۆیە ماددەی (نفاق) بەس (37) جاران دووبارە بۆتەوە, هەرچەندە ڕێژەی ئەو ئایەتانەی کە دەربارەی دەغەڵان دواون زۆر زۆرن, چونکە دەغەڵیی (نفاق) شتێکی پەنهانو شێردراوەیەو لە ناوهێنانی شیاندا خوای زانا ناو وردبین ئەوەی ڕەچاو کردوە، دیارە (نفاق)یش جۆرێکی (کفر)ەو بابای مونافیقیش پشکی لە زۆربەی ناوەکانی پێشووش دا هەیە.

## 12- (الملأ) زلـەزلان:

وشەی (ملأ)یش کە مەبەست پێی ئەو زلەزلەو پارەدارو دەستەڵاتدارانەن کە سامانو دەستەڵاتەکەیانیان بە شێوەیەکی ناهەقو ناڕەوا پەیدا کردوەو هەمیشەش لە خزمەت تاغووتەکان دان, (30) جاران لە قورئانێدا هاتوە.

## 13- (الجاحدون) دان پێدانەهێنەران:

ماددەی (جحد) کە بە مانای پێ لێنەنانو دان پێدانەهێنانە بە شتێکدا کە دەزانێ ڕاستە، بە هەموو (صیغە)کانییەوە (12) جاران هاتوە.

## 14- (المترفون) خۆش گوزەرانان:

ماددەی (ترف) کە بە مانای ڕابواردنو خۆشگوزەرانیو زیادەڕۆیی لە ژیاندا دێ, بە هەموو (صیغە)کانییەوە (8) جاران دووبارە کراوەتەوە.

وە لە کۆتاییدا سەرنجی خوێنەری خۆشەویست بۆ مەسەلەیەکی یەکجار گرنگ

ڕادەكێشم, ئەویش ئەمەیە:-

وشەی (حزب) كە وەك (ابن منظور) دەڵێ: (بە كۆمەڵە خەڵكێك دەگوترێ كە دڵو كردەوەكانیان وێك بچن)[1] ئەو وشەیە (20) جاران لە قورئاندا بەكاربراوە, لەو (20) جارە (11) جار بە شێوەی كۆ (جمع) ئاوا: (الأحزاب), وە هەر (11) جاران بۆ پێڕو تاقمەكانی شەیتان بەكارهێنراوە، (2) جارانیش بە وشەی هەموو (كل) كراوەتە كۆ (كل حزب), دیسان هەر بۆ پێڕو تاقمەكانی شەیتان بەكاری هێنراوە، (2) جارانیش بە وشەی (حزب الشیطان) هاتوە, جارێكیش هەر بۆ پێڕی شەیتان بە (حزبە) هاتوە، یەك جاریش بە (حزبین) هاتوە, بەڵام مەبەست پێی دوو دەستە خەڵكە نەك كۆمەڵی خواو پێڕی شەیتان، هەروەها (3) جارانیش بۆ كۆمەڵی خوا بەكارهاتوە بە وشەی (حزب الله).

جا لێرەدا جێی سەرنجو ڕامان ئەوەیە كە پێڕی شەیتان بە زۆری بەشێوەی كۆ باسكراوە, ئەمەش ئەگەر هیچی لێ وەفامرێ ئەوەیە كە (كفر) پێڕو تاقمی جۆراو جۆری هەن, چونكە وەك گوتمان لەبەرئەوەی ڕەگو ڕیشەی لە سرو شتی ئینسانو دنیای واقیعدا نیە, ناچارە زووزوو بەرگان بگۆڕێو, لە زۆر شێوەو دیمەناندا خۆی بنوێنێ!!

دیسان بۆیە شەیتان پێڕو تاقمی جۆراو جۆری هەن, چونكە شەیتان نوێنەرو هەڵگری بیری بێبڕوایی (كفر)یە, ئنجا بیری بێبڕواییو بت پەرستیش, لە سۆنگەی ئەوەوە كە لە ڕوناكیو فراوانی دوارۆژ بێبەشە، وا لە شوێنكەوتووانی دەكات كە چاویان لەسەر دنیاو ئارەزووەكانی چڕ داگرنو, خۆیان لە قاوغو قەپێلكی ئەم ژیانە دنیاییەو ئەم دەوروبەرە بەرهەستەدا كوشمەڵە بكەن, جا بێگومان كە سانێكیش وابزانن ئەم ژیانە دنیاییە تاقە دەرفەتی تێیدا ڕابواردنو گوزەراندنەو, نازو نیعمەتە سنووردارەكانی سەرزەوی تاقە هۆی دڵ پێوە بەستنو دەست لێ گیركردنو

1) بڕوانە (لسان العرب) ب لا308 .

چێژ لـێ وەرگرتنن, کەسانێکی وا حەتمەن وەك کۆمەڵە سەگو داڵو قەلی دەوری کەلاکێکن کە تێك ڕۆدێنو یەکدی دەگرنو, لە ئەنجامی ئەو تێك ڕۆهاتنو دەستەو یەخەی یەکدی بوونەشدا دەبنە پێر پێرو تاقم تاقمو, هەرکەسە بە یاری خۆی هەڵدەڵێو کەسیش بە دۆی خۆی ناڵـێ ترشەو, قورئان گوتەنی: ﴿كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾(المؤمنون-53).

بەڵام بیـری خواناسی لە سۆنگەی ئەوەوە کە لەسەر چەند بنچینەیەك بنیات نراوە کە شتێکی ڕیشەدارو ڕەسەنن لە سروشتی ئینسانو واقیعی ژیاندا, وە لە سۆنگەی ئەوەوە کە شوێنکەوتووانی لەنێو جوغزی تەسکی ماددەو ئەم دنیا کەم تەمەنەو جیهانە بەرهەستە دەردێنێ, پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام), کە ڕابەرو چاوساغو پێشەوای بیری خواناسییو سەرقافڵەی کاروانی بەرەی هەقو کۆمەڵی خوا (حزب الله)ن, هەر لە ئادەم تا خاتەم، یەك قسەیان کردوەو خەڵکیان بۆ یەك ئامانجو مەبەست بانگ کردوە, وە ئەو کۆمەڵەش کە بەڕاستی شوێنیان کەوتوەو وەك پێویست تێیانگەییوە، هەمیشە کۆمەڵێکی پێکەوە براو تەباو یەك دڵو یەك ڕیزو پێکەوە جۆشدراو بووە, چونکە ئامانجو مەبەستیان وەدەستهێنانی خۆشگوزەرانیو ڕابواردنی ئەم دنیا گچکەو بەرتەسكو سنووردارە نەبووە, تا بەشیان نەکاتو لەسەری بەشەڕبێن، بەڵکو ئامانجو مەبەستیان وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خواو بەهەشتی بەرینو نەبڕاوە بووە, ڕەزامەندیی خوداو بەهەشتی پانو بەرینو ڕازاوەو نەبڕاوەش بەشی هەموو کەس دەکاتو، پێویست ناکات لەسەری بەشەڕ بێنو تێك هەڵپڕژێن، بەڵام پێویستە ئەوەش بگوترێ کە ڕاجیایی (إختلاف الرأي) لە بواری کارو چالاکی ئیسلامیدا مانای دژایەتیو ناکۆکیو ناتەبایی تەوژمی ئیسلامییو خاوەن بۆچوونو ئیجتیهادە جیاجیاکانی نییە، بەمەرجێك لە سنوورو ئادابەکانی شەرع نەچێتەدەرێ، گومانیشی تێدانییە کە ئەندازەی برایەتیو یەکدڵییو یەك ڕیزیی ئەهلی ئیسلام پەیوەندی ڕاستەخۆی بە

ڕێژەو ئەندازەی تێگەیشتن‌و پێگەیشتنیانەوە هەیەو، هەتا ئیمانیان کامڵ‌تر بێ، برایەتی‌و دۆستایەتی‌و یەکڕیزیی یان چاکترو پتەوتر دەبێ.

لێرەشدا کۆتایی بە بەندی یەکەم دێنین‌و دەچینە سەروکاری بەندی دووەم.

# ئەم بەنـده

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەندی دووەمە تەرخان کراوە بۆ توێژینەوەو تیشك خستنەسەر گرنگ ترین‌و زەقترین تایبەتمە ندی مە سولمانانی ڕا ست‌و ڕە سەنی شوێنکەوتووی ڕێ بازی پێغەمبەری خوا ﷺ کە بە: ئەهلی سوننەت (أ هل ال سنة) نا سراون, ئەو تایبەتمەندییە گرنگەش بریتیە لە هاوسەنگیی‌و مە یانجێتی (الأ تزان والو سطیة)، شایانی باسیشە کە ئەم بەندە لە سێزدە (13) خاڵ پێکهاتوەو لەهەر خاڵێکیا ندا باسی یەکێك لەو بوارە گرنگانە دە کەین کە ئەهلی سوننەت هاو سەنگیی‌و میانجێتی خۆیانیان تێدا پاراستوەو بەملاولادا دوو چاری لادان‌و ترازان نەبوون، ئەمەش ناوونیشانی ئەو سێزدە خاڵەیە:

1- هاوسەنگیی لە بواری پێناسەی ئیماندا.

2- هاوسەنگیی لە بواری زیادکردن‌و کەمکردنی ئیماندا.

3- هاوسەنگیی لە بواری ناوو سیفەتەکانی خوای پەروەردگاردا.

4- میانجێی لە بواری قەزاو قەدەردا.

5- هاوسەنگیی لە بواری مامەڵە لەگەڵ عەقڵ‌و نەقڵدا.

6 هاوسەنگیی لە بواری ڕێز لێگرتنی هاوەڵان‌و بنەما ڵەی پێغەمبەر ﷺ دا.

7 میانجێتی لە بارەی مەسەلەی کەرامەتی دۆستانی خوا (أولیاء الله)وە.

8 میانجێتی لەبارەی هەڵویست لە بەرانبەر زاناو پێشەوایاندا.

9 میانجێتی لەبواری کۆششکردن‌و لاساییکردنەوە (الاجتهادوالتقلید)دا.

10  میانجێتی لەبارەی مەسەلەی خەونو خورپە (الرؤيا والالهام)ەوە.

11- هاو سەنگیی لەبارەی هەڵوێ ست لە بەران بەر حوکمڕا نانی لارو ستەمکاردا.

12- هاوسەنگیی لەبواری زانیاری بەدینو شارەزایی لە ژیندا.

13  هاوسەنگیی لەبارەی مەسەلەی نەتەوایەتی یەوە.

ئێستاش خوا پشتیوان بێ خاڵ بەخاڵ پێیاندا دەچینە خوار:

# دەستپێك

## پێناسەیەكی كورتی ئەهلی سوننەت و جەماعەت:

بەڕێزان، نازناوی (ئەهلی سوننەت و جەماعەت) ناوونیشانی زۆربەی جەماوەری مسوڵمانانە، ئەوانەی كە لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ هەمیشە زۆربەی هەرەزۆری مسوڵمانان بوون، وە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ و چوار خەلیفە سەرراست (راشد)ەكانی -خوا لێیان ڕازی بێ- ڕۆیشتوون، (أبوبكرو عمرو عثمان و علي) خوا لێیان ڕازی بێ و ڕازیشیان بكات، جا تایبەتمەندیترین سیفەتی مسوڵمانانی ڕاستەقینە كە ئەهلی سوننەت و جەماعەتن ئەوەیە كە كۆمەڵێكی هاوسەنگ (متوازن) و میانە (وسط)ن، لە نێوانی تێپەڕاندن و بەزایەدان (الا فراط والتفریط)دان، لە هەموو شتێك خەتی نێوەڕاست دەگرن، نە كورتی دێنن، نە سەردەكەن، چونكە ئەگەر كەسێك تفەنگ بگرێتە نیشانە، ئەگەر سەر بكا، هەر لە نیشانە نادات، وە ئەگەر كورتیش بكا، هەر لە نیشانە نادات، بەڵكو دەبێ فیشەكەكەی ڕاست بەرەو ئامانج (هدف) بچێت ئەوجار دەیپێكێ، بۆیەش پێیان گوتراوە (أهل السنة)، (السنّة: الطریقة) ڕێبازو ڕێوشوێن، لەبەرئەوەی بەگشتی ئەو زۆربەو جەماوەرەی مسوڵمانان لە ڕێبازو ڕێوشوێنی پێغەمبەر ﷺ و لە ڕێبازی جێنشین (خلیفە)ە هیدایەتدراوو سەرراستەكانی پێغەمبەر ﷺ كە

(ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان‌و عەلی)ن- خوا لێیان ڕازی بێ-, لا یان نەداوەو بەملاولادا نەڕۆیشتون لەڕووی عەقیدەیی‌و فیکرییەوە.

کەواتە بۆیە پێیان دەگوترێ: (أهل السنة), چونکە بەپێی ڕێبازو ڕێو شوێنی پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتوون, نەك تەنیا لەبەرئەوەی کە سوننەتەکانیان جێبەجێ کردوون! وەك هەندێك کەس حالّی بوون, چونکە لە ئەسلّی زمان‌و لە زاراوی فەرمووده ناسانیشدا وشەی (سنة) یانی (طريقة)و (سنّة النبيّ) واتە: ڕێبازی پێغەمبەر (طريقة النبيّ), کە بەم چەمك‌و واتایەیان قورئانیش هەر ڕێبازی پێغەمبەرە ﷺ, وەك چۆن: فەرمایشت‌و کردەوەو دان پێداهێنان (قول وفعل وتقرير)یشی هەر سوننەتە, چ فەرز بن، چ سوننەت بن, بە تەعبیرێکی دی چ پێویست (واجب) بن, چ خۆبەخش (تطوّع)! جا هەرچەندە شەرعزانان (الفقهاء) وشەی سوننەت لە بەرانبەر فەرزدا بەکاردێنن‌و کاتێك کە دەڵێن: ئەو شتە، سوننەتە مەبەستیان ئەوەیە ئەگەر بیکەی خێرت دەگاو ئەگەر نەیکەی خێرە کەت لەدەست چووە، بەلاّم گوناهت ناگات، بەلاّم لەڕاستیدا ئەو چەمکەی شەرعزانان وشەی (سنة)ی بۆ بەکاردێنن واتایەکی زاراوەیی‌و عورفی (معنى اصطلاحي و عرفي)یەو ئەسلّی مانای وشەی (سنة) ڕێبازو ڕێوشوێنە.

ئەوە لەبارەی چەمك‌و واتای (سنة)و هۆی ناونرانی مسولّمانانی ڕەسەن بەو ناوەوە. ئنجا بۆیەش پێیان گوتراوە: (الجماعة)، چونکە هەمیشە کۆمەڵ بوون، دژی پەرتەوازەیی‌و دەستەدەستەیی بوون‌و دژی ئاژاوەنانەوەو یاخی بوونە، دیارە ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت کە لە سەر ئەو ڕێبازەش ڕۆیشتوون, فەرمانی خوای پەروەردگاریان جێبەجێ کردوە کە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ...﴾(النساء 59), وە وەسیەتی پێغەمبەریان ﷺ وەرگرتوە، کە فەرموویەتی: (أوصيكم بتقوى الله والسمع والطاعة وان كان عبداً حبشياً فأنّه مَنْ يَعِشْ منكم بعدي سَيَرى اختلافاً كثيراً فعليكم بِسُنَّتي و سنَّة

الخُلفاء الراشدين المهديين عضُّوا عليها بالنَّواجِذ واياكُمْ و مُحْدثَاتِ الامور فإنَّ كلَّ محدثةٍ بِدعَةٌ وكُلَّ بِدعةٍ ضَلالة)(1)، واتە: ڕاتان دەسپێرمو ئامۆژگاری تان دەکەم بە پارێز لە خوا کردن, وە بە بیستنو فەرمانبەریی کردن بۆ کاربەدەستو حوکمڕانی مسوڵمانی خۆتان ئەگەر کۆیلەیەکی (حەبەشی)ش بێت, کەسانێك کە لە دوای من دەژین, جیاوازیو کێشمەکێشێکی زۆر دەبینن, جا ڕێبازی من بگرنو ڕێبازی جێنشینە سەرڕاستە هیدایەتدراوەکانم بگرن, ددانەکانتانی لەسەر ڕۆگرن, وە خۆتان دوور بگرن لەو شتانەی کە لە دیندا پەیدا دەکرێن, چونکە بێگومان هەموو پەیداکراوێك بیدعەتەو هەموو بیدعەتێکیش گومڕاییو سەرلێشێواوییە.

هەروەها (جابر بن عبدالله) خوا لە خۆیو بابی ڕزای بێ, ئەم فەرموودەیەمان بۆ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە: (كان رسول الله ﷺ يقول فى خطبته: يَحمْدُ اللهَ بما هو أهله ثم يقول: من يَهْدِ الله فلا مُضِلَّ لَهُ, ومَنْ يضللْ فلا هادىَ له, أَصدَقُ الحديث كتابُ الله وأَحْسَنُ الهدى هَدْىُ محمدٍ, وَشرُّ الأمور مَحْدَثاتُها و كُلُ مُحْدَثَةٍ بِدْعة وكل بدعة ضلالة)(2)، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك کە وتاری دەدا پاش ئەوەی کە وەك بۆ خوا شایستەیە ستایشی دەکرد, دەیفەرموو: هەرکەسێك خوا هیدایەتی بدات کەس ناتوانێ لە ڕێگا لای بدات, وە هەر کەسێکیش خوا ڕێی لێ ون بکات (و سەری لێ بشێوێنێ) کەس ناتوانێ ڕێگای پێشان بدات, ڕاسترین فەرمایشت کتێبی خوایەو چاکترین ڕێبازی ڕێبازی موحەممەدە, وە خراپترین ئیش ئەوانەن کە لە دیندا پەیدا دەکرێن, هەموو پەیداکراوێکێش بە بیدعەت لە قەڵەم دەدرێ, هەموو بیدعەتێکیش گومڕاییو سەرلێشێواوییە.

---

1) رواه الامام احمد واصحاب السنن, وصححه الحاكم وقال على شرط البخارى ومسلم, ووافقه الذهبي, وحسنهُ وصححه ابن رجب الحنبلي, بڕوانە (الشريعة/ للآجرى) بەرگی 1، لاپەڕە (401–403), وە بڕوانە (جامع العلوم والحكم لابن رجب الحنبلي) لاپەڕە (315–320) .

(2) رواه الامام احمد ومسلم والبيهقي، بڕوانە (الشريعة للاجري) بەرگی1، لاپەڕە393, و لاپەڕە 398.

جا با ئێستا سەرنج بدەین:

بزانین ئەو گەورەترین تایبەتمەندیی یەی ئەهلی سوننەتو جەماعەت, کە بریتیە لە: هاوسەنگیی‌و میانجێتی بوونو گرتنی خەتی نێوەڕا ستی ن ێوان تێپەڕا ندنو بەزایەدان (الافراط والتفریط) لە چی‌و چیدا دەردەکەوێ:

# خاڵی یەکـــەم

# هاوسـەنگیی لە بواری پێناسـەی ئیماندا

ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت لەبارەی پێناسەی ئیمانەوە لە نێوان جەهمی یەکان‌و مورجیئەکان لەلایەك‌و خەواریج‌و موعتەزیلەکان لەلایەکی دی, دان, لەنێوان ئەو دوو ڕێڕەوەدان، چونکە جەهمی یەکان‌و مورجیئەکان ئیمان لە بەڕاست زانینی دڵ (تصديق القلب)دا کورت هەڵدێنن، بەڵکو جەهمی‌یەکان دەڵێن: بەڕاست زانینیشی ناوێ‌و ئیمان بریتیە لە زانینی ڕووت (المعرفة المجردة), واتە: تەنیا بزانی خوا حەقە ئەوە تۆ ئیمانداری، کە بێگومان ئەوانە لە پێناسەی ئیماندا دوو چاری کورت هێنان‌و بەزایەدان بوون.

خەواریج‌و موعتەزیلەکانیش بەپێچەوانەوە تێیان پەڕاندوەو زێدەڕۆیی‌و (إفراط)یان کردوەو گوتوویانە: ئیمان وێڕای بەڕاست زانینی دڵ‌و دان پێداهێنانی زمان بریتیە لە تێکڕای کردەوەکانیش, واتە: هەر گوناهێك ئینسان بیکات پێی کافر دەبێت‌و هەر تاعەتێك ئینسان بیچوێنێت پێی لە دین دەردەچێت!

بەڵام ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت خەتی نێوەڕاستیان گرتوەو دەڵێن: نەوەك جەهمی یەکان‌و مورجیئەکان دەڵێن: ئیمان تەنیا پەیوەندی بەدڵەوە هەیە, وە نەوەك, خەواریج‌و موعتەزیلەکان دەڵێن: هەرکەسێك گوناهێکی کرد کافر بێت‌و

هەرکەسێك تاعەتێك بچوێنێ کافر بێت! بەڵکو ڕاستو هەق ئەوەیە کە ئیمان بە طاعەت بەهێز دەبێو زیاد دەکات, وە بە گوناح ئیمان کز دەبێو کەم دەکات, بەڵام مادام ئەو گوناحە کوفرو شیرك نەبێ, ئینسانی پێ لە دین نا چێتەدەر، وە هەرچەندە ئەسڵی کردەوان مەرجە بۆ پەیدابوونی ئیمان, چ کردەوە (عمل)ی دڵ بێ, چ هی ئەندامەکان بێ، کردەوە مەرجە بۆ پەیدا بوونی ئیمان, واتە: ئەسڵی کردەوە مەرجی پێکهێنەری ئیمانە نەك وەك هەندێك دەڵێن: مەرجی تەواوکەری ئیمان بێ! بەڵکو مسوڵمان دەبێ ئەسڵی کردەوەی هەبێ, چ کردەوەی دڵ, چ کردەوەی ئەندامەکان, بەڵام تۆ بڵێی: دەبێ هەموو کردەوەکانی تێدابن, وە نابێ هیچ گوناهێکی کردبێ ئەوجار دەبێتە مسوڵمان! ئەوە وانیە, دیارە لەبەرگی یەکەمیشدا بە درێژی لەوبارەوە دواوین، بۆیە لێرە بەم ئاماژە کورتە وازی لێدێنین[1].

---

1) بڕوانە بەرگی یەکەمی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی، (دەرسی دووەم: هەڵسەنگاندنی پێناسەی ئەهلی سوننەتو ئەهلی بیدعەت بۆ ئیمان) لاپەڕە (62-110) چاپی یەکەم، 2006.

## ( خاڵــی دووەم )

## هاوسـەنگیی لە بواری زیاد کردن و کەمکردنی ئیماندا :

لەوبارەشەوە ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە نێوان مورجیئەو خەواریج دان و، دەڵێن: مورجیئەکان ڕاست ناکەن کە گوناح زیانی نەبێ بۆ ئیمان و تا عەتیش ئیمانی پێ زیاد نەکات و گەشە ناکات، وە خەوارجیش هەر ڕاست ناکەن کە بە پێچەوانەی ئەوانەوە، پێیان وایە کە بە نەکردنی هەر تاعەتێك ئیمان لەنێو دەچێ و بە کردنی هەر گوناهێکیش دیسان ئیمان هەر لەنێو دەچێ، ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەڵێن: نەخێر چواندنی تاعەت و کردنی خراپە، ئیمان لانابەن، مەگەر چواندنی ئەو تاعەتە بەڵگەیەکی لەسەربێ کە ئینسانی پێ کافر دەبێ، وەك نوێژ، یاخود کردنی ئەو گوناهە بۆ خۆی لە خۆیدا کوفر بێت، ئەوجار ئینسانی پێ لە دین دەردەچێ، ئەگەرنا مەرج نیە کە هەموو تاعەتێك ئەنجام بدەی ئەوجار ببیە مسوڵمان، وە خۆ لە هەموو گوناهێك دوور بگری ئەوجار بە مسوڵمان بمێنییەوە، دەڵێن: بەڵام ئیمان بە تاعەت زیاد دەکات، وە بە گوناهیش کەم دەکات، (الایمان یزید بالطاعة، وینقصُ بالمعصیة) کەواتە: لەوەشدا هەر خەتی نێوەڕاستیان گرتوە پوختەی قسان: ئەهلی سوننەت دەڵێن: ڕاست نیە کە ئیمان هیچ پەیوەندی بە تاعەت و گوناهەوە نەبێت وەك مورجیئە دەڵێن، وە واش نیە کە ئیمان بە نەکردنی

هەر تاعەتێك لەنێو بچێ‌و بەكردنی هەر گوناهێكیش هەر لەنێو بچێ، وەك خەواریج دەڵێن(1).

## ( خاڵی سێیەم )

## هاوسەنگیی لە بواری ناوو سیفاتەكانی خوای پەروەردگاردا

لەم مەسەلەیەشدا ئەهلی سوننەت لە نێوانی (مُشَبِّهة) و (مُعَطِّلة) دان، لەلایەكەوە هەموو سیفەتەكان بۆ خوا دەچەسپێنن, هەروەها تێكڕای ناوەكانیشی, بەڵام لەولاشەوە خوا بەپاك دەگرن كە ناوو سیفەتەكانی وەك هی دروستكراوەكانی بن، بەڵام ئەهلی بیدعەت بەپێچەوانەوە، هەندێكیان كە پێیان دەگوترێ: (مُعَطِّلة) كورتیان هێناوەو بەزایەیان داوە، لە سۆنگەی ئەوەوە كە خوای بەرزو مەزن‌و بێوێنە لە ناوو سیفەتەكانی دادەڕووتێنن‌و بەشێكیان دەڵێن: خوا هیچ سیفەت‌و ناوێكی نیە كە ئەمانە (الجهمية)ن, وە بەشێكیشیان ژمارەیەكی زۆر لە ناوو سیفەتەكانی لێ لادەبەن, ئەمانیش ماتوریدی‌یەكان‌و ئەشعەرییەكانن، كە دیارە لەوەشدا چاویان لە موعتەزیلەكان دەكردو لەژێر كاریگەریی فیكری وان دابوون.

شایانی باسیشە ئەمانە بە هەرسێك بەشەكەیانەوە وێڕای (المُعَطِّلة) نازناوی (نفاة الصفات)یشیان هەیە، واتە: لابەری سیفەتەكانی خوا، وە هەندێكی دیكە لە ئەهلی بیدعەت كە (المشبهة)یان پێ دەگوترێ, بە بیانووی ئیسپاتی ناوو سیفەتەكانی خواوە, خوا (عزّ وجلّ) دەشوبهێنن بە دروستكراوەكانییەوە بە جۆرێك ناوو سیفەتەكانی ئیسپات دەكەن كە وەك هی دروستكراوەكانی بچن، واتە ئەمانیش بە

(1) ئەم مەسەلەیەمان لە بەرگی یەكەمدا باش تووێژینەوە, بڕوانە دەرسی دووەم: لاپەڕە (62–110).

پێچەوانەی ئەوانی دیکەوە تێیانپەڕاندوەو زێدەڕۆیی (إفراط)یان کردوە, بەڵام ئەهلی سوننەت نە کورتی دێنن نە تێدەپەڕێنن، بەهیچ لایاندا سنووری شەرع نابەزێنن[1].

## (خـــاڵی چــوارەم)

## میانجێتــی لە بــواری قــەزاو قـــەدەردا

ئەهلی سوننەت, مسوڵمانانی ڕەسەنو ڕاستەقینە، لە بواری قەزاو قەدەریشدا لەنێوان تۆبزی لێکراو (مجبور)بوونی ئینسانو بەدیهێنەر (خالق)بوونیدا هەڵوێست وەردەگرنو دەڵێن: نە وایە مرۆڤ هیچ (لا شيء) بێت, وە نە واشە کە هەموو شت (کل شيء) بێت، بەڵکو ئینسان لە بواری دیاریکردنی چارەنووسی خۆیو ئەنجامدانی کردەوەکانیدا شتەو ڕاست نیە بگوترێ دەستەپاچەیە، وەك (جبریة) دەڵێن، وە ڕاستیش نیە بگوترێ: هەمەکارەیە، وەك (معتزلة) دەڵێن، چونکە جەبرییەکان دەڵێن: ئینسان وەك پەڕە مریشکێك وایە کە (با) دەیلارێنێتەوەو خۆی هیچی لەدەست نایەتو هەرچی دەیکات, خوا پێی دەکاتو بۆ خۆی هیچ کارە نیە، وە لە بەرانبەری واندا ڕاست بە پێچەوانەوە موعتەزیلەکان دەڵێن ئینسان هەرچی دەیکات, بۆ خۆی دەیخوڵقێنێو بەدی دەهێنێ، بگرە هەندێکیان زیاتریشیان تێپەڕاندوەو گوتوویانە: خوا ئەو کردەوانەی ئینسان دەیانکات هەر نایانزانێت, تا ئینسان ئەنجامیان نەدات, هەندێکیشیان گوتوویانە: نەخێر, خوا

1) لە بەرگی سێیەمی ئەم زنجیرە دەرسەدا تویژینەوەی خەستو خۆڵمان لەوبارەوە کردوە.

دەیانزانێ, بەڵام ئینسان بۆ خۆی کردەوەکانی خۆی دروست دەکات و دەیانخولقێنێ, وە خوا هیچ حەقی بە سەرەوە نیە هەرچەندە خوا طاعەتی خەڵکی ویستوە, بەڵام خەڵکی گوناهبار بۆخۆی گوناح دەکات! واتە: ویست و خواستی بەندەکانیان زاڵ دەکرد بەسەر ویست و خواستی خوادا! ئەوەش بێگومان بێئەدەبییەکی زۆر گەورەیە لە بەرانبەر خوادا (سبحانه وتعالى)، بەڵام ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەڵێن: نەخێر, جەبرییەکان ڕاست ناکەن کە ئینسان هیچ لەدەستنەهاتوو بێت و تۆبزیی لێکراوێکی ناچارکراوی دەستەپاچە بێت, وە موعتەزیلەکانیش ڕاست ناکەن کە ئینسان بەدیهێنەری کردەوەکانی بێ و ویست و خواستی بەسەر ویست و خواستی خوادا زاڵ بێ, بەڵکو ئینسان لەو نێوەدا شتەو شتی لەدەست دێ و دەتوانێ شت وەدەست بێنێ و, کردەوە ئەنجام بدات, بەڵام بۆخۆی نایخولقێنێ, چونکە بەدیهێنەر (خالق) بەس خوایە: (الله خالق كل شيء) جا موعتەزیلەکان لە شتێکدا بە هەڵەدا چووبوون، پێیان وابوو ئەگەر بگوترێ هەموو شتێك بە ویست و خواستی خوایە, گوناح و تاوان و کوفرو شیرك و نیفاق, ئەوە مانای وایە گوتوومانە، خوا (عزّ و جلّ) لە کوفرو شیرك و نیفاق و خراپە و تاوان ڕازییەو ئەو شتانە هەموویان لەلای خوا پەسندن، چونکە پێیان وابوو کە خواست و ویستی خوا لەگەڵ ڕەزامەندیی خوادا جووتن و هەرشتێك خوا بیەوێ, دیارە پەسندیشی کردوە! بەڵام خوای کاربەجێ بە دەقی ئایەت ڕایگەیاندوە کە هەموو شتێکی دەوێ, ویست و خواستی لە سەر هەموو شتێکەو هیچ شتێك بەبێ ویستی خوا نەبووەو نابێ, بەڵام بە هەموو شتێك ڕازی نیە، بە ئیمان و طاعەت و چاکەکاریی ڕازییە, بەڵام بە نیفاق و لادان و خراپە ڕازی نیە, وەك دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ...﴾(الزمر- 7)، واتە: ڕازی نیە کە بەندەکانی کوفر بکەن, بەڵام ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن پێی خۆشەو ڕازییە, ڕازی نیە کوفر بکەن, بەڵام ویستی وایە لە لایەن کافرانەوە کوفر بکرێ و دەرفەتیشیان دەدات بە مەبەستی تاقیکردنەوەیان.

کەواتە: لە مەسەلەی قەزاو قەدەریشدا دیسان ئەهلی سوننەتو جەما عەت خەتی نێوەڕاستیان گرتوە[1].

## (خـــاڵی پێنجـــەم)

## هاوســەنگیی لە بواری مامـەڵە لەگەڵ عەقـــڵو نەقـــڵدا

لەوبارەشەوە ئەهلی سوننەتو جەماعەت, نە وەك موعتەزیلەکان عەقل دێننە ڕیزی (وحي)و زانیاری بێسنووری خوا, وە وەکو هەندێ لە ڕوا ڵەت گەرا یەکان (الظاهرية)یش ناکەن کە بە بیانووی ڕێزگرتن لە شەرعو نەقڵ, د ێنن عەقڵ بە سووكو کەم تەماشا دەکەنو حیسابێکی وای بۆ ناکەن، بەڵکو لەلایەکەوە ڕێز لە (عەقڵ) دەگرنو ئەو ئەرکەی کە شایستەیە ئەنجامی بداتو جێبەجێی بکات پ ێی دەسپێرن, وە لەو سنوورەدا کە دەتوانێ بێتو بچێ کاری پێدەکەن, بەڵام ناشهێڵن سنوور ببەزێنێو لە خەت تێپەڕێنێو، وەك عەقڵ گەراو فەیلەسووفەکان ناکەن کە سەد بەڵایان بەسەر خۆیان هێناوە, لەبەرئەوەی لە چەند شتێکدا پشتیان بە عەقڵ بەستوە کە کاری عەقڵو مەودای توانای عەقڵ نیەو عەقڵ ناتوانێ ئە سپی خۆی تێدا تاوبدات، واتە: ڕێزی عەقڵ دەگرن, بەڵام ناهێڵن لە سنووردەر چێ, وە لە لایەکی دیکەشەوە (نەقڵ) کە هەڵقوڵاوی وەحی خوای پەروەردگارە دەکەنە حەکەمو لە سەرووی عەقڵەوە دایدەنێن, بەڵام واش نا کە هەر دەقێك بە ناوی (وحی) یەوە بیستیان با لەگەڵ عەقڵیش تێك بگیرێ, یەکسەر عەقڵەکەی بۆ ڕەفز ب کەن, وەك (ظاهرية)کان! نەخێر, بەڵکو ورد دەبنەوە بزانن ئا یا ئەو دەق (نص)ە لەڕووی

1) ئێمە لە بەندی دووەمی بەرگی پێنجەمی ئەم زنجیرە دەرسەدا تویژینەوەی تێرو تەسەلمان لەبارەی قەزاو قەدەرەوە کردوە، بۆیە لێرە هەر بە کورتی بەسەریدا ڕەتبووین .

سەنەدەوە ڕاستە؟! جا ئەگەر ڕاست بوو بە عەقڵ دەڵێین: تۆ تێی نا گەی، بەڵام ئەگەر ڕاست نەبوو، دەڵێین ئەو دەقە هەڵقوڵاوی وەحی نیەو لە حیکمەتو زانیاری بێسنووری خواوە سەرچاوەی نەگرتووەو سەنەدەکەی تەواو نیەو، پێویست ناکات بە عەقڵ بڵێین: تۆ تێی ناگەی! لەوەشدا بێگومان ئەهلی سوننەتو جەماعەت, خەتی نێوەڕاستیان گرتوەو هەرکام لە عەقڵو نەقڵیان وەك خۆیان ناسیوەو مامەڵەی پڕ بەپێستو شایستەیان لەگەڵ کردوون.

## ( خاڵی شەشەم )

## هاوسەنگیی لە بواری ڕێزلێگرتنی هاوەڵانو بنەماڵەی بەڕێزی پێغەمبەردا ﷺ :

بەڕێزان!

کاتی خۆی لە مێژووی ئیسلامدا دوو تیر پەیدا بوون, کە بریتی بوون لە: (الناصبة)و (الرافضة)، (النّاصِبة) ئەوانە بوون بەر بەرەکانێو دوژمنایەتی بنەماڵەی بەڕێزی پێغەمبەریان دەکرد ﷺ بە بیانووی ئەوەو لەژێر پەردەی ئەوەدا کە بەرگری لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ دەکەن, لە بەرانبەری ئەوانیشدا کۆمەڵێکی دی پەیدا بوون کە ناونران (الرافضة) ئەوانیش بە بیانووو لەژێر پەردەی خۆشویستنی بنەماڵەو خزمانی بەڕێزی پێغەمبەردا ﷺ دژایەتی هاوەڵانی دڵسۆزی پێغەمبەریان دەکردو دەیانبوغزاندنو جنێوو قسەیان پێدەگوتن، جا بێگومان ئەم دوو هەڵوێستە هەردووکیان لادانن، هەریەکەیان بەلایەکدا، بەڵام

ئەهلی سوننەتو جەماعەت هەم رێزی هاوەڵانی دڵ سۆزی پێغەمبەریان ﷺ گرتوەو خۆشیان ویستوون، وەهەم رێزی بنەماڵەی بەرێزی پێغەمبەریشیان ﷺ گرتوەو خۆشیان ویستوونو دۆستایەتی هەردوو لایانیان کردوە هیچ کامیانیان بۆ ئەوی دیکە فەرامۆش نەکردوە، وەك نموونەیەك لەوبارەوە ئاماژە بە رووداوێکی مێژوویی بکەم باشە: (شێخ موحەممەدی خاڵ) لە کتێبێکدا دەربارەی ( شێخ مەعروفی نۆدەهی) خوا لێیان خۆش بێ- نووسیویەتی دەڵێ: کاتی خۆی، کە (نادر شای ئەفساریی) هات ( سلێمانی) گرت نامەیەك بۆ ( شێخ حەسەنی گلەزەردە) دەنووسێ کە وەرە بۆ لامان، تۆ لە بنەماڵەو خزمانی پێغەمبەری ﷺ، ئێمە رێزت دەگرین، خۆت دەزانی کە من دیفاع لە بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ دەکەم.

(شێخ حەسەنی گلەزەردەش) -رەحمەتی خوای لێبێ-، وەڵامی بۆ دەنێرێتەوەو پێی دەڵێ: من ئیشم بە تۆ نیە، ئەگەر تۆش ئیشت بە منە دەتوانی بێی، ئەوەش کە ئیددیعای خۆشەویستی بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ دەکەی، شتێکی باشە، بەلام بەمەرجێك بوغزی هاوەڵان (أصحاب)ی تێکەڵ نەبووبێت، ئەگەر بوغزاندنی هاوەڵانی بەرێزی پێغەمبەری تێکەڵ بووبێ بە کەڵکی هیچ نایەتو دڵت پێی خۆش نەبێت!

بەڵێ ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەو بارەشەوە خەتی راستو نێوەراستیان گرتوەو دەڵێن: هەم بنەماڵە (أهل البيت)و هەم هاوەڵان (أ صحاب)!، چونکە پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی ئامۆژگاری مسوڵمانانی کردوە کە رێز لە هەردووکیان بگرن.

ئەوەتا دەربارەی هاوەڵان دەفەرموێ: (لا تَسبُّوا أصحابي فوالذي نفسي بيده لَوْ أَنْفَقَ أحدكم مِثْلَ أُحدٍ ذَهَباً ما بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهم ولا نَصيفَهُ)[1]، واتە: جنێوو قسەی ناشیرین بە هاوەڵانی من مەڵێن، سوێند بەو زاتەی کە گیانی منی بەدەستە ئەگەر

1) متفق عليه، عن ابي سعيد الخدري -رضي الله عنه-، بڕوانە (السنة، ابن ابى عاصم) بەرگی 2، لا پەڕە 677-678.

یەکێك لە ئێوە بە ئەندازەی چیای (ئوحود) زێڕ ببەخشێ، ناگاتە مستی یەکێك لە هاوەڵان و بەڵکو ناگاتە نیوەی مستی یەکێکیشیان.

لەبارەی بنەماڵەو خزم و کەس (أهل البیت)ی بەڕێزی خۆشی یەوە، ئەوانەی کە لەسەر جادەی شەریعەتن، دەفەرمویێ: (أمّا بَعْدُ أیها الناس إنّما أَنْتَ ظِرُ أنْ یأْتي رسولُ مِنْ ربّـي فأُجیبَ وإنّـي تارِكُ فیکمُ الثَّقَلَیْنِ أَحَدُهُما کتابُ الله فیه الهُدی والنّور فاستمسکوا بکتاب الله وخذُوا به، فَرَغَّبَ في کتاب الله وَحثَّ علیه ثم قال: وأَ هْلُ بَیْتی أُذَکِّرکُمُ اللهَ في أَهْلِ بیتي، ثلا ثاً)[1]، وا تە: پێغەمبەر ﷺ و تاری داو فەرموویی: ئەی خەڵکینە! من چاوەڕێ دەکەم کە نوێنەرێك لە پەروەردگار مەوە بێت و منیش وەلامی بدەمەوە (واتە: گیانم بکێشێ و ژیانی دونیا جێبێڵم) جا من دووشتە قورسەکەتان لەنێودا بەجێ دێڵم: یەکەمیان کتێبی خوا کە ڕێنمایی و ڕۆشنایی تێدایە، جا دەست بە کتێبی خواوە بگرن و جێبەجێی بکەن، (ڕاوی دەڵێ: زۆر هانی مسوڵمانانیدا کە دەست بە کتێبی خواوە بگرن)، پاشان فەرمووی: وە بنەماڵەو خزمانم خواتان بیردەخەمەوە سەبارەت بە بنەماڵەو خزمانم، سێ جار ئەمەی فەرموو، (واتە: ئاگاتان لە خۆتان بێ لە بەرانبەر بنەماڵەو کەسوکاری مندا).

ڕووحم فیدای بێ، دیارە خوای زاناو شارەزا هەواڵی پێ داوە کە لە دوای خۆی زۆر بێ ڕێزیی دەکرێ بە بنەماڵە بەڕێزەکەی، ئەوەی کە بەسەر (علي)و (حسن و حسین) هێنرا -خوا لێیان ڕازی بێ-، وە ئەوەی کە بەسەر (زین العابدین و زید بن علي و محمد نفس الزکیة و ابراهیم)و ئەوانی دی هات!

بێگومان پیاوانی بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ پیاوانێکی لێ هاتوو هەڵکەوتوو بوون و بە زۆری بە چەوسێنراوەیی ژیان و، زۆر تەنگیان پێ هەڵچنرا لە سەر مەسەلەی حوکم و سیاسەت، لەپێش دا تیرەی (بنـي أمیة) دژایەتییان دە کردن،

1) رواه أحمد ومسلم والترمذي والطبراني، بڕوانە (السنة، ابن ابي عاصم) بەرگی2، لاپەڕە 1022.

دوایی (بني عباس)یش کە بە حیساب ئامۆزای خۆیان بوون, ئەوانیش هەر دژایەتی یان کردن, کە لە ڕاستیدا مەسەلەکە هەمووی حوکمو سیاسەت بوو.

کەواتە: ڕێزگرتن لە هەردووکیان, هەم لە بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ ئەوا نەی، کە لەسەر ڕێوشوێنی ئەو ڕۆیونو دەڕۆن, وە هەم لە هاوەڵانی بەڕێزی, لە سەر مسوڵمانان فەرزو پێویستە، وە کاتی خۆی هیچ کێشەو گرفتێك لە نێوان بنەما ڵە (أهل البيت)و هاوەڵان (اصحاب)دا نەبووە، بەڵکو زۆر لەیەك نزیك بوونو لە یەك جیا نەبوونو یەکدیان خۆش ویستووە، بۆیە نەك هەر ڕێزگرتن لە یەکێکیان دژو پێچەوانەی ڕێزگرتن لەوی دیکەیان نیەو لەگەڵی تێك ناگیرێ, بەڵکو هەردووکیان تەواوکەری یەکدینو بەبێ یەکدی بەکەڵك نایەن, ئەنجا گومانی شی تێدا نیە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکام لە هاوەڵانو بنەما ڵەی دڵ سۆزو بەڕێزی خۆی خۆشویستوە. کەواتە: با ئێمەش هەروا بکەینو هەردووکیانمان خۆش بوێ!




## ( خاڵی حەوتەم )

## میانجێتی لەبارەی مەسەلەی کەرامەتی دۆستانی خوا ( أولیاء الله )وە:

لەم مەسەلەیەشدا هەڵوێستی ئەهلی سوننەتو جەماعەت بەم شێوەیەیە: لەلایەکەوە دان دێنن بە کەرامەتی ئەولیاداو بەڕاستیان دەزانن و دۆستانی خوا یان لەلا بەرێزەو دەڵێن: بۆ خوا زۆر ئاسانە کە هەندێ شتی نائاسایی ( خارق العادة)یان بۆ بکات، بەڵام بە مەرجێك لە سنووری شەرعو عەقڵو واقیع نەچێتە دەرێ!

کەواتە لە لایەکەوە دانی پێدادەهێنن, بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە دەڵێن: نا بێ ئەوشتە لە سنووری شەرعو عەقڵ دەربچێو، نابێ پێچەوانەی واقیع بێ، واتە وەك موعتەزیلەکان ناکەن، کە بڕوایان بە (کەرامەتی ئەولیا) نیەو بێگو مان ئەوەش کورت هێنانو بەزایەدان (تفریط)ە، بۆیە ئەهلی سوننەت خۆیان لەو هەڵوێ ستە دوور گرتوە، بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە ئەهلی سوننەت وەك زۆر یێك لە ئەهلی تەصەووف ناکەن، کە بێگومان لەوبارەوە تێیانپەڕا ندوەو گ یـرۆدەی ز یێدەڕۆیی (إیفراط) بوون، کە د یێنن چەندان حیکا یەتو شتی ناڕا ستو درۆو دەلە سە هەڵدەبەستن بەناوی کەرامەتی ئەولیاوە! د یارە دۆ ستانی خواش کەرا مەتی ئاشکرایان ئەوەندە زۆربووە, کە پێویستیان بە شتی درۆو حیکایەت بۆ هەڵبە ستن نیە بۆ نمونە: (إبراهیم بن ادهمو شیخ جنید البـ غداديو عـ بدالقادری الگیلا نیو بهاءالدین نقشبندو سید أحمدی سەرهەندیو مەولانا خالیدی شارەزووریيو کاك ئەحمەدی شێخو شێخ یوسفی بورهانی) خەڵکێکی زۆر کەرامەتیان لـێ بینـ یونو بیستون، ئەوەتا (شیخ الاسلام ابن تـیمیة)ی حەڕڕانی -ڕەحمەتی خوای لەسەربێ-, دەربارەی (عبدالقادری گەیلانی) دەڵێ: (کەرامەتی شێخ عـ بدالقادری گەیلانی گەیشتوونە ڕادەی (تواتر), وە هەر جارێك کە لە (مجـ موع الفتاوی)کە یدا ناوی دەبات[1]، دەڵێ (قدس سِرُّهُ) وا تە: ڕوو حی پاك ڕاگ یـرێ, وە یەکێك لە نامیلەکەکانی شێخ عەبدولقادری شەرح کردوە: بەناوی (فتوح الغیب), کە لەنێو (مجموع الفتاوی)کەیدا هاتوە، کەواتە: هەندێك کەس کە بەناوی سەلەفییەتەوە بە بانگەشەی پابەندیی بە قورئانو سوننەتەوە، بە ڕە هاییو بە گ شتی دژا یەتی

1) دیارە (مجموع الفتاوی) کۆمەڵە فەتواو نامیلکەیەکی (ابن تیمیة)نو دوای خۆی کۆکراونەوەو چاپ کراون, بۆیە با کەس وانەزانێ کە من مەبەستم ئەوەیە (ابن تیمیة) کتێبێکی بەو ناوەوە نووسیوە .

(تەصەووف) دەکەن‌و پێشیان وایە کە زانایانی وەك (ابن تیمیة وا بن القیم الجوزیة)یش وابوون، بەهەڵەداچوون.

بێگومان ئەوانە هەم (ابن تیمیەو ابن القیم)یان نەناسیوەو هەم پێ شەوایانی ڕاستەقینەی تەریقەت‌و تەصەووفیشیان هەر نەناسیوە، چونکە ئینسانی مسوڵمان دەبێ وریابێ، هەر لەخۆوەو لەبەر تیشکی واقیعێکی هەڵەدا کە صۆفی یەك دەبینێ، یان دەروێشێك دەبینێ، یان شێخێکی ساختەو تەزویر دەبینێ، نابێ شێخە حەقیقییەکان‌و پێشەوا گەورەو هەڵکەوتووەکان‌و دۆستانی خوای لەبەر چاو بکەوێ، کە لە بواری تەزکیەو تەصەووفدا خزمەتی زۆریان کردوەو زۆر یێك لە خەڵکیان بە یارمەتی خوا هیدایەت داوەو لەسەر دەستی ئەوان تۆبەی کردوەیان ئیمانی هێناوە! وە نابێ لەو ڕاستییە مێژوویی‌یەش بێ‌ئاگابین کە لە وڵاتانی دوورە دەستی وەك ئەفریقیاو ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ئیسلام کە گەیشتۆتە دەستی خەڵك، زیاتر بە هۆی پێشەوایانی خواپەرست‌و هەڵکەوتووی ڕێبازەکانی تەصەووف ( طرق التصوف)ەوە بووە، بەڵام ئەوەی ئێستا کە کابرا بە ناوی تەصەووفەوە دووکانێك دادەنێ‌و خۆی پێ دەژێنێ، حیساب‌و بازاڕێکی دیکەیەو لەگەڵ ئەوەی ئەوسا بەس ناویان یەکە، بەڵام نابێ ئەو شێخەی ئێستا ئەوانی ڕابردوو شت لەبەر چاو بخات، هەروەك نابێ کە مەلایەك دەبینی دەڵێ: من ( شافعي) مەزهەبم، بەڵام بۆتە دەستکەلای حیزبێکی عەلمانی‌و فەتوای ناهەقی پێ دەردەکات، نابێ بەهۆی ئەو جۆرە مەلایەوە کە ڕەنگە تەنانەت دەستنوێژەکەیشی وەك هی شافیعی -ڕەحمەتی خوای لێ بێ- نەبێ تۆ (ئیمام شافیعی)ی شت لەبەر چاو بکەوێ[1]!، چونکە مسوڵمان دەبێ وریاو دووربین‌و وردبین بێ‌و بە ویژدان‌و ئینصافەوە حوکم بدات.

---

1) لەکتێبی (زانایانی ئیسلام)دا باسی چەند هەڵوێست‌و ڕەوشتێکی شافیعی‌مان کردوە.

(ابن تيمية) -ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەربارەی (كرامات الاولياء) دەڵێ: (ومِنْ أُصول أهل السُّنة التصديق بِكرامات الاولياء في أنواع العلوم والمكاشفات وأنواع القدرة والتأثيرات، والمأثور عن سالفِ الأُمَم في سورة الكهف وغيرها، و عن صَدْرِ هذه الأمة من الصحابة والتابعين وسائر فِرَق الأُمَّة، وهي موجودة فيها الى يوم القيامة)[1]، واتە: لە بنچینەکانی ئەهلی سوننەت بڕواهێنانو دانهێنانە بە کەرامەتی دۆستانی خوادا، لە جۆرەکانی زانیاریو شت بۆ کەشف بوون، وە لە جۆرەکانی توانایيو کارتێکردن، وە ئەوەی کە لە ئۆممەتانی پێشوو وەکو لە سوورەتی (الكهف)دا گێڕراوەتەوە، وە ئەوەی لە پێشینەی ئەم ئۆممەتە لە هاوەڵانی بەڕێزو لە شوێنکەوتووانیان، وە لە باقی چینەکانی ئوممەت پێمان گەیشتوە، وە هەتا ڕۆژی قیامەتیش، کەرامەتی دۆستانی خوا بەردەوام دەبێ، وە لەپێش (ابن تيمية)و لە پێش هەر زانایەکی دیکەشدا خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ۞ الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ۞ لَهُمُ الْبُشْرَىٰ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾[2]، واتە ئاگاداربن، دۆستانی خوا نەترسیان لە سەرەو نە پەژارەش دەیانگرێ، ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو تەقوایان کردوە، موژدەیان بۆ هەیە لە ژیانی دونیاو لە دوارۆژیشدا، بڕیارەکانی خوا گۆڕانیان بەسەردا نایەت، بێگومان ئا ئەوە سەرکەوتنو بەمراد گەیشتنی مەزنە.

کەواتە: دۆستانی خوا ئەوانەن کە ئەهلی ئیمانو تەقوا بن، ئەوانەی ئیمانو تەقواشیان هەبێ، ترسو پەژارەیان نابێ وەك خەڵك، خەڵك لە مەرگو لە ڕزق

1) شرح العقيدة الواسطية، للشيخ محمد صالح العثيمين، لاپەڕە 297 306 .
2) (يونس: 62-64) .

دەترسێ‌و پەژارە دادەگرێ بۆ دونیا, بەڵام دۆستانی خوا وا نین, وە مژدەی دڵخۆشكەریشیان هەیە, چ وەك خرانە نێو دڵ (إلهام)و چ وەك خەونی باش[1].

## ( خاڵی هەشتەم )

## میانجێتی لەبارەی هەڵوێست لە بەرانبەر زاناو پێشەوایاندا:

(1) هەم لە كتێبی (ڕێگای صالح بوون...)دا چاپی چوارەم، وە هەم لە بەرگی دووی ئەم زنجیرە دەرسەدا توێژینەوەیەكی باشمان لەبارەی (كەرامەت‌و خورپەو خەون)ەوە كردوە .

لەوبارەشەوە بەهەمان شێوە ئەهلی سوننەتو جەماعەت، خەتی نێوەڕا ستیان گرتوە، لەلایەکەوە ڕێزو حورمەتی تەواویان بۆ زانایانو پێشەوایان هە یەو ڕێز یان دەگرن، بەرهەمەکانیان دەنرخێننو بە چاوی پڕ ڕێزو حورمەت تەماشای بەر هەمو شوێنەوارەکانیان دەکەنو سوودی زۆریان لێ دەبینن.

لەلایەکی دیکەشەوە لاسایی کردنەوەی کوێرانەیانو زیاد لە پێویست بە مەزن گرتنو (تعظیم)کردنیان، بە ڕەوا نازانن، وە خۆ تە سلیمکردنی کوێرا نەیان بەبێ لێکۆڵینەوە بەهەڵە دەزانن.

کەواتە: نە وەك هەندێکیان کە بەزایەدان (تفریط) دەکەن، لە پلەو ڕێزی زانایان دادەشکێنن کە بڵێن: ئەوانیش پیاونو ئێمەش پ یاوینو وەك ئەوانین، نە ئەوە دەڵێن، وە نە واش دەکەن کە زیاد لە پێویست بە گەورەو مەزنو بێ هە ڵەیان بزاننو بڵێن: هەرچی گوتوویانە هەمووی هەر وایەو ڕاستەو بێ هەڵە یە! بەڵکو خەتی نێوەڕاست دەگرنو سوود لە بەرهەمەکانیان دەبیننو ڕێزیشیان دەگرن، بەڵام بە چاوێکی وردیشەوە تەماشا دەکەنو ئەگەر لە شتێکدا بەهەڵەدا چووبن، دە ڵێن بەهەڵەدا چوون، چونکە تەرازوو (میزان)ی لەیەك جیاکردنەوەی ڕا ستیو چەوتی تەنیا شەرعی خوایە، وە قورئانو سوننەت باڵادەستن بە سەر هەموو کە سێکداو قسەی هیچ کەس باڵادەست نیە بەسەر قورئانو سوننەتدا، بەڵکو ق سەی هەموو کەس مەحکومی قورئانو سوننەتە[1].



1) لە بەندی یەکەمی ئەم بەرگەدا فراوانتر لێرە لەبارەی زاناو پێشەوایانەوە دواوین.

لەم بوارەشدا دیسان زانایانی ئەهلی سوننەتو جەماعەت، هەڵوێستێکی میانەیان هەیە، لەنێوان کەسانێکدا کە ئیجتیهاد لەسەر هەموو کەس بە فەرز دەزانن، وە کەسانێك کە لاسایی کردنەوەو شوێنکەوتنی بێبەڵگە (تقلید) لە سەر هەموو کەس بە فەرز دەزانن و ئیجتیهاد بە حەرامو قەدەغە دەزانن! چونکە ئەم دوو ڕاوبۆچوونە هەنو هەندێك دەڵێن: کابرایەکی گاوانو شوانو جوتیاری (دە شتی شارەزوور)یش کە خوێندەواریش نیە، لەسەری فەرزە کە ئیجتیهاد بکات، نەك هەر لە بواری وردە بابەتەکانی عەقیدەدا، بەڵکو لە بواری یاسا کردەیی یەکان (الاحكام العملية)یشدا، نوێژەکەی، ڕۆژووەکەی، زەکاتەکەی حەجەکەی، لە هەموویدا، دەبێ خۆی ئیجتیهاد بکاتو بەدوای بەڵگەدا بگەڕێ! هەندێکیش دەڵێن: دەرگای ئیجتیهاد هەر داخراوەو، کەس توانای نیەو بۆی نیە ئیجتیهاد بکات، بەڵکو دەبێ هەموو کەس بە دوای ئەو زاناو پێشەوایانە بکەوێ کە کاتی خۆی شتیان گوتوەو نووسیوەو دەبێ لێیان وەربگرێو هیچ قسەیەکیشیان ڕەت نەکاتەوە!! واتە: هەندێکیان ئیجتیهاد لەسەر هەموو کەس فەرز دەکەن، هەندێکیشیان تەقلید لەسەر هەموو کەس فەرز دەکەن!! بەڵام ئەهلی سوننەتو جەماعەت دەڵێن: ئەوە هیچی وا نیە: نە ئیجتیهاد لەسەر هەموو کەس فەرزەو نە دەرگای ئیجتیهادیش داخراوە، بەڵکو بە گشتی ئیجتیهادو تەقلید هەردووکیان دروستن، جا کەسێك لە توانای دا هەبوو لەسەری فەرزە ئیجتیهاد بکات، یاخود بەلای کەمەوە وا پەسندە، کەسێکیش لە توانای دا نەبوو لەسەری پێویستە تەقلید بکاتو شوێن زاناو پێشەوایان بکەوێ، بەڵام واش باشە کە لێبکۆڵێتەوەو بزانێ ئەو ئیمامو پێشەوایە ئەو قسەیەی لە کوێ هێناوەو بەڵگەی چیە لەسەری، بەڵام ئەگەر نەیتوانی ئەوە بکات، دەبێ تەقلیدی ئیمامێك بکات، (تقليد)یش بریتییە لە: (أَخْذُ قَوْلِ المجتهد بدون معرفة دليله) قسەی کۆششکەر (مجتهد) وەربگرێ، بێ ئەوەی کە بزانێ

بەڵگەکەی چیە (ابن تیمیة) -ڕەحمەتی خوای لێ بێ-, لەوبارەوە دە لێ:[1](.... والاجتهاد والتقلید کلاهما جائزان في الجملة)، واتە: (... بە گ شتی ئیجتیهادو تەقلید هەردووکیان دروستن)، ئەدی لە بواری ئیمانیو عەقیدەدا، ئا یا تەقلید دروستە یان نا؟! لەوەدا زانایان کێشەو ڕاجیایی‌یان هەیە, هەڵبەتە زۆربە لە سەر ئەوەن، کە لە بواری یاساکردەیی‌یەکان (الاحکام العملیة)دا، کە زانایان زاراوی لقو پۆپەکانی دین (فروع الدین)یان بۆ بەکارهێناون دروستە, بەڵام لە بواری ئیمانو عەقیدەدا کە زانایان زاراوی بنچینەکانی دین (اصول الدین)یان بۆ هەڵبژاردوە, ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی (علم الکلام)و هەندێك لە شەرعزانان (فقهاء)و زانایانی (أصول الفقه)یش دەڵێن: لە بواری ئیمانو عەقیدەدا تەقلید دروست نیە. بەڵام زۆربەی زانایانی لێکۆڵەرەوە (محقق) دەڵێن: لەویشدا تەقلید هەر دروستە, چونکە خواناسییو ئیمان بەخواو ئیمان بە پێغەمبەری خوا ﷺو دینداریی, شتێکی خوا ڕسکە: پێویست ناکات ئینسان بۆی بە دوای بەڵگەدا بگەڕێ.

کەواتە گرنگ ئەوەیە ئینسان یەقینو بەڕاست زانینەکەی بۆ دروست بێو ئیمانو عەقیدەکەی لە عەقڵو دڵ دا بچەسپێ، جا بەهەر هۆیەك بێ، بە هۆی تەقلیدەوە بێ, یان بەهۆی ئەوەوە کە خوا خۆی خستوویەتە دڵییەوە، یان هەر بە هۆی پاکی فیتەڕەتو سروشتەکەیەوە بێ, یان بە هۆی ئەوەوە، کە دە ماوەدەم متمانەی بە خەڵکی باش هەیەو ئیمانێکی با شی وەرگرتوە، یان بەهۆی سەرنجدانو خوێندەوارییەوە گرنگ ئەوەیە ئەو ئیمانو دڵ دامەزرانەی بۆ دروست بووبێ، ئیدی لە هەر ڕێگایەكو بەهەر هۆیەکەوە بێت گرنگ نیەو هەر دروستە! هەڵبەتە منیش هەر ئەو ڕایەم پێ پەسندترە، وە (ابن تیمیة) لەوبارەوە دە لێ: (أ ما في المسائل الاصولیة فکثیر من المتکلمة والفقهاء من أصحابنا وغیرهم من یوجب

---

1) بڕوانە، (مجموع الفتاوی) .

النظر والاستدلال على كل أحدٍ...، وأما جمهور الأمة فعلى خلافِ ذلك)[1]، واتە: لەبواری بابەتەکانی ئیمانو عەقیدەدا زۆر لە شەرعزانانو پسپۆڕانی عەقیدە پێیان وایە لەسەر هەموو کەس فەڕزە ئیجتیهاد بکاتو سەرنج بدات، بەڵام زۆربەی ئۆممەت لەسەر پێچەوانەی ئەوەنو دەڵێن: ئیجتیهادو سەرنجدان لەسەر هەموو کەس فەرز نیە (ابن حجر العسقلاني) یش هەمان ڕای پەسند کردوە[2]، هەروەها (شوكاني)یش هەمان ڕاو بۆچوونی هێناوە[3].




# ( خاڵی دەیەم )

# میانجێتی لەبارەی مەسەلەی خەونو خورپەوە:

(1) مجموعة الفتاوى، بەرگی20، لاپەڕە 202 .
(2) (فتح الباري شرح البخاري)، ج 13، ص 354 .
(3) (ارشاد الفحول)، ص 266 .

لەمەشدا ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت هەر خەتی نێوەڕاستیان گرتوە، چونکە نە وەك زۆرێك لە ئەهلی تەصەووف (ئیلهام‌و خەون) بە بەڵگەی شەرعی دادەنێن‌و بە جێدار (بدیل)ی (وحی)ی دادەنێن، وە نە وەك کەسانێکی دی کەش بەتایبەتی کاتی خۆی موعتەزیلەو عەقڵ گەراکان هەبوون، ئێستاش کەسانێکی وا هەن، کە یان بۆ خۆیان لەو شتانە بێبەشن، یان هەر متمانەیان بەکەس نیە، دەڵێن: نە هیچ خەونی ڕاست هەیەو نە ئیلهام‌و خورپەو خرانە نێو دڵیش هەیە!

بەڵێ ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت خەتی نێوەڕاستیان گرتوە، دەڵێن: هاتنە نێو دڵ‌و ئیلهام هەیە، بەڵام نەك بۆ هەموو کەس، وە خەونی ڕاستیش هەیە، نەك هەر مسوڵمان، بەڵکو دەگونجێ کافریش خەونی ڕاست ببینێ، وە خەونی درۆ هەیەو هی ڕاستیش هەیە، کە ئێمە بە درێژی لە شوێنی خۆیدا باسمان کردوە[1]، بۆیە لێرەدا ناگەڕێمەوە سەری، بەڵام ئەم دوو سەرچاوەیە دەستنیشان دەکەم کە بۆ ئەم باسە زۆر گرنگن‌و باس لە ئیلهام‌و خەون دەکەن‌و زانایانی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت دەڵێن لەکاتێکدا هیچ بەڵگەی دیکەی شەرعی نەبێ، هەم خەونی چاك‌و هەم ئیلهام‌و خرانە نێو دڵ ئیعتیباریان پێ دەکرێ .

1 (فتح الباري) بەرگی 14، لاپەڕە 217 .

2- (شرح أصول اعتقاد أهل السنة والجماعة) اللالكائي، بەرگی 9، لاپەڕە123- 124.

(1) هەم لە کتێبی (ڕێگای صاڵح بوون ..)و هەم لە (بەرگی دووەم)ی ئەم زنجیرە دەرسەدا.

جاریّ بیّ گومان ئەو کاربەدەستو حوکمڕانانەکانی حوکم بە شەریعەتی خوا دەکەنو لانادەن ئەوە تیّکڕای مسوڵمانانی ئەهلی سوننەتو جەماعەتو ئەوانی دیکەش, هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە دەبیّ خۆش بویسترێنو دووعایان بۆ بکریّ، ڕێزیان بگیریّو بەقسەیان بکریّو فەرمانبەرییان بۆ بکریّ لە هەموو کارو فرمانێکی شەرعیدا.

بەڵام ئەدی ئەگەر لارو ستەمکار بوونو خراپەو گوناهیان کرد؟!

ئەهلی بیدعەت لەوبارەوە زێدەڕۆیی (إفراط)یان هەیەو بەزایەدان (تفریط)یان هەیە, هەندێکیان دەڵێن: حوکمڕانەکان با ستەمکارو گوناهبارو خراپەکاریش بن, دەبیّ لە بەرانبەریان هەر بیّدەنگ بیو ملی خۆت دانەوێنی!

هەندێکیشیان دەڵێن: نەخێر بەڵکو هەر گوناهێکیان کردو هەر لاریو ستەمو خراپەیەکیان کرد, دەبیّ یەکسەر لێیان ڕاپەڕیو لێیان دەست بدەیە چەك!

لێرەشدا دەبینین کە بیدعەتچییەکان هەم تێیان پەڕاندوەو هەم کورتیان هێناوە, بەڵام ئەهلی سوننەتو جەماعەت دەڵێن: نەخێر, هیچ کامیان ڕاست ناکەن, بەڵکو ئەو حوکمڕانو دەستەڵاتدارانەی کە حوکم بە شەریعەتی خوا دەکەن لە ئەسڵدا, بەڵام لارییو ستەمکارییو ناتەواوییو گوناهیان هەیە, دەبیّ لەلایەکەوە ئامۆژگارییان بکەین, فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپەیان لەگەڵدا بکەینو، قسەی حەق لە بەرانبەریاندا بکەینو هەوڵ بدەین ڕاستیان بکەینەوە, بەڵام نابیّ یەکسەر لێیان دەست بدەینە چەكو لێیان ڕاپەڕین.

کەواتە: نە بیّدەنگیو بیّهەڵوێستیو مل شۆڕکردنو, نە یەکسەر ڕاپەڕینو دەست دانە چەكو پەنا بردنە بەر هێزیش, بەڵکو گرتنی خەتی نێوەڕاست, بەڵام لەبیرمان نەچیّ بە مەرجێك ئەو کاربەدەستو دەستەڵاتدارانە لەو جۆرەبن کە بە شەریعەتی ئیسلام ڕازی بنو حوکمی پیّ بکەن، بەڵام دەبیّ وریابینو لێرەدا بە

هەڵەدا نەچین، چونکە لە زۆر کتێبو نووسراوی هاوچەرخی عەقیدەییدا, هەندێك لە زانایانی پایە بەرز (حەزناکەم ناویان بێنم), کە خەڵکێکی زۆر بە ئیمامو پێشەوایان دەزانێ, لەو مەسەلەیەدا بەهەڵەدا چوون، ئەویش زیاتر لە سۆنگەی ئەوەوە کە بەم واقیعەی ئێستا شارەزاو ئاشنا نینو وەك پێویست ئاگاداری حاڵوباڵی دونیای خەڵك نین! چونکە هەموو ئەو فەرموودانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموونی, کە دەفەرموێ: خۆ ڕاگربن, ئەگەر لەلایەن حوکمڕانەکانەوە زوڵمیشیتان لێکراو کەموکووڕیشتان بینی, پەنا مەبەنە بەر چەكو لێیان ڕامەپەڕن!

ئەو فەرموودانە هەموویان مەبەستپێیان ئەو پێشەواو حوکمڕانو کاربەدەستانەن کە بە شەریعەت ڕازینو بەگشتی حوکم بە شەریعەت دەکەن, بەڵام کەمو زۆر لادانو خراپەو کەموکووڕییان هەیە.

بەڵام بێگومان ئەو حوکمڕانە تاغووتانەی کە هەر لە ئەسڵدا بە دینو شەریعەتی خوا ڕازی نین, بەڵکو ئەگەر بتوانن هەر درەختی شەریعەت دەبڕنەوەو دژایەتی شوێنکەوتووانی شەریعەت دەکەن, فەرموودەکان ئەوانە ناگرنەوە، چونکە فەرموودەکان دەڵێن: (الاّ أن تروا كفراً بواحاً) مەگەر کوفری ئاشکرا ببینن, واتە وەختێك کوفری ئاشکرات بینی بۆت هەیەو بگرە مادام بتوانی هەر لەسەرت فەرزە کە لەو حوکمڕانە تاغووتو کافرە ڕاپەڕی! ئنجا ئایا ئەگەر دژایەتیکردنی شەریعەتی خواو بڕینەوەی درەختی شەرعی خواو ئیش نەکردن بە شەرعو وازلێهێنانی شەرع, کوفری ئاشکرا (بواح) نەبێ, ئەی دەبێ کوفری ئاشکرا چی بێ؟!

کەواتە نابێ لێمان تێك بچێو دەبێ بزانین کە واقیعی ئێستامان جیایە لەو واقیعو ڕۆژگارەی کە کاتی خۆی پێشەوایەکانمان کتێبەکانیان تێیدا نووسیوەو فەرموودەکانیان تێدا شەرح کردوە، ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین زانایان باسی پێشەوایانی ستەمکار (أئمة الجور) دەکەن! جا ڕاستە پێشەوایانی ستەمکار (أئمة الجور) دەبێ سەبریان لەسەر بگیرێ, بەڵام بێگومان پێشەوایانی کوفر (أئمة الكفر) دەبێ سەنگەریان لێ بگیرێ، وەك خوای زاڵو کاربەجێ فەرموویەتی: (فقاتلوا أئمة

الكفر)[1]، وە لەوبارەوە کە دەبێ لە بەرانبەر کاربەدەستانی ستەمکاردا مسوڵمانان پشوو درێژو خۆڕاگربن، فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرن بۆ وێنە فەرموویەتی: ((من رأى من أميره شيئاً يكرهه فَلْيَصْبِرْ عليه فأنه مَنْ فارق الجماعة شِبْراً ماتَ مِيتَةً جاهلية))[2]، واتە: هەر کەسێك لە فەرماندەکەی شتێکی بینی کە پێی ناخۆش بوو (ناشەرعیی و هەڵەیەکی لێ بینی) با خۆ ڕابگرێ و پشووی درێژ بێ, چونکە هەر کەسێك بە ئەندازەی بستێك لە کۆمەڵی مسوڵمانان جیابێتەوە وە بمرێ بە مردنێکی نەفامانە دەمرێ.

دیارە لێرەدا مەبەست لە مردنی نەفامانە لە (دین دەر چوون) نییە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە وەك چۆن لە کاتی نەفامییدا کەس بە قسەی کەسی نەدەکردو بێسەرەو بەرەیی بووو سەرێکیان نەبوو کۆیان بکاتەوە, ئەو کەسەش چۆتەوە ئەو حاڵەت و ڕۆژگارە! بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەوەی، کە پێویستە خۆڕاگربین و دان بە خۆماندا بگرین، دەبێ حەقیش بڵێین و فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپەش بکەین, وەك یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بەسەرهاتی بەیعەتدانی خۆی بە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (وعلى أن نقول بالحق أينما كنّا لا نَخافُ في الله لومة لائم)[3]، واتە: وە (پەیمانیان لەگەڵ بەست لەسەر ئەوە) کە دەبێ حەق بڵێین لەهەر شوێنێك بین و لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسین، بەڵام ئایا تاکەی صەبر دەگیرێ؟ ئەوە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە: (وأن لا نُنازعَ الأَمرَ أَهلَه قال الاّ أنْ تَروا كفراً بَواحاً عندكم مِنَ اللهِ فيه بُرْهان)[4]، واتە: وە کە دژایەتی ئەو کەسە نەکەین کە جڵەوی حوکمی بەدەستە مادام ئیماندارو مسوڵمان بێ (گوتی) مەگەر کوفرێکی ئاشکرا ببینین کە بەڵگەتان لە سەری بەدەستەوەبێ

1) ( التوبة- 12 ) .

2) متفق عليه، عن ابن عباس -رضي الله عنهما- , البخاري برقم: 7053, ومسلم برقم: 1849 واللفظ له .

1) بخاري ومسلم عن عبادة بن الصامت ، البخاري برقم: 7055, مسلم برقم: 1709 واللفظ له .

4) بخاري ومسلم عن عبادة بن الصامت , البخاري برقم: 7055, ومسلم برقم: 1709.

لەلایەن خواوە (ئەو کاتە دەبێ هێزو توانا دروست بکرێو بە چەك لە دژی ئەو حوکمڕانە کوفر لێبینراوە ڕاپەڕین بکرێ).

ئنجا ئایا لە هەموو شتێکیشدا دەستەڵاتدارانی لارو ستەمکار (أئمة الجور) بەقسەیان دەکرێ؟! نەخێر لە تاوانو سەرپێچی (معصية)دا بەقسەیان ناکرێ, وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (على المرء المسلم السمع والطاعة فيما أَحَبَّ و كَرِهَ الاّ أن يؤمَر بمعصية فأنْ أُمرَ بمعصيةٍ فلا سمع ولا طاعة)[1]، واتە: گوێ گرتنو فەرمانبەریی کردن لەسەر ئینسانی مسوڵمانە, لەو شتەدا کە حەزی لێ دەکاتو لەو شتەدا کە حەزی لێ ناکات, بە مەرجێك فەرمانی پێ نەکرێت بە گوناهو تاوان ئەگەر فەرمانی پێ کرا بە گوناهو تاوان, نە گوێ دەگرێو نە بە قسەش دەکات، هەروەها پێغەمبەر ﷺ: (إنّما الطاعة في المعروف)[2]، واتە: بێگومان فەرمانبەریی بەس لە چاکەدایە.

ئنجا جاری واش هەیە ستەمو خراپەو تاوانی دەستەڵاتدار دەگاتە ئەندازەیەك کە صەبر گرتنی لە بەرامبەردا بەکەڵك نایەت, هەرچەندە کوفریش نییەو هێشتا نەبووە بە کوفر, بەڵام پێویستە مسوڵمانان لێی ڕاپەڕن، ئەگەر لە توانایاندا هەبوو, بە مەرجێك بزانن ئەنجامەکەی خراپتر نابێ لەوەی کە هەیە، چونکە فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگەگرتن لە خراپە زۆر مەرجی هەن, یەکێك لەو مەرجانە ئەوەیە کە ئەو ناشەرعییەی لای دەبەی, ناشەرعییەکی گەورەتر لە خۆی نەیەتە شوێنی، چونکە هەر شتێك لەسەری قەرزدارییەوە نابێ هەر دەستی لێ بدەی, جا ئەگەر مسوڵمانان[3]، لە خۆیان ڕاببینی کە دەتوانن بیگۆڕن, بەبێ ئەوەی خراپتر بقەومێ, دەبێ دەست پێبکەن، هەر بۆیەش (عبدالله)ی کوڕی (زبیر)و (حسین)ی

---

1) متفق عليه، عن ابن عمر -رضي الله عنهما-, البخاري برقم: 7144, ومسلم برقم: 1839 .

2) متفق عليه، عن علي رضي الله عنه, البخاري برقم: 7145, ومسلم برقم: 1708 .

(3) بەڵام بێگومان هەرکەسێك ڕاست بۆوە بۆی نیە ئەو بڕیارە بدات, بەڵکو پێویستە تەنیا کە ساتی مشوورخۆری لە دین شارەزاو بە واقیعو ئاشنا ئەو بڕیارە بدەن .

کوڕی (علي)و (زيد)ی کوڕی (علي)و (عبدالرحمان)ی کوڕی (أشعث) ئەوانە هەموویان لە (بني أمية) ڕاپەڕیونو زۆریش لە (بني عباس) ڕاپەڕیون,و شۆڕشو کودەتایان کردوە، وە زانایانی وەك (امام مالكو أمام ابو حنيفة)و پێشەوایانی دیکەش پشتگیریی‌یان کردوون، خوا لە هەموو لایەکیان ڕازی بێو خۆش بێ.

بەچاکیشی دەزانم کە کۆتایی ئەم باسەم بەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێنین: ((خِيارُ أئمتكم الذين تُحبونهم ويحبونكم ويصلون عليكم وتصلّون عليهم، وشرار أمتكم الّذين تبغَضونهم ويبْغضونكم وتلعنونهم ويلعنونكم, قيل يا رسول الله أفلا ننابِذهمْ بالسَّيف؟ فقال: لا، ما أقاموا فيكم الصلاة وإذا رأيتم مِنْ ولاتِكم شيئاً تكرهونه فاكرهوا عَمَلَهُ ولا تَنْزِعوا يداً من طاعةٍ)) رواه مسلم عن عوف بن مالك -رضي الله عنه-، برقم:1855، واتە: چاکترین پێشەوایانتان ئەوانەن کە خۆشتان دەوێنو خۆشیان دەوێنو دووعایان بۆ دەکەن، وە خراپترینی پێشەوایانتان ئەوانەن کە ڕقتان لێیانەو ڕقیان لێتانەو نەفرینیان لێدەکەنو نەفرینتان لێدەکەن, گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا بە شمشێر لەگەڵیان بجەنگین؟ فەرمووی: نەخێر هەتا نوێژتان لەنێودا بکەن, وە ئەگەر شتێکتان لە کاربەدەستانتان بینی پێتان ناخۆش بوو, کردەوەکەی ببوغزێنن، بەڵام سنووری فەرمانبەریی مەبەزێنن!

## (خــــاڵی دوازدەیەم)

## هاوسەنگیی لە بواری زانیاری بەدینو شارەزایی لە ژیندا:

لەم مەسەلەیشدا دیسان تێپەڕاندنو بەزایەدان (إفراط و تفریط) هەیە, هەندێ کەس تەنیا سەیری دەقەکانی قورئانو سوننەت دەکەن, بەڵام ئاگایان لە واقیعی دونیا نیەو نازانن سەردەمی چ حاکمێکەو چ لە ئارادایەو چ دەگوزەرێو چ دەقەومێ! هەندێکیش تەنیا خەریکی سیاسەتو دیراسەتی واقیعنو ئاگایان لە شەرع نیەو نازانن قورئانو سوننەت چییان تێدایەو چییان فەرمووە!

جا بێگومان ئەم دوو هەڵوێستەش هەردووکیان هەڵەن, چونکە مسوڵمان هەم دەبێ شارەزای شەرع بێو هەم ئاشنای واقیعیش بێ، چونکە کەسێك شارەزای شەریعەت نەبێ بۆ هەڵسوکەوتو مامەڵە لەگەڵ واقیعدا تووشی سەرگەردانی دەبێ, هەروەها کەسێك ئاشنای واقیع نەبێ ناتوانێ ئەحکامی شەرع بە سەر واقیعەکەدا بچەسپێنێو تووشی هەڵەوپەڵەی زۆر دەبێ.



## (خاڵی سێزدەیەم)

## هاوسەنگیی لەبارەی مەسەلەی نەتەوایەتی یەوە:

بەڕێزان!

من پێم وایە دەبێ بڵێین: نە بێهەستو نە ستیو بێهەڵوێ ستی, نە گەلو نیشتیمان پەرستیی، بەڵێ ئا ئەوە هەڵوێستی ڕا ستو درو ستو هاو سەنگانەیە لەبارەی مەسەلەی نەتەوایەتییەوە، لە لایەکەوە نابێ بەرانبەر بە گەلو نیـ شتمانت بێهەستو سۆزو بێ هەڵوێست بی وە لە لایەکی دیکەشەوە نابێ بە شێوەیەکیش بێ کە گەلو نیشتیمان بکەیە بتو بیپەرستی, لەلایەکەوە خەمو مشوور لە خەڵکی خۆم دەخۆم, وە خەم لە نیشتیمانی خۆم دەخۆم, وە هەوڵ دەدەم شەرعی خوای لەسەر جێبەجێ بکەمو هەوڵ دەدەم میللەتی خۆم لە هەموو ڕوویەکەوە بهێنمە سەر ڕێگای شەرع, خۆشم دەوێو بۆی دڵسۆزمو بەپەڕۆشمو بە تەنگی یەوەم، چونکە خۆشەویستی گەلو نیشتیمان شتێکی خوار سكو فیـ ترییە, وە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (إِنَّ أُحداً جَبَلٌ يُحبُّنا ونُحِبُّه)[1]، واتە: چیای (ئوحود) چیایەکە خۆشمان دەوێو خۆشی دەوێین. بەڵام لە لا یەکی دیکە شەوە ناهێڵم هە ستو سۆزی نەتەوایەتی بەسەر عەقڵو دینمدا زاڵ بێتو سەرم پێ بکێ شێ بەرەو ڕە گەزو ڕەچەڵەكو نیشتیمان پەرستییو ڕێچکەی ناسیونالیزم[2]...



1) رواه مسلم عن انس بن مالك برقم: 1393, والبخاري عن ابى حميد برقم: 4422 .
2) بۆ درێژەی ئەم باسە سەرنجی کتێبی (سۆزی نەتەوایەتی) بدە, چاپ چوارەم, نووسینگەی تەفسیر.



# ئەم بەنـــدە

خوێنەری سەنگین!

ئەم بەندی سێیەمە کە لە دەرسی پەنجایەمین‌و کۆتایی زنجیرە دەرسی (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی) پێک دێ، پێنج بابەتی گرنگی گرتووەتە خۆی کە

هەرکامێکیان لە خاڵێکی سەربەخۆدا پێ شکەش دەکەین و ئەمە ناوو نیشانەکانیانە:

1- پابەندیی بەشەریعەتەوەو دووریی لە بیدعەت.

2- دۆستایەتی و دوژمنایەتی کردن لە پێناوی خوادا (عزّو جلّ).

3- فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە.

4- جەنگ و جیهاد لە پێناوی خوادا (تبارك وتعالی).

5- ڕەوشتە بەرزو جوانەکان (مکارم الاخلاق).

شایانی باسیشە ئێمە لەم بەندەداو لە دووتوێی ئەو پێنج بابەتەدا کە ناوو نیشانەکانیانمان خستەڕوو، ویستوومانە بە کورتی و پوختی گرنگترین و سەرەکیترین درووشم و نیشانەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست کە بە (ئەهلی سوننەت) ناسراون بخەینەڕوو، دوای ئەوەی کە لە بەندی یەکەمداو لە دووتوێی دوازدە بابەتدا گرنگترین دیدو بۆچوونەکانیان و، لە بەندی دووەمیش لە میانەی سێزدە بابەتدا گرنگترین و گەورەترین و زەقترین تایبەتمەندییانمان خستەڕوو.

ئێستاش بایەك بە یەك بە خستنەڕووی پێنج درووشمە سەرەکییەکەی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاستدا بچینە خوارێ:

## (خاڵی یەکەم)

## پابەندیی بە شەریعەتەوەو دووریی لە بیدعەت:

دروشم و نیشانەیەکی زۆر ئاشکراو بەرچاوو زەقی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، ئەوانەی کە پەیڕەوییان لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزی و بنەما لەی خۆشەوی ستی و جێن شینە سەرڕا ستەکانی کردوە بریتیە لە پابەندیی بە شەریعەتەوەو دووره پەرێزیی لە بیدعەت.

بێگومان ئێمە بۆیە مسوڵمانین و، بە مسوڵمانان دادە نرێین، چونکە پابەندی شەریعەتین و بۆیە پێمان دەگوترێ مسوڵمان (مسلم)، چونکە بە ئیسلام (اسلام)ەوە پابەندین!

کەواتە ئینسان هەتا زیاتر پابەندی ئیسلام بێ، مسوڵمانترە، وە هەتا زیاتر ملکەچی شەریعەت بێ، بەندەیەکی بۆ خوا باشترو گونجاوترە، بە پێچەوانە شەوە هەتا لە ئیسلام دوورتر بێ، لە مسوڵمانەتی دوورترەو، هەتا لە شەریعەت ترازاوترو لادەرتر بێ، بێگومان لە بەندایەتی کردن بۆ خوا دوورترە جا ئەهلی سوننەت و جەماعەت نیشانەو دروشمێکی سەرەکییان ئەوەیە کە موو بە موو، زۆر بە وردی، هەنگاو بە هەنگاو، بە دوای پێغەمبەری پێشەوایان کەوتوون ﷺ، کە دیارە ڕێبازی ئەویش کتێبی خوایە کە قورئانە، وە ڕێوشوێن ڕێبازی خۆشیەتی کە سوننەتییەتی، دیارە سوننەتی پێغەمبەریش صلی الله علیه و سلم تەفسیرو ڕوونکەرەوەو ڕۆشنکەرەوەی قورئانە، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿...وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾(النحل- 44)، واتە: قورئانمان بۆ تۆ ناردوە (ئەی محمد)، تاکو ئەوەی خوا بۆی ناردووەیە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە (و شی بکەیەوەو تەفسیری بکەی).

زانایانی ڕەسەنی ئیسلام، میراتگرانی ڕاستەقینەی پێغەمبەر ﷺ هەر لە دێرزەمانەوە، ئەوە دروشمیان بووە، کە گوتوویانە: (وكل خَيْرٍ في أتّباع مَنْ سَلَفَ، وكلُّ شَرٍ في ابتْداعِ مَنْ خَلَفَ)، واتە: هەموو خێرو بەرژەوەندییەکی دونیاو دوارۆژ لە

شوێنکەوتنی پێشووە صاڵحەکان دا یە، وە هەموو خرا پەو ز یانێکی دونیاو دوارۆژیش لە داهێنانی پاشینەکان دایە (ئەوانەی لە دواییدا هاتوونو شتیان لە دیندا داهێناوە)، لەوبارەوە (عبدالله بن عمر) -خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ- ئەم فەرموودەیەمان بۆ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ((كُنّا جُلوساً عند النبّي ﷺ فقرأ: ﴿وَأَنَّ هَـذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾(الانعام- 153)، فَخَطَّ خَطّاً: فقال هذا الصَراطُ، ثم خَطَّ حوله خُطَطاً) (وفي رواية خطوطاً) فقال: هذه السُبُل، فَما منها الاّ وعليه شَيْطانٌ يدعو اليه))[1]، واتە: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: ئەمە ڕاستە شەقامی منە، شوێنی بکەون، وە بەدوای ڕێچکەکان مەکەون، ئەگەرنا لە ڕاستە شەقامی خوا دەترازێنو دەپرژێن، پەرتەوازە دەبن، وە ئەوەش شتێکە خوا ئێوەی پێ ڕاسپاردوە بۆ ئەوەی پارێزتان پەیدا ببێ، پێغەمبەر ﷺ کە ئایەتەکەی خوێندەوە خەتێکی ڕاستی کێشاو فەرمووی: ئا ئەمە ڕاستە شەقامی خوایە، پاشان چەند وردە خەتێکی کێشا بەلای ڕاستو چەپی خەتە ڕاستەکەدا ﴿لە ڕیوایەتێکی دیکەدا و شەی (خطوط) هاتوە لە جیاتی (خُطط)﴾ فەرمووی: ئەمانەش ڕێچکەو ڕێبازەکانن (ئنجا فەرمووی) هیچ کام لەو ڕێچکانە نیە، مەگەر شەیتانێکی لەسەرە، کە خەڵکی بۆ بانگ دەکات.

پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتەی خوای پەروەردگارمان ئاوا بۆ تەفسیر دەکات: کە ڕاستە شەقامی خوا هەیەو لەملاولای ڕاستە شەقامی خواش کوێرە ڕێو وردە ڕێو ڕێچکەی دیکەش هەن، جا چ ئەو کوێرە ڕێو ڕێچکانە یەکجاری لە سنووری شەرع چوونە دەرێ، کە ئەوکاتە دەبن بەو دەستەو تاقمانەی کە لە ئەهلی قیبلە شۆراون،

(1) رواه النسائي والحاكم وصححه الحاكم ووافقه الذهبي، ورواه احمد وابن جرير والدرامي وابن ابي عاصم في (السنة) واللالكائي في (شرح اصول اعتقاد اهل السنة والجماعة) وصححه أحمد شاكر ومحمد ناصرالدين الألباني، بڕوانە(الشريعة، للآجري، بەرگی 1، لاپەڕە290-292).

وەچ هەر لە بازنەو سنووری شەرع دابن, کە ئەوکاتە ئەو کۆمەڵو دەستەو تاقمانە هەر پێیان دەگوترێ ئەهلی قیبلە, بەڵام ئەهلی بیدعەن.

فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ شەرحو تەفسیرەکەی بۆ ئایەتەکە هەردوو لایان دەگرێتەوە, وە مادام ئایەتەکەی ئاوا تەفسیر کردوە, دیارە ئایەتەکەش دیسان هەردووك واتاکە هەڵدەگرێت, هەم ئەوانەی کە لە بنەڕەتو ڕیشەوە لە ڕێبازی خوا لادەدەنو بە دوای ناکەون, بەڵکو ئەملاولای ڕێبازی خوادەگرنو بەدوای کوێرە ڕێگا هەڵدێرەکان دەکەون, کە لە واقیعی ئەمڕۆماندا لە حیزبە عەلمانییەکانو ڕژێمە تاغووتییەکاندا خۆیان دەبیننەوە, چونکە هەر لە ئەسڵدا بڕوایان بەوە نییە کە شەریعەتی خواو ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ پەیڕەویی لێ بکرێ، وە هەم ئەوانەش دەگرێتەوە کە بڕوایان بە ئیسلام هەیە, بەڵام شتی داهێنراویان تێدا پەیدا کردوە کە پێی دەگوترێ (بدعة)و کۆیەکەی (بِدَعْ)ە.

شایانی باسیشە کە زانایانی پێشەوایانی پێشینمان بۆیە لە کتێبو بەرهەمەکانیاندا زیاتر لەبارەی مسوڵمانانی لادەرو بیدعەتچییەوە قسەیان کردوە، چونکە کۆمەڵگایەکەیان مسوڵمان بووەو ئەهلی قیبلە بووە، بۆیە کێشەو گرفتو ململانێی ئەوان لەگەڵ کەسانێك دا بووە کە کەمو زۆر لە شەرع لایان داوەو شتیان داهێناوە لە ڕووی عەقیدەوەو لە ڕووی عیبادەتەوەو لە ڕووی هەڵسوکەوتەوە، بەڵێ ئەوان کێشەیان زیاتر لەگەڵ ئەهلی بیدعەتدا بووە، بەڵام هی ئێمە ئێستا زیاتر لەگەڵ ئەهلی کوفرە, دیارە ئەهلی بیدعەتیش هەر هەن, بەڵام زیاتر ئەهلی کوفرو شیرکو نیفاق بۆ ئێمە جێی کێشەو گرفتو مایەی سەرقاڵیین.

ئنجا هیچ گومانیش لەوەدانیە کە ئێمەی مسوڵمان دەبێ خۆ دوور گرتن لەلادانو داهێنان (الإنحراف والإبتداع) بە هەموو جۆرو شێوەکانیانەوە, پابەندییمان بە شەریعەتەوە بۆ دەستەبەر نابێ! هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ داکۆکی زۆری لەسەر خۆ دوورگرتن لە لادانو داهێنان کردوە، بۆ وێنە فەرموویەتی: ((مَنْ أحدث

في أمرِنا هذا ما لَيسَ منه فهو رَدٌّ)) (رواه البخاري ومسلم)، واتە: هەر کەسێك لەم ئایینەماندا شتێك پەیدا بکات کە پێی نامۆ بێ، ئەوە (شتەکەی) ڕەتکراوەیە.

هەروەها فەرموویەتی: ((مَن عَمِلَ عَمَلاً لَيسَ عليه أمرنا فهو رَدٌّ)) (رواه مسلم)، واتە: هەر کەسێك کردەوەیەك ئەنجام بدات کە ئێمەو فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ ئەوە ڕەتکراوەیە.

لەبارەی پێناسەی بیدعەتیشەوە هەر بە کورتی دەڵێین: (راغب الاصفهاني) لە پێناسەی (بدعة)دا گوتوویەتی: (البدعة في المذهب: إيرادُ قولٍ لم يَستَنَّ قائلُها وفاعلها فيه بصاحب الشريعة وأماثِلِها المتقدمة وأصولها المُتَقنةِ)[1]، واتە: بیدعەت لە ئاییندا: داهێنانی قسەو ڕەفتارێکە کە بێژەرو ئەنجامدەرەکەی لەو قسەو ڕەفتارەیدا خاوەنی شەریعەتی نەکردۆتە سەر مەشقی خۆی، وە لە سەر بناغەی بنەما چاكو ڕێکوپێکە پێشووەکان بنیاتی نەناوە.

ئنجا بە سەرنج دانو تێوەڕامانی دەقەکانی شەریعەتیش بۆمان دەردەکەوێ کە بیدعەت تایبەتە بە دوو بواری دیاریکراوو هەر شتێك لەو دوو بوارەدا پەیداکرا، بە داهێنراو (مُبْتَدَعْ) دادەنرێ کە بریتین لە:

1- بواری عەقیدە. 2- بواری عیبادەت.

هۆکاری ئەوەش -کە هەر شتێك لەو دوو بوارەدا دابهێنرێ بیدعەتە- ئەوەیە کە لەو دوو بوارەدا خوا(جل جلاله)و پێغەمبەرەکەی ﷺ نوختەیان خستۆتە سەر پیتو درشتو وردیان خستۆتە ڕوو، بە پێچەوانەی بواری هەڵسوکەوتەکان (المعاملات)ەوە کە تەنیا چوار چێوەو هێڵە گشتییەکانی خراونەڕوو، حیکمەتی ئەوەش ئاشکرایە: هەرچی عەقیدەو عیبادەتن ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە خواو نادیار (غیب)ەوە هەیەو عەقڵو ئەزموونی ئینسان سەردەریان لێ ناکات، بەڵام بواری هەڵسوکەوتەکان، پەیوەندی بە مرۆڤەکانو ماددەوە هەیەو دەکەوێتە جوغزی

1) مفردات ألفاظ القرآن، ص111، لفظ: (ابدع) .

قەڵەمڕەوی عەقڵ و ئەزموونی بەشەرەوە, هەر بۆیەش زانایانی ئیسلام لەوبارەوە لەسەر بنچینە (قاعدة)یەکی شەرعیی ڕێککەوتوون کە دەڵێ: (الأصل في العبادات الحظر والأصل في المعاملات الإباحة) واتە: بنا غەلە خواپەرستییەکاندا ڕێ لێگیران و بنا غەلە هەڵسوکەوتەکاندا ڕێ پێدرانە, واتە: لە بواری خواپەرستییەکان دا غەیری ئەوە کە شەرع گوتوویەتی بە ناڕەوا و ناهەق دادەنرێ, بەڵام لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا ئەسڵ ڕێ پێدرانە و هەموو هەڵسوکەوتێك ڕەوا و شەرعیی‌یە مەگەر شتێك دەقێکی شەرعیی قەدەغەی کردبێ و ڕێی لێ گرتبێ.

خاوەنی کتێبی (عقيدة التوحيد)[1]یش لەوبارەوە گوتوویەتی: (البدعة في الدين نوعان: النوع الاول: بدعة قولية إعتقادية كمقالات الجهمية والمعتزلة والرافضة وسائر الفرق الضالة واعتقاداتهم، النوع الثاني: بِدعة في العبادات كالتعبّد للهِ بعبادة لم يُشَرِّعْها وهي أقسام....)، واتە: بیدعەت لە دیندا دوو جۆرە: جۆری یەکەم: بیدعەتێکی وتەیی عەقیدەیی یە, وەك بیرو بۆ چوونەکانی جەهمی و موعتەزیلە و ڕافیزەکان و تاقمە سەرگەردانەکانی دیکە و بیرو ڕایەکانیان، جۆری دووەم: بیدعەت لە خواپەرستییدا وەك بەندایەتی بۆ خوا کردن بە جۆرێك لە خواپەرستیی کە خوا داینەنابێ و ئەویش چەند بەشێکە....

ئێستاش بە پێویستی دەزانم بۆ دەرخستنی ئەندازەی هەستیاریی زانا و پێشەوایانی پێشینمان بەرانبەر بە داهێنراوەکان و بیدعەتچییەکان (البدع والمبتدعين) چەند قسەیەك لە (البغوي) بخوازینەوە": پاش ئەوەی باسی ڕووداوی ئەو سێ کەسە دەکات کە لە جەنگی تەبووك خۆیان بە جێهێشت کە (کعب بن مالك و مرارة بن الربيع و هلال بن امية) بوون -خوا لێیان ڕازی بێ-.

دەڵێ: (.. وفيه دليل على أن هجران أهل البدع على التأبيد, وكان رسول الله ﷺ خاف على كعبٍ وأصحابه النفاق حين تخلفوا عن الخروج معه فأمر بهجرانهم

1) کە (صالح بن فوزان بن عبدالله)یە، بڕوانە ص117.

الى أن أنزل الله توبتهم وعَرَفَ رسول الله ﷺ براءتهم وقد مضت الصحابة والتابعون وأتباعهم وعلماء السنة على هذا مُجمْعِين متفقين على معاداة أهل البدعة ومهاجرتهم، قال (ابن عمر) في أهل القدر: أخبِرهم أني بريء منهم وأنهم منّي بُرآءُ, وقال ابو قلابة: لا تجالسْ أهل الاهواء: وقال رجل من أهل البدع لأيوب السختياني: يا أبابكر! أسالك عن كلمة: فولّى وهو يقول بيده: ولا نصف كلمة! وقال سفيان الثوري: من سمِعَ بِدعة فلا يحكيها لجلسائه لا يُلْقيها في قلوبهم.. ثم هم مع هجرانهم كفوا عن إطلاق اسم الكفر على أحدٍ من أهل القبلة, لأن النبّي ﷺ جعلهم كلَّهم من أمته....وهذا الهجران والتبرّي والمعاداة في اهل البدع المخالفين في الاصول, اما الاختلاف في الفروع بين العلماء فاختلاف رحمة، اراد الله الاّ يكون على المؤمنين حَرَجٌ في الدين، فذلك لا يوجب الهجران والقطعية)[1]، واته: (.... ئەو بەسەرهاتە) بەڵگەی لەسەر ئەوە تێدایە کە دەنگ لێوەرگرتن‌و پەیوەندی بڕینی بیدعەتچییەکان شتێکی بەردەوامەو هەمیشەیی یە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ مەترسی نیفاقی لە کەعب‌و هاوەڵەکانی هەبوو, کاتێك کە بۆ چوونەدەر لێی بەجێمان، بۆیە فەرمانی کرد کە قسەیان لەگەڵدا نەکرێ، هەتا خوا لێخۆشبوونیانی ناردە خوارو پێغەمبەری خواش ﷺ زانی کە دوورن لە نیفاق، ئنجا هاوەڵان‌و شوێنکەوتووانیان‌و پەیڕەوانیان‌و زانایانی سوننەت لەسەر ئەوە یەکدەنگ‌و ڕێککەوتوو بوونە کە دژایەتی ئەهلی بیدعەت بکرێ‌و پەیوەندییان لەگەڵ بچڕێنرێ.

(ابن عمر) -خوا لێیان ڕازی بێ- لەبارەی قەدەرییەکانەوە گوتوویەتی: هەواڵیان بدەیە کە من لەوان‌و ئەوان لەمن بەریین! وە (ابو قلابة) گوتوویەتی: لەگەڵ خاوەن ئارەزووەکان (اهل الاهواء) دامەنیشە! وە پیاوێکی بیدعەتچی بە (ایوب السختیانی) گوت: ئەی ئەبوبەکر: دەربارەی یەك وشە پرسیارت لێ دەکەم, ئەویش پشتی تێکردو بە دەستی ئاماژەی کردو گوتی: بۆ نیوە وشەش

---

1) بڕوانە (شرح السنة) للبغوي، ج1، ص116-130.

ئامادەنیم، وە ((سفیان الثوري) گوتوویەتی: هەر کەسێك بیدعەتێکی بیست با بۆ هاوکۆڕەکانی نەیگێڕێتەوەو نەیخاتە دڵیا نەوە! بەڵام (زانا یان) لە گەڵ دە نگ لێدابڕینیشیان خۆیان پاراستوە لەوە کە ناوی کوفر بۆ هیچ کام لە ئەهلی قیبـلە بەکاربێنن، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەموویان بە ئۆممەتی خۆی داناوە.

ئنجا ئەو دەنگ لـێوەرگرتنو خۆ لـێ دوورگرتنو دژایەتییەش تەنیا لەگەڵ ئەو خاوەن بیدعەتانە دایە کە لە بنچینەکان (عقیدة)دا جیاوازن, ئەگەرنا ڕاجیایی لە بواری لقو پۆپەکان (فروع)دا کە لەنێو زانایاندا هەیە، ئەوە مایەی ڕەحمەتەو خوا ویستوویەتی کە لە ئایینددا بڕواداران سەغڵەت نەکات, بۆیە ئەو جۆرە ڕاجیایی یە مایەی قسە لێوەرگرتنو لەیەکدی دابڕان نیە!

واش پێدە چێ ئەو فەرموودە یەی، کە با سی پەر تەوازەیی جوولە کەو نەصرانییەکانو ئۆممەتی ئیسلامیش دەکات، مەبەست پ ێی تاق مەو دە ستەکانی خاوەن بیدعەت بن، -هەرچەندە زانایان چ لەڕووی سەنەدو چ لەڕووی ن ێوەڕۆکەو (متن)ەوە مشتومڕی زۆریان هەبووەو هەیە لەبارەی ئەو فەرمودەیەوە- دیارە ئەو فەرموودەیە چەند ڕیوایەتێکیشی هەن، کە ئەمە یەکێکیانە: ((تَفَرقت اليهودُ على إحدى وسبعين فِرقةً, وتفرقت النَّصارى على إحدى أو ثنتين و سبعين فرقة, وتفـتَرِق أمتي على ثلاث وسبعين فِرقةٍ)) رواه احمد وابو داود والترمذي وا بن ما جه وأ بو يعلى وابن حبان والحاكم و غيرهم عن ابى هريرة رضي الله عنه, وصححه التر مذي والشافعي، وروى الحديث عن انس بن مالك ومعاوية بن ا بي سفيان ر ضي الله عنهما بنفس السَّند وزيد فيه: ((كُلُّها في النّار الاّ واحدة, وهي الجماعة)[1]، وا تە: جوولەکەکان پەرتەوازە بوون بۆ حەفتاویەك تاقم, وە نەصرانییەکان پەرتەوازە بوون

---

1) بڕوانە، اضواء على حديث: (ا فتراق الا مة) ع بدالله بن يو سف ا لجديع, ص16-19، هەروەها بڕوانە،(سلسلة الاحاديث الصحيحة) للالباني رقم: 103 .

بۆ حەفتاویەك، یان حەفتاودوو تاقم, وە ئوممەتی شم دەبێ تە حەفتاو سێ تاقم, هەموویان لە ئاگردان، جگە لە یەکیان ئەویش کۆمەڵە.

ئێستاش با ئەوەی لە چەند لاپەڕەی پێشوودا گوترا خڕی بکەی نەوەو لە چەند بڕگەیەکی کورتدا بیخەینە ڕوو:

یەکەم: پابەندیی بە شەریعەتەوە -ئەو شەریعەتەی کە لە کتێ بی خواو ڕێ بازی پێغەمبەردا ﷺ بەرجەستەیە- یەکێکە لە نی شانەو درو شمەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاستی ئیسلام کە بە (ئەهلی سوننەت) ناسراون.

دووەم: وە ئەهلی سوننەت لە سایەو بەرە کەتی پابە ندیی موو بەموویان بە شەریعەتەوە سەلامەت و پارێزراو بوون لە لادان و داهێنان (الانحراف والابتداع).

سێیەم: ئەو داهێنانەش کە قەدەغەکراوەو ئینسانی مسوڵمانی پێ دەچێتە ڕ یزی تاقمە خاوەن بیدعەتەکانەوە، ئەوەیە کە لە بواری عەقیدەو عیبادە تدا شتێك دابهێنرێ کە لە قورئان و سوننەتدا نەهاتبێ و پێغەمبەری خوا ﷺ وە هاوەڵانی دڵسۆزی و بنەماڵەی بەڕێزیی و شوێنکەوتووانیان نەیانکردبێ و نەیانگوتبێ، چونکە ئە سڵ لە عەق یدەو عیبادە تدا ڕێ لێگ یرانەو بە پێ چەوانەی هەڵسوکەوتەکانەوە کە ئەسڵ تێیاندا دەستکراوەیی و ڕێ پێدرانە.

چوارەم: وە زانا پێشەوایانی ڕەسەنی پێ شینمان زۆر هە ستیار (حـ ساس) بوون بەرانبەر بە بیدعەت و ئەهلی بیدعەت و بۆ خەڵك لـێ ئاگادارکرد نەوەو خەڵك لـێ پرینگاندنەوەیان پەنایان بردۆتە بەر قسە لەگەڵ نەکردن و پەیوەندی لە گەڵ پچڕاندنی ئەهلی بیدعەت.

پێنجەم: بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کات زاناو پێشەوایانی ئەهلی سوننەت هیچ کام لە بیدعەتچییەکانی ئەهلی قیبلەیان بە کافر دانەناوەو هەر بە مـ سوڵمانیان لەقەڵەم داون.

شەشەم: ئنجا دەبێ وریاش بین‌و ڕاجیایی (اختلاف) لە بواری مەسەلە فیقهییەکاندا تێکەڵی بابەتی بیدعەت نەکەین، چونکە بەردەوام زاناو پێشەوایان لە بواری (فقە)دا ڕاجیایی‌و مشت‌ومڕیان پێکەوە هەر هەبووەو بەو هۆیە شەوە هیچ کامیان ئەوی دیکەی بە ئەهلی بیدعەت لەقەڵەم نەداوە!

حەوتەم: مەبەست لەڕستەی: هەموویان لەئاگردان جگە لە یەکیان: (كلّها في النّار الا واحدة) ئەوەیە کە سەرجەم ئەو پێڕو تاقمە لادەرو داهێنەرانە شایستەی سزادرانن بەهۆی لادان‌و داهێنانەکەیانەوە، نەك مەبەست ئەوەبێ کە لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی (أبدي) دەبن وەك ئەهلی کوفر، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئەو دەستەو تاقمە داهێنەرانەی هەر بە ئوممەتی خۆی‌و لە بازنەی ئیسلامدا حیساب کردوون[1].

لەکۆتاییشدا دەڵێم: لەم ڕۆژگارەماندا پێویستە زۆر وریابین‌و مەسەلەی قسە لەگەڵ نەکردنی ئەهلی بیدعەت‌و پەیوەندی لەگەڵ پچڕاندنیان نەکەینە بیانووی هەمان پەرتەوازەیی (تفرق)و تاقم تاقمێنە کە تایبەتمەندیترین نیشانەو دروشمی ئەهلی بیدعەتە!

دیسان دەبێ بزانین کە لە ڕۆژگارێکدا مسوڵمانان کیان‌و دەوڵەت کۆمەڵگای ئیسلامییان هەیەو، گەورەترین کێشەیان ڕاستکردنەوەی لادان‌و هەڵەو کەم‌وکووڕیی

(1) بەڵام ئەو فەرمودەیەی کە (حنيفة اليمان) - خوا لێی ڕازی بێ- هێناویەتی‌و (بخاري وم سلم) گێڕاویانەتەوە ئەوە مەبەست تێیدا بە وشەی (الفرق) کە فەرموویەتی (فأعتزلْ تلك الفرق كلها..) ئەو پێڕو تاقمانەن کە لە بازنەی ئیسلام دەچنەدەرێ‌و هەڵدەگەڕێنەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە: بانگەواز کەرانێك لەسەر دەرگاکانی دۆزەخ: (دعاة على ابواب جهنم) وەسفی کردوون کە دیارە ئەم وەسفەش لە گەڵ ئەهلی ئیماندا ناگونجێ‌و پڕ بەپێستی پێڕو تاقمەکانی ئەهلی کوفرە، هەر بۆیەش تەفسیرکردنی فەرمودە کە بە کۆمەڵ‌و لایەنە ئیسلامییەکان کە لەسەر دەرگاکانی بەهەشتن‌و خەڵك بەرەو خواو ئیسلام‌و بەهەشت بانگ دەکەن شتێکی یەکجار هەڵەو ناماقووڵ‌و بێ‌مانایە! بۆ بەرچاو ڕوونبوونەوەی زیاتریش لەوبارەوە بڕوانە کتێبی: (ئیسلام‌و مسوڵمانەتی‌و کاری ئیسلامی...) دەرسی هەشتەم (کۆمەڵبوونی مسوڵمانان پێویستەو پرژو بڵاویی‌و بێ سەرەوبەرەیی یان بیدعەتە) لاپەڕە274-291، چاپی یەکەم، 2006 .

یەکانی نێو بازنەی ئۆممەتە, حوکمی ئەو مەسەلەیە زۆر جیاوازە لەگەڵ ڕۆژگارێکدا کە مسوڵمانان بێ سەرو سێبەرن‌و لەبەر ئەهلی کوفرو دیفاع لە ئە سڵی ئیـ سلام, کەمتر دەیانپەرژێتە سەر ئەهلی بیدعەت‌و هەڵەو پەڵەکانیان! ئنجا ئەوە هەمووی لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە دەبێ وریابین‌و دڵنیابین کە هەر چی ڕا ستبۆوە بێ‌ئەوەی شایستەیی هەبێ‌و متمانەی ئەهلی ئیمانی وەدەست هێنابێ، بۆی نـیە هەر لەخۆوە خۆی لە مسوڵمانان بکاتە دەمڕاست‌و بەناوی ئیـ سلام‌و مـ سوڵمانان‌و پێشینی چاك‌و ئەهلی سوننەت‌و ..هتدوە، سوننەت‌و بیدعەت بە سەر خەڵکـیدا دابەش نەکات‌و مسوڵمانان پۆلین (تصنیف)نەکان، چونکە ڕەنگە گەلێك لەو جۆرە کەسانە گیرۆدەبووبێ بە کۆمەڵێك خوخدەی بیدعەتچییانەوە، بێ‌ئەوەی هەست بە خۆشیان بکەن لەبەر نەزانینی‌و کەم شارەزایی‌و دەمارگیری (تعصب) بۆ هەـندێك ناوونیشان کە هیچ سەنەدێکیان لە قوڕئان‌و سوننەت دانیە!

# ( خـاڵی دووەم )

# دۆسـتایەتی‌و دوژمنایەتی کردن لە پێناوی خـوادا

## (الموالاة والمعـاداة فـي الله):

ئەمیش یەكی دیكەیە لە نیشانەو دروشمەكانی ئەهلی سوننەت كە پێ یان لە غەیری خۆیان جۆی دەكرێنەوە.

جا ئێمە سەرەتا پێناسەی هەر كام لە وشەی (موالاة)و (معاداة) دەكەین:

**أ- الموالاة:** (الرازي) لەبارەی وشەی (مولاة)وە گوتوویەتی: ﴿(الوَلْيُ) بِسكون ا للاّم: القُربُ والدُّنوّ، يقال: تباعد بعد ولْي, وكلْ مما يَليك أي مما يُقاربك، وا لولى ضد العَدو يُقال منه: تولاّه, وكل مَنْ ولي أَمْر واحِدٍ فـ هو (ولـ يّه)، و(ا لمولى) المُعتِقُ والمُعْتَقُ وابن العمّ والنّاصر والجار والحلـ يف، و(ا لموالاة) ضدُّ المُ عاداة، الولاية بالكَسرْ السلطان, و(الوَلاية) بالفتح والكسر النُّ صرْة...﴾[1]، (را غب الاصفهاني)یش هەر لەوبارەوە گوتوویەتی: ﴿(ولي) الولاءُ والتوالي: أنْ يَحصلُ شيئان فصاعداً حصولاً ليس بينهما ما ليس منهما ويستعارُ ذلك للقرب من حيث المكان ومن حيث النسبة ومن حيث الدين ومن حيث الـ صداقة والنـ صرة والاعتقاد, والوَلاية: النُصرة, والوِلاية: تولّي الامر... وا لموالي يـ قال للمُعْ تقِ والمعتَقِ والحليف وابن العم والجار, وكل مَن ولي أمرَ الآخر فهو وليّه﴾[2].

پوختەی مانای قسەی (الرازي)و (الأصفهاني) بەم شێوەیە: وشەی (ولي) بە سكونی لامەكەی، یانی نێزیكیو لەپەنا بوون، وە (ولِيّ) پێچەوانەی ( عدو)ە كە بەمانای (دوژمن) دێ, وە (وليّ) هەر كەس سەرپەرشتیارو مـ شوورخۆری ئەو كەسەیە، وە هەر كام لە (ولاء وتوالي) بۆ بەدوای یەكەدا هاتنی دوو شت یان زیاتر بەكار دێن كە هیچ شتێكی غەیری خۆیان یان نەكەوێ تە نـ ێوان، وە (وَلاية) بەسەری واوەكەی واتە: یارمەتیدانو پشتگیریی, بەڵام (وِلاية) بەژێری

(1) بڕوانە (مختار الصحاح)، ص736, 737 .

(2) بڕوانە (مفردات الفاظ القرآن)، ص885 و887 .

واوەکەی، واتە سەرپەرشتیی کردن‌و مشوور خواردن. وە وشەی ( مولی) بە مانای: ئازادکەرو ئازادکراوو هاوپەیمان‌و ئامۆزاو دراوسێ‌و پشتیوان دێ، بۆیە ئەگەر لە کوردیدا بۆ مانای (موالاة) بگوترێ دۆستایەتی‌و نیزیکی پێم وایە شتێکی بەجێیە.

ب- **المعاداة**: (الرازي) دەربارەی وشەی (عدا) کە ڕیشەی (معاداة)ە گوتوویەتی: ﴿(العدوّ) ضد الوليّ، والجمع أَعداء يقال: ( عَدُوٌّ بَيّنُ العَداوة) و(المُعاداة) والأنثى (عَدوَّة)...﴾[1]، (راغب الاصفهاني)ش گوتوویەتی: ﴿(العَدوُ: التجاوز ومنافاة الالتئام, فتارةً يُعْتَبَرُ بالقَلْبِ فيقالُ له: العَداوة والمعاداة, وتارة بالمَشيِ فيقال لهُ: العدو, وتارةً في الاخْلالِ بالعَدالة في المعاملة فيقال له: العُدوان والعَدْوُ ... فمن المُعاداة يقال: رَجل عَدوَ وقوم عَدوّ, قال تعالى: ﴿بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ (طه 123) وقد يُجمعُ على عِدىً وأَعداءٍ...﴾[2]

پوختەی مانای قسەی (رازي)ە وە، (اصفهاني)یش لەبارەی وشەی (معاداة)و ڕیشە ئەسڵییەکەیەوە کە (عدا)و (عدو) ئەوەیە کە: ئەسڵی وشەی (معاداة) کە (عداو عدو) بە مانای سنوور بەزاندن‌و دەستدرێژیی دێ. وە وشەی (عدو) کە بە کوردی بە (دوژمن) تەرجەمەکراوە, ڕاست دژو پێچەوانەی (ولی)یە.

کەواتە: ئەگەر بۆ مانای وشەی (معاداة)یش لە زمانی کوردیدا بگوترێ: دوژمنایەتی‌و دووریی, زۆر پڕ بە پێستە.

ئەوە دەربارەی مانای زمانەوانیی هەرکام لە وشەی دۆستایەتی (موالاة)و دوژمنایەتی (معاداة), بەڵام بۆ چەمك‌و واتای ئەو دوو وشەیە لە ڕوانگەی شەرعەوە هەر بە کورتی‌و پوختی دەڵێین: مەبەست لە دۆستایەتی‌و دوژمنایەتی کردن لە پێناوی خوادا (الموالاة والمعاداة في الله) ئەوەیە کە ئینسانی مسوڵمان

1) مختار الصّحاح، ص418 .
2) (مفردات الفاظ القرآن)، ص553 .

لەبەر خواو بە مەبەستی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا (سبحانه وتعالی) ئەو کەسانەی خۆشبویَو دۆستایەتییان بکات کە دۆستو خۆشەویستی خوان, وە بە پێچەوانەشەوە ڕقی لەو کەسانە بێتەوەو دوژمنایەتییان بکات کە دوژمنو ناحەزی خوان (عزّ وجلّ)، ئاشکراشە کە دۆستانی خوا تەنیا ئەهلی ئیمانن‌و دوژمن‌و ناحەزانیشی بریتین لە ئەهلی کوفر بە هەموو جۆرو شێوەکانیانەوە بە تایبەت لە کاتێکدا کە دژایەتی ئەهلی ئیمان دەکەن.

شایانی باسیشە کە دۆستایەتی‌و دوژمنایەتی کردن لەبەر خوا یەکێ کە لە مەسەلە گەورەو گرنگەکانی ئیسلام‌و، هەر بۆیەش ئەهلی سوننەت بە یەکێك لە دروشم‌و نیشانە سەرەکییەکانی خۆیانیان داناوەو زۆر داکۆکییان لەسەر کردوە.

ئێستاش بەر لەوەی بچینە خزمەت چەند ئایەتێکی قورئانی بەڕێز با سەرنجی ئەم دوو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەین تاکو زیاتر پایەو پلەو گرنگی ((دۆستایەتی گرتن‌و دوژمنایەتی کردن لە پێناوی خوادا)) ڕۆشن بێتەوە:

یەکەم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (أوثق عرى الإيمان: الموالاة في الله والمعاداة في الله والحبُّ في الله والبغض في الله) رواه الطبراني وأبو داود وصححه الحاكم وقال الالباني: إسناده حسن[1]، واتە: پتەوترین قوڵفەو گرێی ئیمان بریتیە لە دۆستایەتی گرتن لەبەر خواو دوژمنایەتی کردن لەبەر خوا, وە خۆشویستن لە پێناوی خواداو ڕق لێبوونەوە لە پێناوی خوادا.

(دووەم): هەروەها فەرموویەتی: (مَنْ أحبَّ لِله وأبغض لله وأعطىْ لِله ومَنَعَ لِله فقد استكملَ الايمان) رواه أحمد وابو داود ورمز السيوطي لصحته وأورده الالباني في سلسلته الصَّحيحة[2]، واتە: هەر کەسێك لەبەر خوا خەڵکی خۆشبویَو لەبەر خواش ڕقی لێیان بێتەوەو, لەبەر خوا ببەخشێ بە خەڵکی شایستەو لەبەر خواش نەبەخشێ- بە خەڵکی ناشایستە- ئەوە بێگومان

1) (سلسلة الاحاديث الصحيحة)، ژمارە 998 .

2) هەمان سەرچاوە, ژمارە 380 .

ئیمانی خۆی تەواو کردوە. دیارە هەر کام لەم دوو فەرمودە یەش زۆر جوان دەریدە خەن کە بەڕا ستی خۆشوی ستن و بوغزا ندن و دۆ ستایەتی گرتن و دوژمنایەتی کردن لە پێ ناوی خوادا، یەکێ کە لە پێکهێ نەرە گەورەو گرنگەکانی ئیمان و ئیسلام لە مسوڵماناندا، ئینسان نابێتە مسوڵمان هەتا دەروون و دەری بۆ خوا ساغ و یەکلا نەبێتەوە!

ئێستاش با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین, تاکو وەك ڕۆژی ڕوون دەرکەوێ کە بەبێ دۆستایەتیکردن و دوژمنایەتیکردن لە پێناوی خوادا, ئینسان نابێتە مسوڵمان کە ئایەتەکانی (51 تا 57)ی (المائدة)ن: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ۞ فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَى أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ فَعَسَى اللّهُ أَن يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِ فَيُصْبِحُواْ عَلَى مَا أَسَرُّواْ فِي أَنْفُسِهِمْ نَادِمِينَ ۞ وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُواْ أَهَـؤُلاء الَّذِينَ أَقْسَمُواْ بِاللّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَأَصْبَحُواْ خَاسِرِينَ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە, جوولەکەو نە صڕانییەکان بە دۆ ست مەگرن, ئەوان هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن, وە هەرکەسێك لە ئێوە ئەوان بە دۆست بگرێ ئەوە بێگومان لەوانە، وە بەڕاستی خوا ڕێنمایی خەڵکی ستەمکار ناکات.

(پاشان خوای زاناو شارەزا ڕوونی دەکاتەوە کە کێیە دۆستایەتی دەگرێ لە گەڵ دوژمنانی دينداو دەفەرموێ): ئەو کەسانە دەبینی خێرایی و پێشبڕکە دە کەن بۆ دۆستایەتی گرتن لەگەڵ جوولەکەو نەصڕانییەکاندا دڵیان نەخۆشی تێدا یە (وا تە: مونافیقەکانن دۆستایەتی دەگرن لەگەڵ ئەهلی کوفردا بیانووو پا ساویان ئەوە یە کە) دەڵێن: دەترسین بەڵایەکمان بەسەر بێت, زۆر نزیکە خوا فەتح بۆ م سوڵمانان بێنێتە پێش, یاخود واقیعێکی تایبەت بڕەخسێنێ (بێئەوەی دەستیان تێدا هەبێ و بیریان بۆی بچێ) دوایی لەسەر ئەوەی کە لە دڵیا ندا پەنهانیان کردوە ( کە

خۆشەویستیو دۆستایەتی ئەهلی کوفرە) پەشیمان ببنەوە, ئنجا لەوکاتەدا ئەوانەی کە بڕوادارن بڵێن: ئەوانە بوون کە زۆر بە دا کۆکی لە سەرکردنەوە سوێندیان دەخواردو دەیانگوت ئێمەش لە ئێوەین؟! کردەوەکانیان هەڵوە شاونەوەو چوونەتە ڕیزی زیانبارانەوە، ئنجا دوا بەدوای ئەوە خوای بەرزو مەزن یەکسەر دە فەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (د یارە بە هۆی بە دۆست گرتنی کافرانو پشتگیریی کردنو خۆشویستنی دوژمنانی ئیسلامەوە ئینسان لە دین هەڵدەگەڕێتەوە، بۆیە دەفەرموێ): ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکەسێك لە ئێوە لە دینەکەی هەڵگەڕێتەوە (خوا پەکی پێ نا کەوێ) خوا لەمەودوا کۆمەڵێك دێنێ کە خۆشی دەوێنو ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێ, لەگەڵ ئیمانداراندا میهرەبانو نەرمنو لە بەرامبەر کافراندا زبرو توندو تیژن, جیهاد لە پێناوی خوادا دەکەنو لە لۆمەو سەرکۆنەی لۆمەکەران ناترسن, ئەوەش بەخششی خوا بە هەر کەسێکی دەدات کە بیەوێ, وە بێگومان خوا ڕەحمەتی فراوانو زانیاری بێسنووری هەیە.

(ئەمجار هەر دوای ئەم ئایەتانە نیشانمان دەدا کە کێ شایستەی دۆستایەتیو خۆشویستنو پشتگیریی کردنەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ ۞ وَمَن يَتَوَلَّ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ فَإِنَّ حِزْبَ اللّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ﴾ واتە: دۆستو پشتیوانی ئێوە تەنیا خوایەو پێغەمبەری خوایەو ئیماندارانن, ئەو ئیماندارانەی نوێژ بەرپادە کەنو زەکات دەدەنو ڕکووع دەبەن, وە هەر کەسێك دۆستایەتیو پشتیوانی خوا( جل جلاله)و پێغەمبەر ﷺ و ئیمانداران بکات, ئەوا نە کۆمەڵی خوان، بێگومان کۆمەڵ (حزب)ی خواش زاڵو سەرکەوتوون.

ئنجا دوای ئەوە یەکسەر دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الَّذِينَ اتَّخَذُواْ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَالْكُفَّارَ أَوْلِيَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە: ئەوانەی، کە دینەکەتان بە گاڵتەوگەپ دەگرن, چ لەوانەی کە کتێبیان پێش ئێوە پێدراوەو، چ کافرەکانی دیکە (بە هەموو جۆرو شێوەکانیانەوە) مەیانگرن بە دۆستو پشتیوانو، پارێز لە خوا بکەن ئەگەر ئێوە ئیماندارن!

هەروەها هەر لەوبارەوە لە ئایەتەکانی (80و 81)ی سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿تَرَى كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ اللّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ ۞ وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِالله والنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاء وَلَـكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾، واتە: زۆریان دەبینی دۆستایەتی دەگرن لەگەڵ ئەوانەی کافرن, خراپترین شتە ئەوەی، کە بۆخۆیان پێش خستوە, واتە (دۆستایەتی گرتن لەگەڵ دوژمنانی خوادا خراپترین بەرهەمە، کە ئینسان پێش خۆی دەخات بۆ قیامەت)، چونکە خوا بەهۆیەوە لێیان تووڕە بووە، وە بە هەمیشەیی لە ئازاردا دەمێننەوە وە ئەگەر بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرو بەوەی، کە بۆی نێرراوەتە خوار هەبووایە, ئەوە نەیاندەگرتن بە دۆستو پشتیوانی خۆیان، بەڵام زۆربەیان لاڕێو دەرچوون.

هەروەها هەر لەوبارەوە خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿لاَّ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاء مِن دُوْنِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللّهِ فِي شَيْءٍ إِلاَّ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللّهِ الْمَصِيرُ﴾[1]، واتە: بڕوادراران نابێ دۆستایەتی کافران بکەن لە جیاتی مسوڵمانان, وە هەر کە سێك وابکات هیچ پەیوەندی بە خواوە نەماوە (واتە: هیچ پەیوەندی بە دینی خواو شەریعەتیو بەندایەتی کردنی خواوە نەماوە, چونکە دوژمنانی خوای گرتوە بە دۆست)، مەگەر

1) (آل عمران- 28 ) .

وەك پارێز خۆتانیان لـێ بپارێزن, (واتە: تەنیا لە حاڵێكدا بۆتان هە یە وا پێ شان بدەن كە دژیان نین كە چەوساوەو بێدەستەڵات بوونو لە شوێنێك بوون كە ئەوان خاوەن دەستەڵاتو ئاگرو ئاسن بوون, لەو حا ڵەدا بۆ تان هە یە سەرزارەكی (مەرحەبا)یان بكەنو مووداراییان لەگەڵ بكەن, بەڵام لە دڵتا ندا ئی مانی پ تەو هەبێت), بۆ یە دە فەرموێ: وە خوا سەبارەت بەخۆی ب ێدارتان دەكا تەوە دەتانترسێنێ, (واتە: خۆتان بە هەڵەدا نەبەن كە بە دڵ خۆشتان بوێنو بڵێن لە بەر ناچارییە, یاخود ناچار نەبنو بۆخۆتان بڵێن ناچارین لە پێناوی لـێ تێكنە چوونی بەرژەوەندی دونیاییدا)، لە كۆتاییشدا دەفەرموێ: (وَإِلَى اللّٰهِ الْمَصِيرُ) وە بۆ لای خوا دەگەڕێنەوەو سەرەنجامتان هەر بۆ لای ئەوە، (كەواتە: بزانن كە بە چ پەرێزو بەرهەمێكەوە بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە!).

ئنجا لە كۆتایی ئەم خاڵەدا دەڵێـین: دۆستایەتی كردن (موالاة) بە گ شتی دوو پلەیە, دۆستایەتی كردنی ڕەها (الموالاة المطلقة)، وە دۆ ستایەتی گ چكە (ا لموالاة الجزئية) جا دۆستایەتی كردنی ڕەها ئەوەیە كە ئینسان بە دڵ كوفرو ئەهلی كوفری خۆش بوێو پێی خۆشبێ سەربكەون, یاخود بە كردەوە لەگەڵیاندا بێتو بەرگریی یان لـێ بكاتو خەڵكیان بۆ بكوژێو خۆیان لەسەر بە كوشت بدات, كە بێگو مان ئەمەیان ئینسانی پێ كافر دەبێو لە بازنەی دین دەچێتەدەر.

وە دۆستایەتی كەمو بچووك (جزئی)ش ەوەیە كە ئینسان لەبەر بەرژەوەندییەكی خۆی مەرحەبایەكیان بكاتو خۆشەویستییەكی كاتی یان بۆ دەر بخات، ئەوەش بێگومان مادام بە بەڵگەو پاساوی شەرعیی‌یەوە نەبێ ئینسانی پێ گوناهبار دەبێ, بەڵام پێی لە دین دەرناچێ، بەڵام پێویستە لەوەش ئاگاداربین كە هەر كە سێك با زۆر زۆر كافریش بێت ئەگەر هات بۆ لات یان چوویە لای لە بواری پەیوەندیی یە كۆمەڵایەتییەكاندا, ڕێز لـێگرتنی پێ چەوانەی دۆ ستایەتی گرتن لە بەر خواو دوژمنایەتی كردن لە پێناوی خوادا نیە, چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من

كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليكرم ضيفه)[1]، واتە: هەر كەسێك بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێز لە میوانەكەی بگرێ, مادام كابرا دەبێتە میوانت, پێشوازیی لێكردن‌و تەوقە لەگەڵدا كردن‌و ڕووی خۆش لەگەڵدا نیشاندان‌و ڕێز لێ گرتنی، پێچەوانەی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ نیە، بەڵێ دۆستایەتی گرتن شتێكەو ڕێزگرتن لە میوان شتێكی دیكەیە, پێغەمبەر ﷺ جوولەكە چوو بۆ بێت بۆ لای مونافیق چووبێت بۆ لای هاوبەش پەیداكەر (مشرك) چووبێت بۆ لای، لە سەرووی خۆی دایناوەو جێگەكەی خۆی بۆ چۆڵ كردوەو ڕایەخەكەی خۆی بۆ داناوەو خۆی لەسەر زەوی دانیشتوە، وە ئەوە هیچ تەنازولی عەقیدەیی پێ نالێن, زۆر كەس لەوەدا بە هەڵەدا چوون, نەخێر لە بواری هەڵسوكەوتدا نابێ هیچ كەس لە ئینسانی مسوڵمان خووڕەوشت جوانترو بەڕێزترو گفتوگۆ شیرینتر بێت, دیارە بواری ڕووبەڕووبوونەوەش بوارو بازارێكی دیكەیەو شێوازو دەستوورێكی دیكەی پێویستە[2].

## ( خاڵی سێیەم )

# فەرمان بە چاكەكردن‌و ڕێ لە خراپە گرتن

## ( الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر ).

---

(1) متفق عليه .

(2) لە كتێبی (پرۆژەی بەرنامەی فیكری كاریی ئیسلامی)دا بە تێروتەسەلتر لێرە ئەم بابەتەمان توێژیوەتەوە، بڕوانە بەشی نۆیەم، (دۆستانی پشتیوان) وە بەشی دەیەم (دوژمن و ناحەزان)، لاپەڕە 199-224, چاپی یەكەم .

بەڕێزان!

گومانی تێدانیە کە ئیسلام‌و سەرجەم بەرنامەو شەریعەتەکانی دیکەی خوای بەبەزەییی‌و بەخشەر بۆ ئەوە نێرراون کە چاکە (معروف) بە مانای فراوان‌و گشگیری وشەی چاکە بچەسپێنن‌و خراپە (منکر) بە مانای فراوان‌و گشتگیری وشەی خراپە ڕیشەکێش بکەن، بۆیە ((فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە)) یەکێکە لە نیشانەو دروشمە سەرەکی‌و بنەڕەتییەکانی مسوڵمانانی ڕەسەن‌و پەیڕەوی ڕێبازی ڕاستەوڕەوانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

ئێستاش بەر لەوەی لەبەر تیشکی چەند ئایەت‌و فەرموودەیەکدا سەرنجی ئەو مەسەلە گەورەو گرنگە بدەین، با پێناسەیەکی کورتی هەرکام لە وشەی (المعروف)و (المنکر) بکەین:

(راغب الاصفهاني) دەربارەی وشەی (المعروف) گوتوویەتی[1]: (المعروف إسم لكل فعلٍ يُعرف بالعقل أو الشرع حسنهُ) واتە: وشەی (المعروف) ناوە بۆ هەر کارێك کە بە عەقڵ یان بەشەرع چاکیی‌یەکەی دەزانرێ.

وە لەبارەی (المنکر)ەوە گوتوویەتی:[2] (والمنكر: كل فعل تحكم العقولُ الصَّحيحة بقبحهِ أو تتوقف في استقباحهِ واستحسانهِ العقول فتحكم بقبحه الشريعة)، واتە: وە (المنکر) هەر کردەوەیەکە کە عەقڵە ساغەکان بە دزێوو ناپەسندی بزانن، یان عەقڵەکان هەڵوەستە بکەن لە بە ناپەسند دانان‌و بە پەسند دانانی داو شەریعەت بە ناپەسندی دابنێ.

کەواتە مەبەست لە: فەرمان کردن بە چاکە (الأمر بالمعروف) هەوڵدان‌و کارکردنە بۆ چەسپاندنی هەرچی چاکەیە، واتە هەرچی عەقڵی ساغ‌و شەرع بە

1) (مفردات الفاظ القرآن)، ص561، مادة: عَرَفَ .

2) هەمان سەرچاوە, ص823, مادة: نكر.

چاكو پەسندی دابنێن, وە مەبەست لە: ڕێگرتن لە خراپە (النهي عن المنكر) ئەوەیە كە هەوڵبدرێو كار بكرێ بۆ ڕیشەكێش كردنو نەهێشتنی هەر چی كە عەقڵی ساغو شەرع بە خراپو ناپەسندی دەزانن.

ئنجا بە حوكمی ئەوە كە هەر كام لە: (المعروف)و (المنكر) ئەلیف ولام (ال)ی (تعریف)یان لەسەرە، هەردووكیان سەر لەبەری (معروف)و (منكر)ەكان دەگرنەوە بە هەموو جۆرو شێوەكانیانەوە, كەواتە: كە دەڵێین: (فەرمان بە چاكەكردنو ڕێ لە خراپەگرتن) یەكێكە لە دروشمو نیشانە گەورەو سەرەكییەكانی مسوڵمانانی ڕەسەن كە بە (ئەهلی سوننەتو جەماعەت) نا سراون، پێویستە بزانین كە: ئەركی سەرشانی هەموو ئەوانەیە كە دەیانەوێ لە جوغزی ئەهلی سوننەتدا حیساب بكرێن, كە هەرچی چاكەیەو پەسندە لە سەرجەم بوارەكانی:

1- فیكرو عەقیدە.

2- خواپەرستیی.

3- ڕەوشتو ئاكار.

4-ماڵو خێزان .

5- ئابووری .

6- سیاسی .

7 - كۆمەڵایەتی .

8- ڕاگەیاندن .

9- دادوەری .

10- جەنگو جیهاد) دا .. هەوڵی چەسپاندنو ڕەواج پێدانو گەشەپێدانیان بدەن, بە پێچەوانەشەوە هەرچی خراپو ناپەسندە, لە هەموو ئەو بوارانەدا هەوڵی لابردنو نەهێشتنو ڕیشەكێش كردنیان بدەن.

ئێستاش کە پێم وایە هەتا ڕادەیەك چەمكو واتای (فەرمان بە چاکەو ڕێ گرتن لە خراپە) ڕۆشن بۆوە, با سەرنجی سێ ئایەتی بەپێزی کتێبی خوا (تبارك و تعالی)و یەك فەرمایشتی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ بدەین:

یەك- خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾(1)، واتە: وە با کۆمەڵێکتان لەنێودا هەبن کە بانگەواز بۆ چاکە دەکەن و فەرمان دەکەن بە هەر شتێك کە پەسندەو ڕێگریی دەکەن لە هەر چی ناپەسندە, وە هەر ئەوانەش سەرفرازان.

دوو- هەروەها فەرموویەتی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ...﴾(2)، واتە: ئێوە باشترین کۆمەڵن کە بۆ مرۆڤایەتی پەیدا کراون, چونکە فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێ گە لە خراپە دەگرن و ئیمان بە خوا دێنن...(واتە: ئەی ئۆممەتی ئیسلام ئێوە لەبەر ئەو سێ سیفەتە باشترین کۆمەڵن, هەر کات ئەوانەتان تێدا نەما لە خەڵکی دی باشتر نین).

سێ- وە فەرموویەتی: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَـئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾(3)، واتە: پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار هەندێکیان دۆستو پشتیوانی هەندێکیانن, فەرمان بە چاکە دەکەن, ڕێگریی لە خراپە دەکەن, نوێژ بەرپادەکەن و زەکات دەدەن,

1) ( آل عمران- 104 ) .
2) ( آل عمران- 110 ) .
3) ( التوبة- 71 ) .

وە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن, ئەوانە خوا بەزەیی پێیا ندا دێتەوە, بێگومان خوا زاڵو کاربەجێیە.

چوار- پێغەمبەریش ﷺ لە یەکێك لە فەرمایشتە پڕ حیکمەتو مانا کۆکەرەوەکانیدا لەوبارەوە فەرموویەتی: ((من رأى منكم منكراً فَلْيُغَيِّرْهُ بيده, فأنْ لم يستطع فَبلسانِهِ, فأن لم يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ, وذلك أضْعَفُ الايمان))[1]، واتە: هەر کامێکتان خراپەیەکی بینی با بەدەستی بیگۆڕێ، ئەگەر نەیتوانی بە زمانی (هەوڵی گۆڕینو لابردنی بدات), ئەگەر هەر نەیتوانی بە دڵی (ڕقی لێیبێو عەزم لەسەر بەرەنگاربوونەوەی جەزم بکات) وە ئەوەش (کە تەنیا بە دڵ ڕقی لەو خراپەو ناشەرعییە بێ) بێهێزترین ئیمانەو لای کەمی ئیمانە.

ئێستاش باسەرنجێك بدەینە هەر سێك ئایەتەکە تاکو پلەو پایەو گرنگیی‌و بایەخی فەرمان بە چاکەو ڕێ گرتن لە خراپەمان بۆ ڕوون بێتەوەو پاشان هەڵوەستەیەك لەبەردەم ئەم فەرمایشتەدا دەکەین کە چەند ڕاستییەکی گرنگی لە بارەی لابردنو گۆڕینی خراپەو ناشەرعییەوە گرتووە خۆیو چۆنییەتیو میکانیزمەکەی تا ڕاددەیەکی زۆر خستۆتەڕوو:

1/ لە ئایەتی (104)ی (آل عمران)دا خوای کاربەجێ فەرمان بە مسوڵمانان دەکات کە پێویستە کۆمەڵێکیان لەنێودا هەبن, یان کۆمەڵێك بن, کە ئەرکی بانگەوازکردنی خەڵك بەرەو ئیسلامو فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە ئەنجام بدەن, پاشان ڕایدەگەیەنێ کە تەنیا کەسانێك کە بەو ئەرکە گەورەو گرنگانە هەڵدەستن سەرفرازو براوەن! واتە: هەرکاتێك مسوڵمانێك کۆمەڵێك نەبوون,

1) رواه الامام احمد ومسلم وابن ماجة عن ابي سعيد الخدري، بڕوانە (تفسير القرطبي) بەرگی4، لاپەڕە 39.

یان[1] لانی کەم کۆمەڵێکیان لەنێودا نەبوون کە بانگەواز بۆ ئیسلامو فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە بکەن، ئەوە ناچنە ڕیزی سەرفرازو براوانەوە، بەڵکو زیانبارو دۆڕاو دەردەچن!

2/ وە لە ئایەتی (110)ی (آل عمران)دا خوای زاناو شارەزا خستوویەتە ڕوو کە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ بە گشتیو هاوەڵانی بەڕێزی بەتایبەتی بەوە دە بنو بوونەتە چاکترین کۆمەڵ کە پاش ئیمان ئەرکی فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپەیان ئەنجام داوە، کەواتە: ئەوەی وادەکات کە ئۆممەتی ئیسلام کۆمەڵێکی هەڵبژاردە بێتو لە خەڵکی دیکە چاکتر بێت، ئەوەیە چەسپێنەری خێرو چاکەو لابەری شەڕو خراپە بن، نەك هەر بە گوتەو لە خۆوە هەڵبژاردەیەتیو چاکێتییان وەك کالا بە بالا بڕابێ!

ئنجا بۆیەش ڕستەی: (وتؤمنون بالله) خراوەتە پاش (تأمرون بالمعروف وتنهون عن المنكر)ەوە چونکە تەنها ئیمانێك ئیمانی ڕەسەنو ڕاستەقینەیە کە فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە لە خاوەنەکەیدا بەرهەم بێنێ!

بۆیە ئیمان هەر چەندە بناغەو چاوگی هەموو خەسڵەتو ڕەوشتێکی پەسندە، خراوەتە دوایەو فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە خراوەتە پێشەوە بێگومان ئەم شێوازەش گرنگیو بایەخو پایە بەرزیی ئەو ئەرکە گەورەیەی ئیسلام دەردەخات.

3/ وە لە ئایەتی (71)ی (التوبة)دا خوای پەروەردگار ڕوونی کردۆتەوە کە سەرجەم ئیمانداران بە نێرو مێو وردو درشتەوە لەسەریان پێویستە کە دۆستو پشتیوانی یەکدی بنو هاوکارو دەستبارگری یەکدی بن بۆ ئەنجامدانی ئەرکی گەورەو گرنگی فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپەو نوێژ بەرپاکردنو زەکات

1) چونکە ئەگەر (من) بۆ (بیان) بێ مانای یەکەم و ئەگەر بۆ (تبعیض) بێ هی دووەم لە ڕستەکە دەفامرێتەوە.

دان و فەرمانبەریی کردنی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ, پاشان ڕایگەیاندووە کە تەنیا مسوڵمانانێك شایستەی بەزەیی خوان کە ئەو شەش ئەرکە گەورەو گرنگە جێبەجێ دەکەن.

4/ ئنجا با بچینە خزمەت فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە وەك گوتمان چەند ڕاستییەکی گرنگی لە بارەی لابردن و نەهێشتنی خراپەو ناشەرعییەوەو چۆنیەتی و میکانیزمەکەی گرتوونە خۆی: (( مَنْ رأى منكراً فَلْيغيرهُ بيده فأنْ لم يستطعْ فبلِسانه فأنْ لم يستطعْ فبقلبهِ وذلك أضعف الايمان))، دەتوانین: ئەم ڕاستییانەی خوارێ لەم فەرمایشتە وەربگرین:

یەکەم: وشەی (مَنْ) هەر کەس: لێی وەردەگیرێ کە ئەرکی لابردنی خراپەو ناشەرعیی ئەرکێکە لە ئەستۆی هەموو مسوڵمانێك دایە, چ نێر چ مێ, چ پیر چ گەنج...هتد، چونکە (مَنْ) هیچ کەس هەڵناوێرێ و هەمووان دەگرێتەوە.

دووەم: وشەی (رأى) بینی: ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو خراپەیەی دەبێ بگۆڕڕێ پێویستە ئاشکراو بەرچاو بێت نەك بە هۆی پشکنین (تفتيش) و گوێ هەڵخستن (تجسس)ەوە پەی پێ ببرێ.

سێیەم: وشەی (منكم) لە ئێوە: ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە ئەو ئەرکی ڕێ گرتن لە خراپە (النهي عن المنكر)یە لەنێو مسوڵماناندا ئەنجام دەدرێ، نەك لەنێو خەڵکێکی نامسوڵماندا کە پابەندیی بە شەریعەتەوەیان لە سەر پێویست نەکراوە, مەگەر ئەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارە لەوجۆرە بێ کە دژو پێچەوانەی ئەدەبە گشتییەکان (الآداب العامة)ی کۆمەڵگای ئیسلامیی بێ کە لە سەر تێکڕای هاووڵاتییان (المواطنين) پێویستە ڕەچاو بکرێن.

چوارەم: وشەی (منكراً) خراپەیەك: ئەوە دەگەیەنێ کە هەر جۆرە خراپەو ناشەرعیی و شتێکی ناپەسند پێویستە پێشگیریی لێ بکرێ و ڕێی لێ بگیرێ, بەڵام شتێك ناشەرعیی و خراپ نەبێ و موباح و ڕەوابێ هیچ کەس بۆی

نیە خەڵكی لێ بگێڕێتەوەو لێیان قەدەغە بكات, هەروەها ئەو مە سەلانەی كە ڕاجیایی (اختلاف)ی زانایانیان لە سەرەو بەڵ گەی شەرعیی ڕوونو بێ چەندو چوونیان لەسەر نیە، دیسان دروست نیە فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپەیان تێدا بكرێ.

پێنجەم: وشەی: (فَلْيُغَيِّرْهُ) با بیگۆڕێ: ئەوە دەگەیەنێ كە لابردنی خراپە (تغيير المنكر) پێویستەو هەر كەسێك خۆی بە مسوڵمان بزانێ پێوی ستە چی پ ێی دەكرێ لە بەرانبەر خراپەو ناشەرعییدا بیكاتو بێ هەڵوێست نەبێ.

شەشەم: وشەی: (فَلْيُغَيِّرْهُ) ئەوەش دەگەیەنێ كە مە سەلەی گۆڕینو لابرد نی خراپەو ناشەرعیی لەگەڵ چەسپاندنی سزا شەرعییەكان (العقوبات الشرعية), لەیەك جیان وە هیچكەس بۆی نیە لە كاتی بینینی خراپەو نا شەرعییەكاندا پەلاماری بابای خراپەكار بداتو سزای بدات! بەڵكو تەنیا بۆی هەیە دە ستی بگرێو نەهێڵی ناشەرعییەكە ئەنجام بدات، بەڵام چەسپاندنی سزا شەرعیەكان، ئەوە لەلایەكەوە ئەركو مافی دەستەڵاتی شەرعی (السلطة الشرعية) یەو لە لایەكی دیكەشەوە پەكی لەسەر بەڵگەو ئیسپاتی شەرعیی تەواو كەوتوە.

حەوتەم: وشەی (بيده) بەدەستی: ل ێی دەفامرێ تەوە كە هەركە سێك توا ناو دەستەڵاتی هەبوو پێویستە بەكردەوە خراپەو ناشەرعییەكان بگۆڕێو لایانبەرێو نابێ بە كەمتر لەوە ڕازی بێ.

هەشتەم: ڕستەی (فأن لم يستطع فبلِسانهِ) ئە گەر نەیتوانی بەزمانی: ل ێی وەردەگیرێ كە ڕووبەڕووبوونەوە بە قسەو وتاریش لەگەڵ خراپەو نا شەرعییو هەڵەوپەڵەكانی كۆ مەڵگادا، جۆرێ كەو قۆ ناغو شێوازێكە لە قۆ ناغو شێوازەكانی ڕێگرتنو نەهێشتنی خراپەو ناشەرعیی!

نۆیەم: ڕستەی: (فان لم يستطع فبقلبه) جا ئە گەر نەیتوانی بە د ڵی: ئەوە دەگەیەنێ كە بەدڵو دەروون بەرهەڵستیی كردنی خراپەو نا شەرعیش دی سان

جۆرو شێوازێکی دیکەی ڕووبەڕووبوونەوەو نەهێشتنی ناشەرعیی‌و خراپە یە، چونکە بێگومان قسەی زارو زمان‌و کردەوەی ئەندامەکانیش ڕیشەو بنکەکەی هەر دەگرێتەوە بۆ قەناعەت‌و بڕوای نێو دڵ!

دەیەم: ڕستەی: (وذلك أضعف الايمان) ئەوەش بێهێزترین ئیمانە: مانای وایە کە هەرکەسێك نە بە دەست‌و نە بە زمان‌و نە بە دڵیش دژایەتی خراپەو ناشەرعیی نەکات، کەواتە لە بێهێزترین پلەو جۆری ئیمانیش بێبەشەو، هیچ جۆرە ئیمانێکی لە دڵ‌و دەروونیدا نیە، هەروەها هەر لەم ڕستەیە دەفامرێتەوە کە هەوڵدان بۆ لابردن‌و نەهێشتنی خراپەو ناشەرعیی پێوەر (معیار)ی بەرزیی‌و نزمیی‌و بەهێزیی‌و بێ هێزیی ئیمان‌و عەقیدەیەو هەتا ئیمان لە دڵ‌و دەروونی مرۆڤدا کامڵترو چاکتر بێت هەڵوێستی لە بەرانبەر خراپەو ناشەرعییدا مەردانەتر دەبێ!

لە کۆتایی شەرح‌و تەفسیری ئەم فەرموودەیەشدا بەپێویستی دەزانم ئاماژەیەکی کورت بە مەسەلەیەك بکەم کە ڕەنگە کەسانێك تێیدا بە هەڵەدا بچن:

فەرمایشتەکە شێوازەکانی گۆڕین‌و لابردنی خراپەی لە سەرێوە بۆ خوارێ خستوونە ڕوو تاکو بیخاتە ڕوو کە بێهێزترین هەڵوێست هەڵقولاوی کەمترین ئیمانە، ئەگەرنا لە ڕووی ڕیزبوونی شێوازەکانی گۆڕین‌و لابردنی خراپەوە، دیارە دڵ پێش زمان‌و زمانیش پێش دەستەو شتێك بە زمان‌و قسە چارەسەر بکرێ نابێ دەستی بۆ بەکار بێت!

## ( خاڵی چــوارەم )

## جیهــادو جــەنگ لە ڕێی خــوادا :

بەڵێ بەڕێزان!

جیهادو جەنگ کردن لە ڕێی خوادا یەکی دیکەیە لە دروو شمو نیـ شانەکانی مسوڵمانانی سەر ڕاستە ڕێی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا ئەگەر ئەرکی (فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە) لەنێو مـ سوڵماناندا لە باز نەی کۆ مەڵگاو کـ یانی ئیسلامییدا ئەنجام دەدرێ، ئەوە جیهادو جەنگ لەگەڵ غەیری ئەهلی ئیسلامو لە دەرەوەی جوغزی کۆمەڵگاو کیانی ئیسلامییدا جێبەجێ دەکرێ.

(ابن تیمیة) -خوا لێی خۆش بێ- لەو بارەوە کە جیهادو جەنگ کردن لە ڕێی خوادا یەکێکە لە دروشمو تایبەتمەندیی‌یەکانی (ئەهلی سوننەت) گوتوو یەتی[1]: (ویَرَونْ إقامة الحجّ والجهاد والجمع والأعیاد مع الأمراء ابراراً کانوا أو فجاراً) واتە: وە (ئەهلی سوننەت) پێیان وایە کە دەبێو حەجو جیـ هادو جومـ عەو جەژ نەکان لەگەڵ حوکمڕانانی چاکەکارو خراپەکاردا هەر جێبەجێ بکرێن .

ئێستاش با سەرنجی چەند ئایەتێکی قورئانو فەرمایـ شتێکی پێغەمـ بەر ﷺ بدەینو چەند ڕاستییەك -کە بۆ ئەم باسەمان پێویستنو پێیەوە پەیوە ستن- لێ یان وەربگرین:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

1) بڕوانە (العقیدة الواسطیة) بشرح ابن عثیمین .

1- ﴿إِنَّ اللّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللّهِ فَاسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾(التوبة– 111)، واتە: بێگومان خوا گیانەکانیان و سامانیانی لە بڕواداران کڕیوە کە بەهەشتیان هەبێ, لە ڕێی خوادا دە جەنگن دە کوژن و دەشکوژرێن, ئەوە بەڵێنێکی ڕاستە لەسەری لە تەورات و ئینجیل و قوڕئاندا هاتوە, ئنجا ئایا کێ لە خوا وەفادارترە بە پەیمانی خۆی! دەجا دڵخۆش بن بەو پەیمانەی کە داوتانە, وە هەر ئەوەشە سەرکەوتنی مەزن.

2- ﴿لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلاًّ وَعَدَ اللّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ۞ دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً وَكَانَ اللّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾(النساء: 95–96)، واتە: بڕوادارانی دانیشتووی ساغ و سەلامەت و تێکۆشەران لە ڕێی خوادا بە سامان و گیانیان یەکسان نین, خوا جیهادکەرانی بە ماڵ و نەفسیانی پلەیەك بەسەر دانیشتوواندا بەرز کردۆتەوە، وە گفتی چاکی بە هەموویان داوە، وە خوا موجاهیدانی بەسەر دانیشتوواندا بە پاداشتێکی مەزن بەرزکردۆتەوە، چەندان پلە لە خواوە، وە لێبوردن و بەزەیی، وە خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە.

3- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ۞ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ۞ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ۞ وَأُخْرَى تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ مِّنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (الصف: 10–

13)، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئایا بازرگانییەکتان پێشان بدەم کە دەربازتان دەکات لە ئازارێکی بە ئێش؟ ئیمان بە خواو پێغەمبەرەکەی دێنن بە سامانو گیانتان لە ڕێی خوادا جیهاد دەکەن، ئا ئەوە بۆ ئێوە چاکترە ئەگەر بزانن، (خوا) لە گوناهتان دەبووریو دەتانخاتە چەند باغێکەوە کە ڕووبار یان بەژێردا دەڕۆن، وە چەند خانووبەرەیەکی چاك لە چەند باغێکی هەمیشەییدا، ئەوەیە بردنەوەی مەزن، وە شتێکی دیکەش کە ئێوە حەزی لێدەکەن، یارمەتی (هاتن) لە خواوەو سەرکەوتنێکی نزیك، وە موژدە بدە بە ئیمانداران!

ئنجا با چەند فەرموودەیەکیش بە نموونە بێنینەوە:

1- عن أبی هريرة -رضي الله عنه- قال: ((سئل رسول الله ﷺ: أي الاعمال أفضلُ؟! قال: إيمان بالله ورسوله، قيل: ثم ماذا؟ قال: الجهاد في سبيل الله. قيل: ثم ماذا؟ قال: حجٌّ مبرورٌ)) متفق عليه. واتە: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا: کام کردەوە چاکترە؟ فەرمووی: ئیمان بە خواو پێغەمبەرەکەی: گوترا: ئەدی دوایی چی؟ فەرمووی: جیهاد لە ڕێی خوادا, گوترا: ئەدی دوایی چی؟ فەرمووی: حەجێکی چاكو ڕێكو پێكو قبوولکراو.

2- عن ابن مسعود -رضي الله عنه- قال: قلت يارسول الله أيّ العمل احبُّ الی الله تعالی؟ قال: (الصلاة علی وقتها: قلت: ثم أيٌّ؟ قال برُّ الوالدين, قلت: ثم أيٌّ؟ قال: الجهاد في سبيل الله) متفق عليه. واتە: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا چ کردەوەیەك لەلای خوا خۆشەویستترە؟ فەرمووی: نوێژ لەکاتی خۆیدا, گوتم: دوای ئەوە؟ فەرمووی: چاکە لەگەڵ دایكو باوك. گوتم: دوای ئەوە؟ فەرمووی: جیهادکردن لەڕێی خوادا.

3- عن أنس -رضي الله عنه- أن النبّي ﷺ قال: ((جاهدوا المشركين بأموالكم وأنفسكم وألسنتكم)) رواه ابو داود باسناد صحيح. واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە سامانو گیانو زمانتان جیهاد دژی هاوبەش بۆ خوا دانەران بکەن.

4- عن سعيد بن زيد -رضي الله عنه- قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: ((مَنْ قُتِلَ دون مالِهِ فهو شهيد ومن قتل دون دَمِهِ فهو شهيد ومن قتل دون دينه فهو شهيد ومن قتل دون أهله فهو شهيد)) رواه أبو داود والترمذي وقال: حسن صحيح. واتە: هەر کەسێك لەسەر سامانی بکوژرێ ئەوە شەهیدە, وە هەر کەسێك لەسەر خوێنی بکوژرێ ئەوە شەهیدە, وە هەر کەسێك لەسەر ئاینی بکوژرێ ئەوە شەهیدە, وە هەرکەسێك لەسەر خێزانو کەسوکاری بکوژرێ ئەوە شەهیدە.

5- ((لا تزال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق لا يضرهم من خذلهم حتى يأتي أمر الله وهم كذلك)) رواه مسلم عن ثوبان برقم:1920. واتە: بەردەوام کۆمەڵێك لە ئۆممەتم بە سەرکەوتوویی لەسەر هەق دەمێننەوە، ئەوانەی پشتیان بەردەدەن زیانیان لێ نادەن, هەتا بەو حاڵەتەوە فەرمانی خوا دێ (بە کۆتایی پێهێنانی ژیانی دونیا).

6- ((لا تزال طائفة من أمتي قائمة بأمر الله لا يضرهم من خَذَلَهُم أو خالفهم, حتى يأتي أمر الله وهم ظاهرون على الناس)) رواه البخاري ومسلم عن عمر بن هانيء عن معاوية البخاری برقم:3641، ومسلم برقم:1037،واتە: بەردەوام کۆمەڵێك لە ئۆممەتم ئایینی خوا بەڕێوەدەبەن, نە ئەوانەی کە پشتییان بەردەدەنو نە ئەوانەی کە دژایەتییان دەکەن زیانیان لێ نادەن، هەتا فەرمانی خوا دێو ئەوان لەسەر خەڵك باڵادەستن.

7- ((لن يبرح هذا الدِّين قائماً يُقاتِل عليه عِصابةٌ من المسلمين حتى تقوم الساعة))، رواه مسلم عن جابر بن سمرة, برقم:1922، واتە: ئەم ئایینە هەر بە ڕاوەستاویی دەمێنێتەوە کۆمەڵێك لە مسوڵمانان لەسەری دەجەنگن هەتا قیامەت دێ.

سەرەتا پێناسەیەکی کورتی (جهاد) دەکەین, : پاشان چەند ڕاستییەکی گەورەو گرنگ لەو ئایەتە بە پێزو فەرمایشتە بەرێزانەی ڕێزمان کردن، وەردەگرین:

(راغب الاصفهاني) لە پێنا سەکردنی و شەی (جهاد) لە زاراوی شەرعدا گوتوویەتی: (....والجهاد والمجاهدة: استفراغ الوسع في مدافعة العدوّ....)[1]، واتە: وە جیهادو موجاهەدە یانی: بەکارهێنانی تەواوی وزەو توانا لە بەرپەرچدانەوەی دوژمندا....، هەڵبەتە ئەمە واتای وشەی (جهاد)ە لە زاراوی شەرعدا، ئەگەرنا لە ڕووی زمانەوانییەوە (جیهاد) بریتیە لە بەکارهێنانی ئەو پەڕی وزەو توانا بۆ هێنانەدی هەر ئامانجێكو ئەنجامدانی هەر کارێك.

ئێستاش با سەرنجێکی ئەو ئایەتو فەرموودانەی پێشتر هێنامانن بدەینو چەند ڕاستییەکی گەورەو گرنگیان لێ وەربگرین:

یەکەم: ئایەتی (111) بە ڕاشکاویی ڕایدەگەیەنێ کە هەر کەسێك خۆی بە خاوەن ئیمان بزانێ نابێ لە بەرانبەر خواو ئایینەکەیدا خۆی بە خاوەنی سەروماڵی بزانێو دەبێ ئامادەبێ گیانو سامانی لە پێناوی ڕەزامەندیی خوادا دانێ!

دووەم: ئایەتەکانی (95, 96)ی (النساء) خستوویانەتە ڕوو کە تێکۆشەرانی ڕێی خوا بە سەرو ماڵیانو دانیشتووانی بێ بیانووو پاساو نا چنە تەرازوویەکەوەو جیاوازییەکی گەورەیان لە نێواندا هەیەو موجاهیدانی ڕێی خوا بە پاداشتێکی مەزنو چەندان پلەی بەرز لە دانیشتووان چاکترو لەخوا لە پێشترن!

سێیەم: ئایەتەکانی (10-13)ی (الصف) ڕوونیان کردۆتەوە کە جیهاد لە ڕێی خوادا بە سامانو گیان پاش ئیمان بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ مایەی قوتاربوون لە سزای بە ئێشی دوارۆژو پۆشرانی گوناهانو

1) بڕوانە (مفردات الفاظ القرآن)، ص 208، لفظ: (جَهَدَ) .

شادبوونە بە بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەکانی خوای بەخشەر، هەروەها مایەی هاتنی یارمەتی خواو سەرکەوتنە بەسەر دوژمناندا.

چوارەم: وە هەرکام لە فەرموودەی ژمارە (1و 2) بە ڕا شکاویی ئەوە دەگەیەنن کە جەنگ‌و جیهاد لە پێناوی خوادا (عزّ وجلّ) پاش ئیمان بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ یەکێکە لە کردەوە هەرە چاک‌و خۆشویستراوەکانی لای خواو لە ڕیزی نوێژو حەج‌و چاکە لە گەڵ باب‌و دایک دایە.

پێنجەم: وە لە فەرموودەی ژمارە (3) وەردەگیرێ کە جەنگ‌و جیهاد لە گەڵ ئەهلی کوفرو شیرکدا وێڕای سامان‌و گیان، زمانیش تێیدا بە شدارو خاوەن پشکە، دیارە (زمان)یش ڕاگەیاندن (اعلام) دەگرێتەوە بە هەموو ئامرازەکانییەوە بە بیستراوو بینراوو خوێنراوەوە.

شەشەم: وە فەرموودەی ژمارە (4) ئەوە دەگەیەنێ کە ئینسان‌و خەڵکی مسوڵمان بۆیان هەیەو لەسەریشیان پێویستە کە بەرگری لە سامان‌و نەفس‌و ئایین‌و خێزان‌و کەسوکاریان بکەن‌و لە سەر ئەوەش پادا شتی مەزنیان هەیەو ئەگەر بشکوژرێن پلەی شەهیدیان هەیە.

حەوتەم: وە فەرموودەکانی ژمارە (5، 6، 7) بە ڕوون‌و ڕاشکاویی دەریدەخەن کە هەتا ژیانی ئینسان لەسەر خڕۆکەی زەوی دێتە کۆتایی، بەردەوام کۆمەڵێک لە ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر دەبن‌و دەمێنن کە بە سەرو ماڵیان لە ڕێ‌و بەرز ڕاگرتنی ئاڵای دینەکەیدا جیهادو جەنگ دەکەن‌و بە باڵادەستیی‌و هێزو شکۆوە لە مەیداندا دەمێنن، دیارە ئەم فەرمایشتانەش زۆر ئومێد بەخشن‌و ئەوەیان لێ دەفامرێتەوە کە هیچ بارودۆخێک ناتوانێ چۆک بە مسوڵمانانی ڕاستەقینەی فیداکار دابدات‌و لە جیهادکردن‌و جەنگ لە پێناوی خوادا پەکیان بخات!

## (خاڵی پێنجـــەم)

## ڕەوشـــتە بەرزو جـوانەکان (مکارم الاخـــلاق)

بـــەڕێزان!

خۆڕازاندنەوە بە ڕەوشتە بەرزو جوانەکانو دووریی لە خووخدە نزمو پە ستەکان، یەکی دیکەیە لە درووشمو نیشانەو تایبەتمەندییەکانی مسوڵمانانی ڕەسەن (ئەهلی سوننەت)، چونکە وەك پێشتر باسمان کرد مسوڵمانانی ڕەسەن موو بە موو شوێن پێی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەگرنو دیارە ئەویش وەك خوای زاناو شارەزا وەسفی کردوە خاوەنی بەرزترینو جوانترین ڕەو شتو ئا کار بووە, وەك فەرموو یەتی: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾(القلم 4).

ئێستاش بۆ ئەوەی هەم بە ڕەوشتە بەرزو جوانە بنەڕەتییەکان ئا شنابینو هەم پایەو پلەی بەرزو ناوازەی ڕەوشتو ئاکاری پەسندمان بۆ دەربکەوێ، با سەرنجی چەند ئایەتێکی قورئانو چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ بدەین.

سەرەتا با تەماشای ئەم هەژدە ئایەتەی سورەتی (الاسراء) بـکەین کە (18) ڕەوشتو ئاکاری بەرزو پەسندیان گرتۆتە خۆیان: ﴿لاَّ تَجْعَل مَعَ اللّهِ إِلَـهًا آخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولاً ۞ وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا ۞ وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا ۞ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ إِن تَكُونُواْ صَالِحِينَ فَإِنَّهُ كَانَ

لِلأَوَّابِينَ غَفُورًا ۞ وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلاَ تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ۞ إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُواْ إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا ۞ وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ابْتِغَاء رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلاً مَّيْسُورًا ۞ وَلاَ تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ۞ إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاء وَيَقْدِرُ إِنَّهُ كَانَ بِعِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ۞ وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلاقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُم إنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْءًا كَبِيرًا ۞ وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً ۞ وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالحَقِّ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا فَلاَ يُسْرِف فِّي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَانَ مَنْصُورًا ۞ وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ وَأَوْفُواْ بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً ۞ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ إِذا كِلْتُمْ وَزِنُواْ بِالقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً ۞ وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً ۞ وَلاَ تَمْشِ فِي الأَرْضِ مَرَحًا إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ الأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولاً ۞ كُلُّ ذَلِكَ كَانَ سَيِّئُهُ عِنْدَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا ۞ ذَلِكَ مِمَّا أَوْحَى إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ الْحِكْمَةِ وَلاَ تَجْعَلْ مَعَ اللّهِ إِلَهًا آخَرَ فَتُلْقَى فِي جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا﴾ (الاسراء: 22-39)، واتە:

لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە دامەنێ ئەگەرنا بە سەرزەنشتکراویی‌و بێ پشت‌وپەنایی دادەنیشی، پەروەردگارت بڕیاری داوە کە جگە لەو نەپەرستن، وە چاکە لەگەڵ باب‌و دایك بکەن. جا ئەگەر یەکیان یان هەردووکیان لەلای تۆ کەوتنە تەمەنەوە، ئەوە تەنانەت (ئۆف)یشیان پێ مەڵێ، وە تێیان مەخوڕە. وە قسەیەکی بەڕێزیان لەگەڵ بکە، وە لە ڕووی بەزەییەوە باڵی زەبوونیی یان بۆ شۆڕ بکەوەو بڵێ: پەروەردگارم بەزەییت پێیان دابێتەوە وەك چۆن منیان بە گچکەیی بەخێوکرد! پەروەردگارتان بەوەی نێو دڵتان زاناترە، ئەگەر ئێوە چاك بن بێگومان ئەو بۆ کەسانی زۆر گەڕاوە (بۆ لای) لێبوردەیە، وە مافی خۆیان بدە بە خزم‌و هەژارو

ڕێبوار، بەڵام دەست بڵاویی مەکە. چونکە بێگومان بێهوودە سامان خەرج کەران برای شەیتانەکانن‌و شەیتانیش بەرانبەر پەروەردگار سپڵەیە. وە ئەگەر ڕووت لێیان (واتە لە خزم‌و هەژارو ڕێبوار) وەرگێڕاوەو جارێ هیچت پێ نیان نەدا بەهۆی بەزەیی‌و بەخششێك کە بە ئومێدی لە پەروەردگار تەوە (پێت بگات)، ئەوە قسەیەکی خۆش‌و ئاسانیان لەگەڵ بکە. وە دەستت مەقووچێنە بەرەو گەردەنت‌و بەتەواویش بڵاوی مەکە ئەگەرنا بەر سەکۆنەکراویی‌و پەك کەوتوویی دادەنیشی. بێگومان پەروەردگارت بژێو بۆ هەر کەسێك بیەوێ فراوان‌و تەسك دەکات, بەڕاستی بە بەندەکانی شارەزاو بینایە. وە منداڵەکانتان لە ترسی هەژاریی مەکوژن, ئێمە ڕۆزیی ئەوان‌و ئێوەش دەدەین, بێگومان کوشتنیان گوناهێکی گەورەیە. وە توخنی زینا مەکەون, بەڕاستی شتێکی دزێو ڕێیەکی زۆر خراپە. وە ئەو نەفسەی کە خوا قەدەغەی کردوە بە هەق نەبێ مەیکوژن‌و هەر کەسێکیش بە ستەملێکراویی کوژرا ئەوە ئێمە دەستەڵات (ی شەرعیی)مان داوە تە سەرپەرشتارەکەی، جا با ئەویش زێدەڕۆیی لە کوشتنیدا نەکات‌و دڵنیا بێ کە سەرخراوە. وە بە چاکترین شێوە نەبێ! توخنی ماڵی هەتیو مەکەون هەتا دەگاتە قۆناغی بەهێزیی (باڵغ بوون)، وە پەیمان بگەیەننەسەر، چونکە لێی دەپرسێتەوەو هەرکات پێواتان، پێوانە تەواو بکەن، وە بە تەرازووی ڕاست بکێشن، ئەوە چاکترەو سەرنجامی باشترە. وە بە دوای شتێك مەکەوە، کە زانیارییت پێی نییە, چونکە بێگومان بیستن‌و دیتن‌و عەقڵ هەموو ئەوانە لێیان دەپرسێتەوە. وە بە فیزو کەشخە بەزەویدا مەڕۆ, چونکە بێگومان نە زەوییت بۆ دەدڕێ‌و نە بە بڵندیش دەگەیە چیایەکان. هەر کام لەوانەی باسکران خراپەکەی لەلای پەروەردگارت ناپەسندە. ئەوە شتێکە لە حیکمەت، کە پەروەردگارت بۆی ناردووی، وە لە گەڵ خوادا پەرستراوی دیکە دامەنێ، ئەگەرنا بە سەرزەنشتکراویی‌و تێشکاویی تورِ دەدرێیە دۆزەخەوە.

ئێستا با بە ڕیز ئەو هەژدە خە سڵەتو ڕەو شتە بەرزو پە سندە بنەڕەتی یە بنووسین، کە لەم ئایەتە بە پێزانەدا هاتوون:

1- خوا بە یەکگرتن‌و هاوبەش بۆ خوا دانەنان.

2- پەرستنی خوا بە تەنیا.

3- چاکیی لەگەڵ باب‌و دایك‌و خۆپاراستن لە هەرشتێك مایەی نیگەرانییان بێ.

4- چاکە لەگەڵ خزمان‌و مافی خۆ پێدانان.

5- هاوکاری هەژاران‌و مافی خۆ پێدانیان.

6- دەستگرۆیی ڕێبوارو لێقەوماوان.

7- ماڵی خۆ بێهودە سەرف نەکردن‌و دەستبڵاو نەبوون.

8- قسەی خۆش‌و موژدە بەخش کردن لەگەڵ کەسانێکدا کە داوای هاو کاری دەکەن‌و تواناش نیە لەو کاتەدا هاوکاریی بکرێن.

9- میانجێتی لە بواری ماڵ‌و سامان خەرج کردنداو نە چەنگ قوو چاویی‌و نە دەستبڵاویی.

10- نەکوشتنی منداڵ لە ترسی هەژاریی (کوشتنی منداڵیش جۆری زۆرن).

11- دوورکەوتنەوە لە زیناو داوێن پیسیی.

12- نەکوشتنی بە ناهەق‌و زێدەڕۆیی نەکردنیش لەکاتی تۆڵەستاندنەوەدا.

13- توخن نەکەوتنی ماڵ‌و سامانی منداڵی هەتیوو، مەگەر بە چاکترین شێوە (کە مەبەست سوود پێگەیاندنیەتی وەك بازر گانی‌و مامە ڵە پ ێوەکردنی ماڵ‌و سامانەکەی).

14- وەفا کردن بە بەڵێن‌و پەیمان.

15و 16- پێوان‌و کێشانی ڕاست‌و تەواو بێ فڕو فێڵ.

17- قسە نەکردن‌و هەنگاو نەنان لە هیچ بوارێکدا بەبێ زانیاری‌و بەرچاو ڕوونی.

18- بە فیزو کەشخە بەزەوییدا نەڕۆیشتن.

جێی سەرنجیشە کە سەرجەم ئەو شتانەی لەم ئایەتانەدا خراونەڕوو لە سەرەتاو کۆتاییی یانەوە خوای بەرزو مەزن (سبحانه وتعالى) باسی خوا بە یەککگرتنو تەنیا خواپەرستنی کردوە، تاکو بزانین کە تەنیا کاتێك دە توانین بە خە سڵەتە بەرزو پەسندەکان برازێینەوەو لە خووخدە نزمو پە ستەکان پاك بیـنەوە، کە خاوەنی عەقیدەی خوا بەیەککگرتن (التوحيد) بینو تەنیا خواپەرست بین!

ئنجا بەسە بۆ ئیسپاتی گەورەییو گرنگی خووڕەوشتە بەرزو پە سندەکان، کە خوای کاربەجێ خستنەڕوویان بخاتە نێوان خوا بەیەککگرتنەوە لە سەرەتاو کۆ تایی یەوە, ئەوە لە لایەكو لەلایەکی دیکەشەوە خوای بەرزو بێوێنە سەرجەم ئەو هەژدە سیفەتو ڕەوشتە بەرزو پەسندەی ناو ناوە حیکمەت (حكمة)، وەك فەرموو یەتی: (ذَلِكَ مِمَّا أَوْحَى إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ الْحِكْمَةِ..)! دیارە حیکـمەتیش یەکێ کە لەو دووشتانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری پێویست کراوە کە فێری ئوممەتە کەی یان بکات, وەك فەرموویەتی: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَ سُولاً مِّنْهُمْ يَتْ لُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ.....﴾(الجمعة 2).

جا وەك لە شوێنی دیکە گوتوومانە: مەبەست لە (الكـتاب) ئەو بەرنا مەو دەستوورەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆی قورئانو سوننەتەوەو لەبەر ڕۆشنایی یاندا فێری کۆمەڵگای ئیسلامیی یەکەمی کردوەو (الحكمة) یش ئەو ڕەو شتو ئاکارو خەسڵەتە بەرزو پەسندانەن کە فێری تاك تاکی ئەو کۆ مەڵو کۆ مەڵگا ئیسلامیی یە یەکەمەی کردوونو لەسەریان پەروەردەی کردوون! بەڵگەشمان لە سەر ئەوە ئەوەیە کە خوای کاربەجێ سەرجەم ئەو هەژدە ڕەوشتو خەسڵەتە بنەڕەتییەی ناو ناوە حیکمەت! ئنجا ئەوەش کە زۆربەی زانایان وشەی حیکمەتیان بە: قـسەو کردەوەی بەجێ (الإصابة في القول والعمل) پێناسە کردوە، ناکۆکی لە گەڵ ئەوەدا کە گوترا نیە, چونکە هەر کەسێك ڕەوشتو ئاکاری بەرزو پەسندبێ، قسەو کرداری

بەڕێوەجێ دەبێو, هەرکەسێکیش قسەو کردەوەی بەڕێوەجێ بێ ڕەو شتو خووی بەرزو پەسند دەبێ!

ئێستاش با چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەریش ﷺ لەبارەی خووڕەو شتو ئاکاری بەرزو پەسندەوە بخەینە ڕوو:

1- عن أنس -رضي الله عنه-: ((كان رسول الله أحسن الناس خُلقاً)) (متفق عليه)، واتە: پێغەمبەری خوا لە هەموو کەس ڕەوشتی چاکتر بوو.

2- (( أكمل المؤمنين إيماناً أحسنتم خُلقاً وخياركم خياركم لنسائهمْ)) (رواه الترمذي

عن ابى هريرة -رضي الله عنه- وقال: حسن صحيح، واتە: ئیمان تەواوترینی بڕواداران ڕەوشت چاکترینیانن، وە باشترینتان چاکترینتانە بۆ ژنەکانیان.

3- (( ما من شيء أثقلُ في ميزان المؤمن يوم القيامة من حُسْنِ الخُلُق وان الله يبغِضُ الفاحش البّذيَّ)) رواه الترمذي عن أبي الدَّرداء، و قال (حسن صحيح)، واتە: هیچ شتێك لە ڕۆژی قیامەتدا لە تەرازووی بڕواداردا لە ڕەوشتی چاك قورستر نیە، وە بێگومان خوا ڕقی لە بابای قسەو ڕەفتار ناشیرینو زمان شڕە.

4- (( إنَّ المؤمن لَيُدرِك بِحُسْنِ خُلُقِه دَرَجةً الصّائم القائم)) رواه ابو داود عن عائشة -رضي الله عنها-، واتە: بێگومان بڕوادار بە هۆی ڕەو شتی چاکەیەوە دەگاتە پلەی بابای هەردەم ڕۆژووگری شەو نوێژکەر.

5- (( إن من احبكم اليَّ وأقربكم منّي مجلساً يوم القيامة أحسنكم أخلاقاً وإن أبغضكم اليَّ وأبعدكم مِنيَّ يوم القيامة: الثرثارون والمتشدِّقون والمتفيهقون)) رواه الترمذي عن جابر رضي الله عنه وقال حسن صحيح، واتە: بێگومان لە خۆشەویستترینتان لەلام، وە کۆڕو مەجلیس نیزکترینتان لێمەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕەوشت چاکترینتانن، وە بوغزێنراوترینتان لەلامو دوورترینتان لێمەوە لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر بلێیانو قسە قەبانو خۆبەزلگرانن.

لە کۆتایی ئەم باسەشدا بە پەسندیی دەزانم دوو پێناسەی کورتی دوان لە کە لە زاناو پێشەوایانی دەربارەی ڕەوشتی بەرزو جوان بهێنمەوە:

أ- (عبدالله بن المبارك) -ڕەحمەتی خوای لێ بێ- لە پێناسەی ڕەوشتی چاکدا وەك (ترمذي) لێی گێڕاوەتەوە گوتوویەتی: (هو طلاقة الوَجِهِ وَبذْل المعروف وكَفُّ الاذى)، واتە: بریتیە لە ڕووی گەش و چاکەکاریی و بەخشینو خۆ پاراستن لە ئازاردانی خەڵك.

ب- (ابن حجر العسقلاني)یش -خوا لێی رازی بێ- گوتوویەتی: [1](حسن الخلق اختيار الفضائل وترك الرّذائلِ) واتە: ڕەوشت چاکیی بریتیە لە هەڵبژاردنی خەسڵەتە پەسندەکانو وازهێنان لە خووخدە خراپەکان.

لێرەشدا کۆتایی بەم خاڵی پێنجەمە دێنین کە خاڵی کۆتایی بەندی سێیەمو کۆتاییە لە بەرگی شەشەمو کۆتایی ئەم زنجیرە دەرسەی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا, جا دوای ستایشی شایستە بۆ خوای بەبەزەییو بەخشش بێسنوور لە هەموو کەموکووڕییو هەڵەوپەڵەو ناتەواویی یەك بە دوور، لێی دەپاڕێمەوە دەڵێم: خوای پەروەردگار بە لوتفو کەرەمی خۆت ئێمە لەو کەسانە بگێڕی, کە لە وردو درشتداو لە هەموو شتێکدا بە پێی ڕێبازی پێغەمبەرەکەت ﷺ بەرێوە دەچن, خوایە: لەو کەسانەمان بگێڕی کە لە وردو درشتو دەرو دەروونماندا, لە هەموو لایەنەکانی ژیانماندا ملکەچی شەریعەتی تێرو تەواوو پڕ حیکمەتو دادی تۆ بین, وە بەندەی ساغ ( خالص) بین بۆ تۆو شوێنکەوتووی ڕەسەن بین بۆ پێغەمبەری تۆ, وە ڕێبازی پێغەمبەرو هاوەڵانی دڵسۆزیو بنەماڵەی بەڕێزیو شوێنکەوتوانی چاکیان بگرین, خوایە سەرەنجامی

1) بڕوانە پەراوێزی (رياض الصالحين)، ص225, ط 1، دار الخير 1988 .

هەموو لایەکمان خێر بکە, وە خوای پەروەردگار! بەرەکەت بخە ئەم دەر سانەوەو بیانکە بە مایەی بەهرە وەرگرتنی مسوڵمانانو بۆ بەندەش ببنە مایەی پادا شتو پارسەنگێکی قورسی تەرازووی چاکەکانمان لە ڕۆژی دوایدا، وە ئە گەر هە ڵەو کەموکوڕییەکیشمان هەبێ, داوای لێبوردن لە خوا دە کەین, وە سوپا سی هەر مسوڵمانێکیش دەکەین کە وەك تێبینیو پێشنیارو ڕەخنەو سەرنج ئاگادار مان بکاتەوە, چونکە بێگومان بەس کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کەموکووڕیی‌و هەڵەوپەڵە خاڵیی‌و دوورن، چونکە هەڵقوڵاوی سەرچاوەی نوورن!

والحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات، سبحان ربك ربّ العزّة عمّا يصفون وسلام على المرسلين، والحمدلله رب العالمين.

11 صفر 1428

28 شوباتی

2007

هەولێر



# نێـــــوەڕۆك

# ئەم کتێبە

لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و فراوانە دەربارەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی
گومانیشی لەوەدا نیە کە ئیمان و عەقیدە لە ئیسلامدا وەک بناغە بۆ دیوار و
ڕەگ و ریشە بۆ درەخت وەهەوێن بۆ ماست وەهەناو بۆ ئینسان وایە !
بۆیە هەر کەسێک بیەوێ مسوڵمانەتی و دینداریەکی ڕاست و ڕەوان
دەبێ لە ئیمان و عەقیدەوە و بنیاتنانی لە عەقڵ و دڵیدا دەست پێ بکات !
وە هەر گەل و میللەتێک بیەوێ ژیان و گوزەرانی خۆی بەپێی شەریعەتی
خوا پاکسازیی و چاکسازیی بکات و ڕێکی بنچینەیی پێویستە لە ڕاستکردنەوەو
بژارکردن و چەسپاندنی ئیمان و عەقیدە دەست پێ بکات .
پێشم وایە ئەم کتێبە بە هەرشەش بەرگەکەیەوە هاوکارێکی باش و
جێی متمانە و پشت پێ بەستنە بۆ هەر تاک و کۆمەڵێک بیەوێ
دەست بە گۆڕانکاریی و پاکسازیی و چاکسازیە بکات .

عەلی باپیر






نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

trizone ARCHITECTURE COVER DESIGN

/TafseerOffice

6000 دینار